گشتگیرترین
ڕێبەری سەعیکردن
بۆ هەموو ئاستێکی
خوێندن



# چۆن سەعی بکەیت

نوسینی: تۆن فراک
و.لە ئینگلیزییەوە: بەرهەم ناودەشتی



چاپی یەکەم
2013

# چۆن سەعی بکەیت

## گشتگیرترین ڕێبەری سەعیکردن
## بۆ هەر ئاستێکی خوێندن


نوسینی: تۆن فرای

لەئینگلیزییەوە: بەرهەم ناودەشتی



چاپی یەکەم

٢٠١٣

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە: ( ٤١٠ )

ناسنامەی کتێب

چۆن سەعـــــی بکەیت؟

- ناوی نووسەر: تۆن فرای
- ناوی وەرگێڕ: بەرهەم ناودەشتی
- نەخشەسازیی و بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە: ()ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێڕست

# سەرەتا
## ئەم کتێبە

"ئەوەی کەسێك دەیزانێت، لە گەنجیدا، کاتێکی کورت دەخایەنێت و تەنیا ئەوانە بایی پێویست دەزانن کە دەزانن چۆن فێر ببن". (هێنری ئادامز)

فێربوونی چۆنێتی سەعیکردن، فێربوونی چۆنێتی فێربوونە. ئەمەش بە بۆچوونی من، گەورەترین دیارییە بتوانیت پێشکەشی خۆت...یان منداڵەکانتی بکەیت.

بە دەربڕینی ئەم قسانە و بەو ئازایەتییەوە، پێم وایە هێشتا دەبێ قەناعەت بە هەندێکتان بێنم کە سەرفکردنی هەر کاتێك لە هەوڵدان بۆ شارەزا بوون لەو شتانە–سەعیکردن، فێربوون، خوێندنەوە، نوسینەوەی تێبینی، نوسین– شایستەیە.

بێگومان هەندێ هۆکاری بێ وێنە هەن کە بۆچی (دەبێ) فێری چۆنێتی سەعیکردن ببیت، بۆچی (پێویستە) فێربیت چۆن سەعی بکەیت. بەڵام پێش ئەوەی دەست بکەم بە قەناعەتپێهێنانت کە پەرەپێدانی شارەزایەتیی رێك و پێکی سەعیکردن گرنگە– و بۆچی– با بزانین کتومت مەبەستمان لە "شارەزایەتییەکانی سەعیکردن" چیە بۆئەوەی هەمووومان لەسەر هەمان راستەهێڵ بین.

بەڵێ، (چۆن سەعی بکەیت) نیشانە، ئاماژە، ئامۆژگاری و تەکنیکی تێدایە بۆ نوسینەوەی تێبینی لە ناو پۆلدا، لەکاتێکدا تۆ کتێبەکانی مەنهەجەکەت دەخوێنیتەوە، لە کتێبخانە و لەسەر ئینتەرنێت، چۆن خۆت بۆ تاقیکردنەوە ئامادە بکەیت و چۆن خشتەی سەعیکردنەکەت رێك بخەیت بۆ ئەوەی باشترین ئەنجام لە کەمترین ماوەی کاتدا بەدەست بێنیت. بەڵام ئەمە تەنیا نیوەی کتێبەکەیە. شارەزایەتیی بنچینەیی هەن کە لەوانەیە پێت وابێ هیچ پەیوەندییان نییە بە سەعیکردنەوە و هەنگاوی گرنگ کە پێویستت پێیانە بۆ گرتنەبەری رێڕەوی راست هەر لە سەرەتاوە.

# با لێرەوە دەست پێبکەین

"وا فێرببە کە قەت ناتوانیت ئەسپی خۆتی تێدا تاو بدەیت، دەستی پێوەبگرە وەك بڵێ ترسی لەدەستدانیت هەیە". کۆنفشیوس

پەیداکردنی خووی نایابی سەعیکردن وەکو پێشبڕکێی راکردنە لەنێوان تۆ و هاورێکانتدا. پیش ئەوەی بتوانیت براوە رابگەیەنیت، دەبێ رازی بیت لەسەر ئەوەی هێڵی کۆتایی لە کوێیە. بە دەربڕینێکی تر، چۆن پێوانەی توانات دەکەیت بۆ بەکارهێنانی ئەم شارەزایەتییانە؟ چی باشە؟ چی بێ کەڵکە؟

بەڵام تۆ تەنانەت ناتوانی پێشبڕکێیەکەش دەست پێبکەیت تا ئەوەی کە دەزانیت هێڵی دەستپێکردن لە کوێیە-بەتایبەت کە بۆ هەریەکێکتان لە خاڵی جیاجیا کێشرابێت!

بەشی یەکەم بە روونکردنەوەی شارەزایەتییە تاکەکەسییەکانی سەعیکردن دەست پێدەکات و روونی دەکاتەوە کە هەریەکێك لەم شارەزایەتییانە چۆن دەتوانێ و دەبێ لە ژیانتدا پیادە بکرێ. پاشان رێگەت بۆ خۆش دەکرێت تا هێڵی دەستپێکردنی خۆت بدۆزیتەوە.

لە بەشی دووەمدا، تۆ گرنگی شوێن، چۆنێتی و کاتی سەعیکردن فێر دەبیت و تۆ دەست دەکەیت بە بونیادنانی ئەو ژینگەیەکی سەعیکردن کە بۆ تۆ بێ هاوتایە. بۆچی ئەمە گرنگە؟ ئەگەر تۆ سێ سەعاتت بە سەعیکردنەوە لە (بازرگانی ڤینیسیا) بەسەر برد، ئەوا سەیر نیە کە هێشتا لە لاپەڕە (٣) بیت. لەوانەیە خوێندنەوە و تێگەیشتن لەبارەی (شایلۆك) پەیوەندییەکی کەمی هەبێت بە زیادکردنی توانای خوێندنەوەت، رێکخستنەوەی کاتت، یان گۆڕینی کتێبەکان...و پەیوەندییەکی زۆری هەبێت بە تەنیا کەمکردنەوەی دەنگ(صوت)ەوە.

دەرمانێکی جادوویی نیە لە بەرنامەی خووی سەعیکردندا. ئەگەر بیرکاری و زانست بەشێوەیەکی زۆر بۆت گونجاو نەبن، (چۆن سەعی بکەیت) ناتکات بە براوەی نۆبڵی فیزیا. کەس لە هەموو شتێکدا لێهاتوو نیە، بەڵام هەمووان لە شتێکدا لێهاتوون. بۆیە تۆش دەرفەتێك

بەدەست دێنیت تا پلەبەندی ئەو بابەتانە بکەیت کە حەزت لێیانە و رقت لێیانە، لەگەڵ ئەو دەرسانەی کە لێیان باشترین و خراپترینیت.

بەشی دووەمیش هەندێ لەو شتە مەعنەوییانە لە هاوکێشەی سەعیکردندا دەناسێنێت: ژینگەی ماڵەکەت، دیدگات، ئەنگیزەت و هیتر. ئەگەر تۆ خۆت تەرخان کردووە بۆ سەعیکردن و جۆش و خرۆشت هەیە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی دیاریکراو، هەموو ئەو فاکتەرانەی تر کە کار دەکەنە سەر خووی سەعیکردنت، بەشێوەیەکی سروشتیتر شوێنی خۆیان دەگرن. بڕوابوون بە ئێتیکی سەعیکردن یەکێکە لە کلیلەکانی سەرکەوتن.

دواجار، ئەسپ تاودان لە هەندێ پێکهاتەی سەرەکیی تری پرۆسەی سەعیکردندا—فێربوونی خوێندنەوەی مامۆستاکان، پەیداکردنی یارمەتیدەر، رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بێ کەموکوڕیبووندا، گرنگی هەڵکردن— یارمەتیت دەدەن لە سەرەتایەکی گونجاوەوە دەست پێبکەیت.

خوێندنەوە و تێگەیشتن

بەشی سێیەم ئەو شارەزاییانە دەناسێنێت کە بنچینەیین بۆ هەر پرۆسەیەکی سەعیکردن: خوێندنەوە و تێگەیشتن. گرنگ نییە چەندە باش فێری نوسینەوەی تێبینییەکان دەبیت، چەندە دڵت بە کتێبخانەکە خۆش دەبێ، چەندە زیرەکان لە ئینتەرنێتدا دەگەڕێیت، چەندە بێ وچان بۆ تاقیکردنەوە سەعی دەکەیت، ئەگەر بەشێوەیەکی لاواز بخوێنیتەوە (یان بایی پێویست نەخوێنیتەوە) و لەوە تێنەگەیت کە دەیخوێنیتەوە، ژیان قورس دەبێ.

بوون بە خوێنەرەوەیەکی باش شارەزاییەکە، کە مرۆڤ لە کاتێکی زووی ژیانیدا بەدەستی دێنێت. ئەگەر ئەمە شارەزاییەك بێت کە هێشتا بەدەستت نەهێناوە، ئەوا ئێستا کاتی خۆیەتی! بەشی سێیەم بەهەمان شێوە روونی دەکاتەوە کە چۆن دەکرێ بە پرۆڤەکردن توانات بۆ بیرهێنانەوەی بیرۆکەکان، راستییە زانستییەکان و وێنەکان (لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە) زیاد بکرێت.

قەرەبوکردنەوەی کاتی لەدەستچوو

بۆ بینینی گۆڕانکاریی گرنگ لە ژیانتاندا، زۆربەتان پێویستتان بەوە نیە سەرسەختتر سەعی بکەن، تەنیا زیرەکانەتر سەعی بکەن. ئەمەش واتە باشتر بەکارهێنانی کاتی سەعی کردن—

سەرفکردنی هەمان دوو، سێ، یان چوار سەعات، بەڵام بەدەستخستنی دووقات، سێ قات یان چوارقاتی ئەوەی کە ئێستا بەدەستی دێنیت. بەشی چوارەم سادەترین و ئاسانترین ئامرازی کات بەڕێوەبردن و ڕێکخستنتان پێ ئاشنا دەکات– ڕێگای بەهێز بۆ دڵنیابوون لەوەی کە تۆ هەمیشە لەسەر سکەیت، لەوانەش ڕێنمایی بۆ دروستکردنی ڕۆژژمێری کورت مەودا و دوورمەودا.

بچۆرە پێشەوەی پۆل

لە بەشی پێنجەمدا باسی ئەزموونێك دەکەم کە هەموومان تیایدا هاوبەشین، گرنگ نیە تەمەنمان چەندە: ناو پۆل. من یارمەتیتان دەدەم تێبینیی باشتر بنووسنەوە، هانی بەشداریی زیاترتان دەدەم لە مشتومڕەکانی ناو پۆلدا– لەوانەش ئاماژە لەبارەی زاڵبوون بەسەر مەیلی خۆشاردنەوە لە پشت ئینجانەکانی پشتەوەی پۆلەکەتدا– و یارمەتیتان دەدەم شتی زیاتر لە وانەکان دەربێنن.

بوون بە راوچیی زانیاری

بەشی شەشەم دوو سەرچاوەی گرنگت پێ دەناسێنێت لە ژیانی سەعیکرنتدا– کتێبخانەکەت و ئینتەرنێت– و قسە لەسەر ئەوە دەکات چۆن ماسولکەکانی توێژینەوەت بەهێز بکەیت بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانیارییەی پێویستتە ئەو کاتەی پێویستت پێیەتی. شت لەبارەی کتێب، بڵاوکراوە، ڕۆژنامە، گۆڤار، پرۆگرامی کۆمپیوتەر، ڤیدیۆ، سی دیی گوێگرتن و کەرەستەی تری بەردەست لە هەر کتێبخانەیەك و پێشنیار بۆ چۆنێتی دۆزینەوە و بەکارهێنانیان فێر دەبیت. من بەهەمان شێوە باسی بەکارهێنانی سەرچاوەی ئینتەرنێتی و گرنگیی بوون بە خوێندەوارێکی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت دەکەم.

کەواتە تۆ (هەمەنگوای)یەکی تر نیت

من بڕوام وایە کە زۆرێك لە ئێوە جەخت دەکەنەوە لە "بابەت نوسین" لەبەرانبەر "نوسین"دا. لە بەشی حەوتدا ڕێگایەکی ئاسانتان پێ دەناسێنم بۆ نوسینەوەی تێبینییەکان و ڕێکخستنی زانیاری. بە دابەشکردنی نوسینێك، گرنگ نیە چەندە ئاڵۆزە، بۆ هەنگاوی ئاسان،

یارمەتیتان دەدەم زۆر باشتر لە پێشوو بابەت بنوسن- ئەگەرچی هێشتا هەڕەشە نەبیت بۆ ئەرنێست هەمەنگوای (یان هیچ کەسێکی تر) لەو شوێنەوە کە پەیوەندی بە نوسینەوە هەیە.

چۆن زۆر باشە بێنیت لە هەر تاقیکردنەوەیەکدا

بەشی هەشتەم باسی (بکە) و (مەکە)ی خۆئامادەکردن دەکات بۆ تاقیکردنەوە، لەوانەش جیاوازییەکانی نێوان سەعیکردن بۆ کویزەکانی هەفتانە، تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ و تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ. بۆچی خۆئامادەکردنی دوایین خولەك ئاکامی نابێت (بەڵام چۆن بیکەیت ئەگەر چارەت نەبێ- چەند عەیبە!) سەعیکردن و ئەنجامدانی جۆری جیاجیای تاقیکردنەوە (هەڵبژاردن، راست یان هەڵە، کردنەوەی کتێب و هیتر)، زیادکردنی توانای بۆچوونت بۆ وەڵامی پرسیار و تەنانەت چ پرسیارێك یەکەم جار وەڵام بدەیتەوە و کامیان بەجێ بهێڵیت بۆ دوایی.

تا چەند زیرەکانە سەعی دەکەیت؟

(چۆن سەعی بکەیت) گشتگیرترین رێبەری سەعیکردنە کە تاوەکو ئێستا نوسرابێت- شێوازێکی بنچینەیی، هەنگاو بەهەنگاو کە دەتوانیت لەسەری بڕۆیت و شارەزایەتییەکانی سەعیکردنت تیژ بکەیت.

ئەگەر تۆ لە کۆلێژ یان پاش زانکۆ لە کۆششدایت، ئەمەش پارێزگاری ژیانتە.

ئەگەر تۆ خوێندکارێکی ئامادەبیت و پلان دادەنێیت بۆ چوونە کۆلێژ، ئەوا ئەمە دەرفەتی تۆیە بۆ هەڵچنینی شارەزایەتییەکانی سەعیکردنت.

ئەگەر تۆ دەچیتە قوتابخانەی پیشەسازی یان تەنانەت پێت وانیە کە دەچیتە کۆلێژ- تەنانەت ئەگەرچی خەریکە هەرچی زووە واز لە ئامادەیی دێنیت، هێشتا پێویستت بە (چۆن سەعی بکەیت) هەیە.

ئەگەر تۆیە گەورەیت و پاش ماوەیەك دابڕان دەگەڕێیتەوە بۆ خوێندن، هیچ جێگرەوەیەك نیە بۆ ئەو رێوشوێن و تەکنیکانەی لەم کتێبە بەسوودەدا فێریان دەبیت.

ئەی ئەگەر بە راستی خوێندکارێکی لاواز بیت؟ چەندە زیرەکیت گرنگ نیە. ئەوەی کە گرنگە چەندە زیرەك سەعی دەکەیت.

به جیاکردنەوەیەکی ئیحتیمالیی ٢٪ی ئێوە کە بە "بەهرەمەند" لەقەڵەم دەدرێن، ئەو خووە کاریگەرانەی سەعیکردن کە (چۆن سەعی بکەیت) فێرتانی دەکات یارمەتیدەرن بۆ خوێندکارانی هەر تەمەنێك و هەر ئاستێکی توانا.

ئەگەر نمرەکانتان لە ناوەندەوە تا باشەیە، ئەوا بەرەوپێشچوونێکی دڵنیا بەخۆتانەوە دەبینن. ئەگەر لە مەودای دەرچوون/کەوتنن، ئەوا بەشێوەیەکی بەرچاو سوود وەردەگرن. ئەگەر خووی سەعیکردنی باشتان هەیە بەڵام بەهۆی ساڵانێك دوور کەوتنەوە لە خوێندن ژەنگاوی بووە، (چۆن سەعی بکەیت) تازەکەرەوەیەکی بێ هاوتا دەبێ بۆتان.

ئەگەریش یەکێکن لەو ٢٪ "بەهرەمەند"انە، هێشتا پێم وایە گەلێك تەکنیکی یارمەتیدەر لەم کتێبەدا بەدی دەکەن.

### ئەم کتێبە بە راستی بۆ کێیە؟

لەکاتێکدا کە لە بنەڕەتدا (چۆن سەعی بکەیت)م بۆ خوێندکارانی ئامادەیی نوسیبوو، بە تێپەڕبوونی ساڵان بۆم دەردەکەوت کە دەشێ ئەو خوێندکارانەی بە واقیعی وێنەیەکی کتێبەکە دەکڕن لە پەنجەکانی دوو دەست تێپەڕ نەکەن.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو ئەوە بوو کە زۆرێك لەو خەڵکەی (چۆن سەعی بکەیت)یان کڕی و لەگەڵیدا چەندەها نامەیان بۆ ناردم، لە پێگەیشتووان بوون. بەڵێ، ژمارەیەکیان دەگەڕانەوە بۆ قوتابخانە و (چۆن سەعی بکەیت)یان بە تازەکەرەوەیەکی بێ هاوتا دەبینی. هەندێکیان لە قوتابخانە نەبوون، بەڵام بۆیان دەیانزانی کە ئەگەر بتوانن ئێستا ئەو شارەزایەتییانە فێر بن کە مامۆستاکانیان قەت پێی نەوتوون (یان قەت کاتی ئەوەیان نەقۆستۆتەوە فێری بن)، ئەوا لە ژیانیاندا کاریگەرتر دەبن.

زۆرێکیش لەوانە ئەو دایك و باوکانە بوون کە هەمان ئاه و ناڵەیان هەبوو: "چۆن وا لە جۆنی بکەم بخوێنێتەوە (سەعی بکات، لە تاقیکردنەوەکاندا باشتر بێت، زیاتری لە بیر بێت، نمرەی باشتر بێنێت)؟ ئەگەر هەموو وانەکانی لەسەر پلەی ستەیشن بێت، ئەوا زۆر باشە دێنێت!"

کەواتە، دەمەوێ بە کورتی کات بقۆزمەوە بۆ موخاتەبەکردنی هەر کام لە جۆرەکانی خوێنەری ئەم کتێبە و قسە لەسەر هەندێ فاکتەری تایبەت بە هەر یەکێك لە ئێوە بکەم.

### ئەگەر تۆ خوێندکاری ئامادەییت

دەبێ تۆ بەشێوەیەکی دیاریکراو بە داڕشتەی ئەم کتێبە ئاسودە بیت- پەرەگراف و رستەی تا رادەیەك کورتی تێدایە، سەردێڕ و سەردێڕی فەرعیی ناوبەناو سوعبەت ئامێز (هیوادارم وابێ) و زمانێکی وەها بەکارهێنراوە. کە نوسیوومە تۆم لە خەیاڵ بووە!

بەڵام دەبێ بەهەمان شێوە نائاسودە بیت بەرانبەر ئەو راستییەی کە تۆ لە ناوەڕاستەکانی ساڵانی خوێندنـدایت-ماوەیـەك کـە بەشـێوەیەکی بەرچـاو، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان، کاردەکاتەسەر تەواوی پاشماوەی ژیانت- و هێشتا نازانیت چۆن سەعی بکەیت! خولەکێکی تر لەدەست مەدە. فێربوونی چـۆن سـەعی کـردن و ئەسـپ تـاودان لـە هـەموو شـارەزایەتییەکانی سەعیکردن لەم کتێبەدا بکە بە ئەولەویەتی رەهات.

### ئەگەر تۆ خوێندکارێکی ئاستی ناوەندیت

پیرۆزە! تۆ لەکاتێکی تەواو گونجاودا فێری ئەوە دەبیت چۆن سەعی بکەیت. بێگومان پۆلی حەوت، هەشت و نۆ- پێش ئەو بازدانە هەندێ جار گەردوونییە بۆ ئامـادەیی- ماوەیەکە کە دەبێ هەموو ئەو شارەزایەتییانەی سەعیکردن فێر ببن، چونکە ئەمە ئامادەیی نەك هەر ئاسانتر دەکات، بەڵکو دەیکاتە ئەزموونێکی پۆزەتیڤتر و سەرکەوتووانەتر.

### ئەگەر تۆ خوێندکارێکی "تەقلیدی"ی کۆلێژیت

...تەمەنی ١٨ بۆ ٢٥، هیوادارم ئێوە ئەو یەك دوو شارەزایەتییەی سەعیکردن فێر ببن کە لە ئامادەیی نەتانتووانیووە ئەسپی خۆتانی تیادا تاو بدەن. ئەگەرنا، ناتوانم بزانم چـۆن لـە کۆلێـژ سەرکەوتوو دەبن. (ئینجا جارێکی تر، ناتوانم بزانم چۆن توانیوتانە بگەنە کۆلێژ). ئەگـەر ئێـوە لەوپەڕی سەرەتاوە دەست پێدەکەن، ئامۆژگاریم بۆتان وەکو ئەوەی خوێندکارانی ئامادەییە و خوێندنەوەی ئەم کتێبەیە: هەموو شتێك بەلاوە بنێن و بیکەنە ئەولەویەتی یەکەمتان. مـەڵێ بـا بڕۆم. داوای پیتزاش مەکە.

ئەگەر دایك یان باوكی خوێندكارێكیت لە هەر تەمەنێكدا

لەوانەیە قوتابخانەی منداڵەكەت شتێكی وەها نەكات، ئەگەر بیشیكات، بۆئەوەی پێی بڵێت چۆن سەعی بكات. ئەمەش بەو مانایەیە كە (چۆنێتی فێربوون) فێر نابێت. ئەمەش بەو مانایەیە فێر نابێت چۆن سەركەوتوو بێ.

لەوانەیە تەنانەت دایك و باوكی خۆتەرخانەكردووتر هەبن لە خوێندكاری خۆتەرخانكردوو، چونكە یەكەم پەیوەندیی تەلەفۆنیم لە هەر دەركەوتنێكم لەسەر تەلەفزیۆن یان لە ستۆدیۆی رادیۆ لە دایك یان باوكێكی دڵسۆزەوە دێت كە پرسیار دەكات، "چی بكەم بۆ یارمەتیدانی منداڵەكەم بۆئەوەی لە قوتابخانە باشتر ببێت؟" باشە، ئەمەش یاساگەلێك بۆ دایكان و باوكانی خوێندكارانی هەر تەمەنێك:

١.پانتاییەكی واجبی ماڵەوە دیاریبكە. هیچ شتێكی پەرتكردنی هۆشی لێ نەبێت. زۆر رووناك بێت. هەموو پێداویستییەكی بەكەڵكیشی لێ بێت.

٢.رۆتینێكی واجبی ماڵەوە دیاریبكە. چ كاتێك و لە كوێ ئەمە دەكرێ. لێكۆڵینەوەكان بە روونی دەریانخستووە كە ئەو خوێندكارانەی رۆتینێكی دووبارەبووەوە بونیاد دەنێن باشتر بەپلان و رێكخراون و سەرەنجام سەركەوتووترن.

٣.ئەولەویەتەكانی واجی ماڵەوە دیاریبكە. لە راستیدا، تەنیا ئەوە پیشان بدە كە واجبی ماڵەوە ئەولەویەتەكەیە– پێش مەوعیدێك، پێش تەلەفزیۆن، پێش چوونە دەرەوەی بۆ یاری، یان هەر شتێكی تر.

٤.خوێندنەوە بكە بە خوویەك– بە دڵنیاییەوە بۆ ئەوان، بەڵام بۆ خۆشتان. منداڵان بەشێوەیەكی حەتمی ئەو شتانە دەكەن كە ئێوە دەیكەن، نەك ئەوەی كە دەیڵێن (تەنانەت ئەگەرچی پێشیان بڵێن ئەوە نەكەن كە ئێوە دەیكەن).

٥.تەلەفزیۆن بكوژێنەرەوە. یانی لانی هەرە كەم، بە تەواوی سنووری ئەوە دابنێ چ كاتێك و چەندە تەماشاكردنی تەلەفزیۆن گونجاوە. لەوانەیە ئەمە سەختترین پێشنیار بێت بۆ سەپاندن. دەزانم، من باوكی هەرزەكارێكم.

٦.قسە لەگەڵ مامۆستاكاندا بكە. بزانە دەبێ منداڵەكانت چی فێر ببن. ئەگەر لەبارەی ئەو كتێبانەوە نەزانیت كە دەبێ بیخوێننەوە، لە پۆلدا چیان لێ چاوەڕێ دەكرێت و دەبێ چەندە

واجبی ماڵەوە بخەنە بەرنامەوە، تۆ بە راستی ناتوانیت ئەو یارمەتییەیان پێشکەش بکەیت کە پێویستیانە.

٧.هان بدە و بجولێنە، بەڵام هەراسانیان مەکە واجبی ماڵەوە بکەن. ئەمە ئاکامی نیە. چەندە پێداگری بکەیت، ئەوەندە خێراتر گوێیان لە قسەکانت دادەخەن.

٨.سەرپەرشتی کارەکەیان بکە، بەڵام مەکەرەوە داوی ئەنجامدانی واجبی ماڵەوەیان. بۆ نموونە، پشکنین (سەحکردن)ی بابەتێکیان، رێگایەکی پۆزەتیڤە بۆ یارمەتیدانی منداڵەکەت لە قوتابخانە. بەڵام ئەگەر هەروا بە سادەیی راستکردنەوە ئەنجام بدەیت بەبێ ئەوەی منداڵەکەت لە هەڵەکانیەوە فێر بێت، ئەوا بە هیچ شێوەیەك یارمەتی نادەیت...تەنیا لەو بیروباوەڕەدا نەبێت کە ئەو بەرپرس نیە لە کارەکەی خۆی.

ستایشیان بکە کاتێك سەرکەوتوو دەبن، بەڵام لەبەرانبەر کارێکی کەمێك باشدا زێدەڕۆیی مەکە. کاتێك راستگۆ نیت منداڵ دەزانیت و جارێکی تر، بە خێرایی گوێچکەکانی دادەخات لێت.

١٠.بە واقیع قەناعەتیان پێ بێنە. (ئەمە بۆ خوێندکارانی گەورەترە) باشە، من بەوە دەزانم کە ئەمە تەقریبەن ئەوەندە کوژاندنەوەی تەلەڤزیۆن جوڵەی ماسولکەی دەوێ، بەڵام فێربوون و بڕواهێنانیان بەوەی کە جیهانی واقیع باکی نیە بە نمرەکانیان بەڵکو بە زانین و توانینیان پێوانەیان دەکات، وانەیەکە کە فرمێسکێکی زۆر (لەوانەیە هی تۆ) لە رژان دەگێڕێتەوە. لەوانەیە زۆر زوو نەبێت کە (بەئاگایانە) وا بکەیت بلیمەتە کوڕ یان کچەکەت ئەو پەیامە وەربگرێت کە ژیان عادیلانە نیە.

١١.ئەگەر دەستت دەڕوا، کۆمپیوتەرێك بۆ منداڵ(ەکانت) بکڕە و بە هەموو ئەو پرۆگرامە سۆفتوێرانەشەوە کە دەتوانن دەرەقەتی بێن. شتێك هەیە بە راستی ناتوانی خۆتی لێ لابدەیت: منداڵەکانت، هەر تەمەنێك بن، پێویستە بە شێوەیەکی رەها تێگەیشتنی کردارییان لە کۆمپیوتەر هەبێ بۆ ئەوەی لە قوتابخانە و دوای قوتابخانەش بەرگە بگرن.

١٢.هەرنێستا تەلەڤزیۆن بکوژێنەرەوە !

١٣.کۆنێکتی بکە. ئینتەرنێت گەورەترین داهێنانی سەردەمی ئێمەیە و ئامرازێکی باوەڕنەکراوە بۆ خوێندکارانی هەر تەمەنێك. ئەستەمە بۆ خوێندکارێکی کۆلێژ سەرکەوتوو بێت بەبێ توانای گەڕان لەسەر ئینتەرنێت و بۆ خوێندکارانی لاوتریش تەقریبەن ئەستەمە. دەبێ کۆنێتکت بن.

١٤.بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی واجبی ماڵەوە (مەسجی خێرا یان چات)، ئەوان هەوڵ دەدەن قەناعەت پێ بێنن کە دەتوانن راپۆرت بنووسن، واجبی جوگرافیایان ئەنجام بدەن و لە هەمان کاتدا چات لەگەڵ هاوڕێکەیاندا بکەن. ئەو دایك و باوکانەی بڕوایان بەمە هەیە بەهەمان شێوە قەناعەتیان پێ هێنراوە کە باشترین پانتایی بۆ سەعیکردن بەردەم تەلەفزیۆنە.

## گرنگی تێوەگلانت

بۆ ماوەی خولەکێکیش گرنگیی پابەندیت بە سەرکەوتنی منداڵەکەتەوە فەرامۆش مەکە. تێوەگلانت لە پەروەردەی منالەکەت بەشێوەیەکی رەها جەوهەرییە. ئەنجامەکانی هەر توێژینەوەیەك کە لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا کراوە بە روونی جەخت دەکاتەوە لەو تاکە فاکتەرەی کە بەشێوەیەکی یەکجار زۆر کار دەکاتەسەر سەرکەوتنی خوێندکار لە قوتابخانەدا: تێوەگلانت-نەك پارە، مامۆستای بەناوبانگ، هۆڵی وەرزشیی گەورەتر یان کلاسەکانی مۆسیقا. خودی خۆت.

بۆیە تکایە، کات تەرخان بکە بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە. فێربە کە دەبێ منالەکانت چی فێر بن. تۆش دەتوانیت بەشێوەیەکی بەرچاو یارمەتیدەر بیت، تەنانەت ئەگەرچی خۆت خوێندکارێکی باشیش نەبوویت، تەنانەت ئەگەرچی خۆشت شارەزایەتییە گەورەکانی سەعیکردن فێر نەبوویت. ئێستا دەتوانیت لەگەڵ منالەکەتدا فێری بیت- نەك تەنیا لە قوتابخانەدا یارمەتی ئەو دەدات، بەڵکو یارمەتی تۆش دەدات لە ئیشەکەتدا، جا بوارەکەت هەرچییەك بێت.

## ئەگەر تۆ خوێندکارێکی ناتەقلیدیت

ئەگەر تۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەیی، کۆلێژ، یان قۆناغی دوای زانکۆ لە تەمەنی ٢٥،٤٥،٦٥ یان ٨٥ ساڵیدایت-لەوانەیە لە هەر کەسێکی تر زیاتر پێویستت بە (چۆن سەعی بکەیت) بێت! بۆچی؟ چونکە چەندە زۆر لە خوێندن دابڕابیت، ئەوەندەی ئەگەری زیاترە ئەوەت بیر نەیەتەوە کە بیرت چووەتەوە. ئەوەشت بیر چووەتەوە کە پێت وابووە لەبیرت دەبێ! چەندەی زۆر جەخت لەوە دەکەمەوە کە بە دەگمەن زووە بۆ فێربوونی خووە باشەکانی سەعیکردن، پێویستە جەخت لەوەش بکەمەوە کە قەت زۆر درەنگ نییە.

### ئەوەی کە لەم کتێبەدا بەدی ناکەیت

من ئەو کتێبانەم بینیووە کە چەندەها بەشیان تەرخان کردووە بۆ خواردنی رێك و پێك، چۆنێتی پۆشینی جل و بەرگ، چۆنێتی وەرزشکردن و ژمارەیەکی بابەتی تر کە بەهیچ شێوەیەك لەم کتێبەدا قسەیان لەسەر نەکراوە، جگە لەم کورتترین ئاماژەکردنە: ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە بەرنامەی خۆراکی، خەو، وەرزش و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر (لەوانەش کحول، نیکۆتین و کافین) کار دەکەنەسەر سەعیکردنت، لەوانەشە بەشێوەیەکی بەرچاو کاریگەرییان هەبێ.

بۆیە، هۆکارێکی کەم دەبینم لەوەدا کە کاتتان بە شتێك بە فیڕۆ بدەم کە دەبێ روون بێت: هەر شتێك- لەوانەش سەعیکردن- زۆر قورسە ئەگەر بێتاقەت، برسی، نەساغ، سەرخۆش، سەرگێژەتان هەبێ و هیتر. بۆیە تکایە ئەقڵی سەلیم بەکاربهێنن. چەندەی بکرێ خواردنی تەندروست بخۆن، ئەوەندەی جەستەتان پێویستی پێیە بخەون، ئەوەندەی بکرێت جەستەیەکی (فیت)تان هەبێ و خۆتان لە کحول و ماددە هۆشبەرەکانی تر بەدوور بگرن. ئەگەر سەرنەکەوتننتان بەهەر شێوەیەك بەهۆی یەکێك لەو هۆکارانەوەیە و ناتوانن بە تەنیا چارەی بکەن، کتێبێکی باش یان پرۆفێشناڵێك بدۆزنەوە بۆئەوەی یارمەتیتان بدات.

### ئامادەیت شتێك فێر بیت؟

ئەو کتێبەی کە بەدەستتانەوە گرتووە، چاپی حەوتەمیەتی. بەردەوام بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ یارمەتی خوێندکاران و دایکان و باوکان (تەنانەت مامۆستایانیش)ی داوە .

نابێ فێربوون ئازاربەخش یان تاقەتبەر بێت، هەرچەندە ناوبەناو هەردووکیانە. من بەڵێنی ئەوە نادەم کە (چۆن سەعی بکەیت) هەموو شتێك ئاسانتر دەکات. نەخێر. ناشتوانێ. لەوانەشە بە راستی خۆماندووکردنێکی بوێ بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی کە دەتەوێ. بەلام (چۆن سەعی بکەیت) رێگاکەت پیشان دەدات، ئاراستەکانت پێ دەڵێت و دڵنیا بەرەوە لەوەی کە تەواو پێداویستییەکانت بێ بۆ گەشتەکەت.

تۆ یەکەم جار کە دەخوێنیتەوە هەموو شتێك تێناگەیت. یان لەوانەیە تەنانەت دووەم جار و سێیەم جاریش. دەبێ لەسەرخۆ فێریان ببیت، زۆر لەسەرخۆ. بەڵام ئەمە بەو مانایە نیە کە

عەیبێکت هەیە. لەوانەیە ئەمە بابەتێك بێت کە هەمووان بە هێواشی فێری دەبن. (تەڵەزگەی دیاریکراوی من کیمیای ئەندامی بوو). کتێبێکی لاواز یان مامۆستایەکی ساردکەرەوە دەتوانێ وا لە هەر بابەتێك بکات کە عەزاب بێت.

دایکان و باوکان زۆرجار پرسیارم لێ دەکەن، "چۆن دەتوانم هەرزەکارەکەم بجوڵێنم؟" وەڵامێك هەیە، بەڵام ئەمە شتێك نیە دایکان و باوکان بتوانن بیکەن– ئەمە شتێکە تۆ، خوێندکار، دەبێ بڕیاری لێ بدات: نیازت وایە ڕۆژی قوتابخانە بە بایەخدان و کاراییەوە یان بە بێتاقەتی و قینەوە بەڕێ بکەیت؟

بە ڕاستی هەروا سادەیە. لەبەرئەوەی هەرچۆنێك بێت دەبێ بچیتە قوتابخانە، بۆچی بڕیار نادەیت کە دەشێ چالاك بیت و ئەوەندەی بکرێ شت فێر بیت لەبری ئەوەی لە نەگبەتیدا بناڵێنیت؟ بە مکوڕییەوە بڕوام وایە کە جیاوازیی نێوان (ناوەند) و (زۆرباشە) یان (باشە) بۆ زۆرێك لە خوێندکاران، تەنیا پەیوەندی هەیە بە (ویست)ەوە بۆ باشتربوون. کاتێك تۆ تەخەروج دەکەیت، بەخێرایی بۆت دەردەکەوێ کە هەموو ئەو شتەی هەر کەسێك بەلایەوە گرنگە ئەوەیە کە دەیزانیت و دەیتوانیت. نمرەکان چیتر گرنگ نین، نە تاقیکردنەوەکانیش. کەواتە تۆ دەتوانیت ئێستا فێری بیت یان دوایی پەشیمان بیتەوە.

تۆ بەهەمان شێوە بەشێوەیەکی حەتمی بڕیار دەدەیت کە یەك یان زیاتر لە کۆرسێك لە کاتێکی دواتری ژیاندا کەڵکی نابێت. تۆ بۆڵە بۆڵ دەکەیت "من نازانم بۆچی خۆم بەستووەتەوە بە فێربوونی حسابات (جەبر، فیزیا، کیمیا، مێژوو، بۆشایی پڕکردنەوە)! قەت پێویستم پێیان نابێ".

متمانەم پێ بکە: هیچ نازانیت لەبارەی ئەمەی لەوانەیە هەفتەیەکی تر، چ جای ئەوەی دەساڵ دواتر، چیت پێویست بێ و چیت پێویست نەبێ، بەکاربهێنیت، یان بیر بێتەوە. من لە ژیانی خۆمدا بۆم دەرکەوتووە کە بڕێکی سەرسورهێنەری فێربوون و زانیاریی "بێکەڵك" بۆ کار و پیشەم تەواو گرنگ بووە.

بۆیە هەمووی فێربە. بە جۆش و خرۆش بە بۆ پرۆسەی فێربوون و من گەرەنتیتان دەدەمێ کە پێویستت بەوە نابێ نیگەران بیت لەوەی کە پێویستە چی بزانیت لە ئایندەدا.

ڕێبەری تری سەعیکردن هەن

هەرچەندە من بەشێوەیەکی خاکییانە جەخت دەکەمەوە کە (بەرنامەی چۆنێتی سەعیکردن)م یارمەتیدەرترینە بۆ زۆربەی خەڵکی، بە دڵنیاییەوە بڕێکی زۆری کتێبی تر هەن کە بانگەشەی ناونیشانی سەعیکردن دەکەن. بە داخەوە، پێم وانیە کە زۆربەیان بەڵێنەکەیان ببەنەسەر. بەشێوەیەکی حەتمی، ئەم کتێبانەی تر برەو بە "سیستەم"ی نووسەرەکە دەدەن، کە بەزۆری مەبەستیان پیشاندانی چۆنێتی سەرکەوتووبوونی (خۆیانە) لە خوێندن. ئەم "سیستەمە" چ ئەوەی بنچینەیی، تەقلیدی یان زۆر نامۆ بێت، لەوانەیە و لەوانەش نیە بۆ تۆ بەکەڵك بێت. کەوابوو چی دەکەیت ئەگەر شێوازی نوسینەوەی تێبینییەکان "ی ئەوان" بۆ تۆ بێ مانا بێت؟ یان شارەزای ناونیشانە قەبەکانی وەکو "رازە گەورەکانی خوێندکاری نائاسایی"یان بیت و هێشتا سەرکەوتوو نەبیت؟

لە جیهانی سەعیکردندا "راست" و "هەڵە"ی کەم هەن. بە دڵنیاییەوە تاکە رێگەیەکی "راست" بوونی نییە بۆ چالاکانە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەکی فرە هەڵبژاردن یان نوسینەوەی تێبینی یان نووسینی بابەت یان راپۆرت. بۆیە بەوە مەخەڵەتێ کە شتێکی وەها هەیە، بەتایبەت ئەگەر ئەوەی کە تۆ خۆت دەیکەیت دیار بێت بەکەڵکە بۆت. ئەو شێوازە مەگۆڕە کە عەیبی نیە تەنیا لەبەرئەوەی کە بەناو شارەزایەکی سەعیکردن بانگەشەی ئەوەی دەکات کە ئەوەی تۆ دەیکەیت سەرلەبەر هەڵەیە. لەوانەیە خۆی سەرلەبەر هەڵە بێت.

هەڵبەت، کتێبەکەی من مەخوێنەرەوە ئەگەر بۆ تاکە سیستەمێکی "یاساکان" دەگەڕێیت کە بۆ هەمووان سوودی هەیە. شتێکی وا نادۆزیتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا شتێکی وەها نیە. تۆ چەندەها تەکنیك، رێنمایی، فێڵ، لێهاتوویی و شێوازی تر فێر دەبیت کە لەوانەیە بەکەڵك بن بۆت، لەوانەشە هەندێکیان نا. دەست بۆ بەرە و هەڵبژێرە، بگۆڕە و خۆت بگونجێنە، بزانە کامیان بەکەڵکت دێن. چونکە خۆت بەرپرسیت لە دروستکردنی سیستەمی سەعیکردنی خۆت نەك من.

هەروەکو ئاماژەم پێدا، دەتوانم گەرەنتی ئەوە بدەم کە ئەو چەندەها لاپەڕەیەی کتێبی (چۆنێتی سەعیکردن)ی من فراوانترین، گشتگیرترین و تەواوترین سیستەمی سەعیکردن دەگرنەخۆ کە تاوەکو ئێستا چاپ کراوە. هەوڵمداوە سیستەمێك دروست بکەم کە مایەی بەکارهێنانە، بەکەڵکە، کردارییە و شیاوی فێربوونە. کتێبەکە کە تۆ دەتوانی (دەستبەجێ)

بەکاری بهێنیت– جا تەمەنەکەت هەرچەندێك بێت، سەرکەوتنت لە هەر ئاستێکدا بێ و زیرەکیت لە هەر پێوانەیەکدا بێ– بۆ دەستکردن بە باشتربوون لە خوێندن، سەرکار و لە ژیاندا.

پێم وایە کاتی پێویستمان بەسەر برد بۆ قسەکردن لەبارەی ئەوەی کە چی فێر دەبیت. با دەست بکەین بە فێربوون.

کارزانی یان نزیك کارزانیی شارەزایەتییەکی دیاریکراو، "B" (باش) بۆ کـەمێك کـارزانی، "C" (ناوەند بۆ لاواز) بۆ تۆزقاڵێك یان نەبوونی کارزانی تێبگەیت.

بەڵام با یەکەم جار پشکنینێکی سەرسەختر بکەین، تەنیا بۆ بەخشینی بەرچاوڕوونییەك پێت بۆئەو شتانەی کە دواتر دێن. ئـەو ٢٨ دەسـتەواژەیەی خـوارەوە بخوێنـەرەوە و بزانـە کامیـان بەسەر تۆ دا پیادە دەبن. ئەگەر دەستەواژەیەك بەسەرتدا پیادە دەبێ بەڵێ دابنێ و ئەگـەر نـا نەخێر دابنێ.

١.بریا بمتوانیایە خێراتر بخوێنمەوە

٢.دەچمە پۆلەوە بەڵام هۆشم زۆر لەسەر دەرس نییە

٣.بـە دەگمـەن بـۆ تاقیکردنـەوەکان چـاو دەخـشێنمەوە، بـەڵام شـەوی پـێش تاقیکردنـەوە چەندین سەعات خەریك دەبم

٤.پێم وایە کاتێکی زیاتر لەوەی پێویستە بە سەعیکردن بەسەر دەبەم.

٥.زۆرجار بە تەلەفزیۆن/یان رادیۆ هەڵکراوی سەعی دەکەم.

٦.بە دەگمەن هەموو واجبی ماڵەوە لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدەم.

٧.زۆرجار نوسینەوە یـان راپـۆرتی واجـب هەفتـە (یـان شـەو)ی پـێش وادەی خـۆی ئـەنجام دەدەم

٨.من هەموو کتێبێك بەهەمان خێرایی و بە هەمان شێواز دەخوێنمەوە.

٩.من شەیدای مەسجی خێرای ئۆنلاینم، بەڵام پێناچێت ئـەو زانیارییـە بدۆزمـەوە کـە لەسـەر ئینتەرنێت پێویستمە

١٠.بە واجبی زۆری ماڵەوە سەرگەردان بووم

١١.قەت ناتوانم واجبەکانی خوێندنەوە لەکاتی خۆیدا تەواو بکەم

١٢.هەمیشە وا دەردەکەوێ شتی ناپەیوەندیدار دەنووسمەوە لەناو پۆلدا.

١٣.ناوبەناو واجبە گرنگەکان و بەرواری تاقیکردنەوەکان لەبیر دەکەم

١٤.پێش تاقیکردنەوە دەشێوێم و لەوە خراپتر دەبم کە پێم وایە

١٥.پێویستە ناوبەناو تەواوی لاپەڕەکان دوو یان سێ جـار بخوێنمـەوە پـێش ئـەوەی لێیـان تێبگەم.

١٦.کاتێك لە خوێندنەوەی بەشێك تەواو دەبم، زۆرجار بەشی زۆریم بیر نایەتەوە

# بەشی یەکەم

## چۆن بە دروستی دەست پێبکەیت

"ئەوەندە بەس نیە فێری ئەوە بین کە پێویستە فێری بین ئەگەر لەوە تێنەگەین چین و لەوە تێناگەین کە چین ئەگەر نەزانین دەبێ ببین بە چی" تی.ئێس.ئیلیەت

ڕوانینێکی ڕاستگۆیانە لە خۆت ئاسانترین شت نییە لە جیهاندا. لە دوو بەشی دواتردا، دەمەوێ یارمەتیتان بدەم:

—توانا هەنوکەییەکانی خۆت بۆ سەعیکردن هەڵسەنگێنە، کە هەنگاوێکی پێویستە بۆ ناسینەوەی ئەو ڕووبەرانەی تیایاندا پێویستت بە چرکردنەوەی هەوڵەکانتە.

—ئەو ژینگەیەی سەعیکردن و ئەو ستایلەی فێربوون بناسەرەوە کە گونجاون بۆت.

—هەموو دەرسەکانی قوتابخانەت پۆلێنبەندی بکە بەپێی چەندێتی (حەزکردن)ت پێیان و چەندێتی (لێهاتوویی)ت تیایاندا.

### چۆن لەسەر سکە بمێنیتەوە

لەو چەند لاپەڕەیەی دواتردا، ١١ شارەزایەتیی سەرەکی ڕوون دەکەمەوە کە لەم کتێبەدا هاتوون: خوێندنەوە و تێگەیشتن، پەرەپێدانی بیرەوەری، بەڕێوەبردنی کات، شارەزایەتییەکانی کتێبخانە، شارەزایەتییەکانی کۆمپیوتەر، نوسینەوەی تێبینییەکانی کتێبی مەنهەج، نوسینەوەی تێبینییەکان لەناو پۆلدا، نوسینەوەی تێبینییەکان لەناو کتێبخانەدا، بەشداریی ناو پۆل، نوسینی بابەت و ڕاپۆرت و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە. پاشان داوات لێدەکەم خۆت لەسەر ئاستی سەرکەوتنت پلەبەندی بکەیت و لە هەر یەکە لە: "A" (نایاب) بۆ

١٧.هەوڵ دەدەم هەر شتێك كە مامۆستا دەیڵێت بنوسم، بەڵام زۆرجار ناتوانم لە زۆربەی تێبینییەكانم تێ بگەم

١٨.تەنیا دەتوانم نزیكەی ١٥ خولەك سەعی بكەم پێش ئەوەی بێتاقەت ببم یان هۆشم پەرت ببێت.

١٩.كاتێك ئیش لەسەر دارشتن یان راپۆرتێك دەكەم، زۆربەی كات خۆم بە قاموسەوە سەرقاڵ دەكەم

٢٠.هەمیشە پێدەچێ سەعی لە شتێكی ناپەیوەندیدار بكەم

٢١.هیچ جۆرە رۆژژمێرێك بەكارناهێنم

٢٢.سەعی بۆ هەندێ لە تاقیكردنەوەكان دەكەم، بەڵام هەمیشە كە دەگەمە ئەوێ بیرم دەچێتەوە سەعیم لە چی كردووە

٢٣.كاتی پێویستم نیە بۆ زیرەكبوون لە قوتابخانە و هێشتا ژیانێكی كۆمەڵایەتیم هەیە

٢٤.ناتوانم لە خاڵە گرنگەكانی ناو كتێبی مەنهەجم تێبگەم

٢٥.كاتێك راستەوخۆ پێش تاقیكردنەوە دەروانمە تێبینییەكانی ناوپۆلم، ناتوانم لێیان تێبگەم

٢٦.رقم لەوەیە بخوێنمەوە

٢٧.لە تاقیكردنەوەكانی دارشتندا نمرەم لێ دەشكێنرێت چونكە خراپم لێیان

٢٨.كاتێكی زۆر لەسەر كۆمپیوتەرەكەم بەسەر دەبەم، بەڵام هەست دەكەم زۆرترینی بەفیرۆ چووە.

وەڵامەكانت چی دەگەیەنێ؟ ئەگەر (بەڵێ)ت نووسی بۆ پرسیارەكانی:

–٢،٥ یان ١٨، ئەوا پێویستت بەوەیە ئیش لەسەر تەركیزت بكەیت

–١،٨،١٥،١٦،٢٤، یان ٢٦، ئەوا شارەزایەتییەكانی خوێندنەوە و لێ تێگەیشتنت لەدواوەن

–٣،١٤ یان ٢٢، پێویستت بەوەیە شێوازێكی رێك و پێك فێر بیت بۆ تاقیكردنەوە و چۆنێتی كەمكردنەوەی شڵەژانی تاقیكردنەوە

–٤،٦،١٠،١١،١٢،٢١، یان ٢٣، شارەزایەتییەكانی رێكخستنت نائومێدت دەكەن

–٧،١٩،٢٧ تۆ كاتێكی زۆر بە دارشتن و راپۆرت بەسەر دەبەیت، بەڵام هێشتا شارەزیەتییە رێكوپێكەكانی رێكخستن یان توێژینەوە فێر نەبوویت.

-٩ یان ٢٨، تۆ پێویستت بە پەرەدانە بە شارەزایەتییەکانی کۆمپیوتەر

-١٢،١٧،٢٠، یان ٢٥ تۆ پێویستت بە سیستەمێکی باشتر هەیە بۆ نوسینەوەی تێبینییەکان لەناو پۆل و لە کتێبەکانی مەنهەجتەوە

گرنگ نییە چەند (بەڵێ)ت هەیە ئەوەندەی کە چەندیان لە بوارێکی دیاریکراودا کۆکراونەتەوە گرنگە- ئەوەیان کە تیایدا بە ئاشکرا پێویستت بە یارمەتییە. (هەرچەندە دەبێ ١٠ وەڵامی بەڵێ یان زیاتر لە زیاتر لە تاکە بوارێکدا کێشەی گەورە پیشان بدەن).

با کەمێك زیاتر بچینە ناو وردەکارییەوە و تەنانەت نزیکتر مامەڵە لەگەڵ شارەزاییە هەنوکەییەکانی سەعیکردنتدا بکەین. من شارەزایەتییە گرنگەکانی سەعیکردنم لە لاپەڕەکانی دواتردا ریزبەندی کردووە. کاغەزێکی جیا بەدەستەوە بگرە و لە هەر یەکێکیاندا خۆت پلەبەندی بکە ( هەر لە خوێندنەوەوە تا خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە) پێش ئەوەی پاشماوەی ئەم بەشە بخوێنیتەوە. پاشان بۆ هەر (A)یەك دوو خاڵ بۆ خۆت دابنێ، یەك خاڵ بۆ هەر (B)یەك ، سفر خاڵ بۆ هەر (C)یەك.

ئەگەر تێکڕای پلەبەندییەك ١٨ یان زیاتر بێت، لە هێڵی "خۆهەڵسەنگاندنی سەرەتایی"دا (A) بە خۆت بدە. لە ١٣ بۆ حەڤدە (B) بە خۆت بدە و ئەگەر ١٢ یان کەمتر بوو ئەوا (C) بە خۆت بدە. ئەمە هەڵسەنگاندنی خووەکانی سەعیکردنتە بەو شێوەیەی کە هەر ئێستا بوونیان هەیە.

با ئێستا چاو بخشێنین بە هەر یەکێك لەو بوارانە، کە بەرچاوڕوونیت پێدەدەن لەبەرانبەر ئەوەی کە "نایاب"، "باش"، و "مام ناوەند" بە راستی چ مانایەکیان هەیە. لەکاتێکدا کە هەر بەشێك دەخوێنیتەوە، پلەبەندییەکەی خۆت لەسەر خشتەی "خاڵی دەستپێکت" تۆمار بکە- و لەگەڵ خۆتدا راستگۆ بە.

ئەم هەڵسەنگاندنە ستانداردێکت پێ دەدات کە لێیەوە دەتوانیت چوونت بەرەو باشی پێوانە بکەیت پاش ئەوەی ئەم کتێبە تەواو دەکەیت. هەڵیبگرە و پاش تەواوکردنی خوێندنەوەت بەراوردەکە ئەنجام بدە.

بیرت بێت: لە هەریەك لەمانەدا (راست) یان (هەڵە) بوونی نییە

هەڵسەنگاندنەکان: ئەمانە خاڵی بردنەوە و دۆڕانن کە دەتوانیت لێیانەوە پێوانەی بەرەوپێشچوونت بکەیت و ئەو رووبەرانە بناسیتەوە کە تیایاندا شارەزاییەتییەکانت پێویستیان بە باشبوون هەیە.

**خاڵی دەستپێکت**

| | |
|---|---|
| خۆهەڵسەنگاندنی سەرەتایی | A ( ) B ( ) C ( ) |
| خوێندنەوە | A ( ) B ( ) C ( ) |
| ئیشکردنی بیرەوەریت | A ( ) B ( ) C ( ) |
| بەڕێوەبردنی کاتت | A ( ) B ( ) C ( ) |
| نوسینەوەی تێبینی لە کتێبی مەنهەجەوە | A ( ) B ( ) C ( ) |
| نوسینەوەی تێبینی لەناو پۆلدا | A ( ) B ( ) C ( ) |
| بەشداری لەناو پۆلدا | A ( ) B ( ) C ( ) |
| شارەزاییەتییەکانی ناو کتێبخانە | A ( ) B ( ) C ( ) |
| نوسینی راپۆرت و بابەت | A ( ) B ( ) C ( ) |
| تێکڕای ئاستی شارەزایەتیی سەعیکردن | A ( ) B ( ) C ( ) |

**خوێندنەوە**

خێرایی، تێگەیشتن و بیرهاتنەوە سێ پێکهاتەی گرنگی خوێندنەوەن. بەتایبەت تێگەیشتن و بیرهاتنەوە پێکەوەگرێدراون– باشترە کەمێك خێرایی بکەیتە قوربانی بۆ زیادکردنی ئەم دوو فاکتەرە. بۆ پشکنینی شارەزاییەتییەکانی خوێندنەوە و تێگەیشتنت، ئەو پارچەیەی خوارەوە بخوێنەرەوە (لە "یەکەمەکانی ئەمریکا"ی ستیفن سپیگنێسی، ٢٠٠٤ وەرگیراوە). پاشان کتێبەکە داخە، بە خێرایی ئەو خاڵە سەرەکییانە بنووسەوە کە لەو پارچەیەدا خراونەتەڕوو، چاو بە تێکستەکەدا بخشێنەرەوە و خاڵەکانت بە پارچەکە بەراورد بکە. تۆ بیرۆکەیەکی باش

بەدەست دێنیت لەوەی کە تا چ ئاستێك باش لەوەی کە خوێندووتەوە تێگەیشتوویت و چەندێك بیرهاتنەوەت باشە.

"لەم سەردەمەدا بارکۆدەکان لە هەموو شوێنێك هەن. ئەمانە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەسەر تەقریبەن هەر شمەکێکی بەرهەمهێنراو چاپ دەکرێن– تەنانەت ئەگەرچی هێشتا زۆر فرۆشگای وردەواڵە هەن ئامێری پشکنینی بارکۆد بەکارناهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەوترێت، رۆژێك دێت کە زیاتر لە ٩٥٪ی شمەکی بەکاربەر، بارکۆدی لەسەر چاپ دەکرێت.

بارکۆد پێکدێت لە ١٢ ژمارە، لە سەرەتا، ناوەڕاست و کۆتایی زنجیرەکەدا بەهۆی جوت هێڵ جیاکراونەتەوە. لەیزەر/سکانەری تیشکی ڕێسای ژمارەکان دەخوێنێتەوە و دەستبەجێ کاڵاکە و نرخە راستەقینەکەی دەخوێنێتەوە. بارکۆدەکان یارمەتیدەر بوون بۆ پیشەسازی وردەواڵە و هەروەها بۆ سوپای ئەمریکیش، کە پێویستی بەوەیە کە هەر تاکە شمەکێك کە دەیکرێت بارکۆدێکی قابیلی پشکنینی لەسەر بێت. بارکۆدەکان ڕێگە بۆ پرۆسەیەکی خێرای کڕین، تازەکردنەوەی بەردەوامی لیستی کاڵاکان و زانیاریی ورد و دروست لەبارەی ڕێساکانی کڕین خۆش دەکەن لە فرۆشگاکاندا.

بارکۆدەکان لەساڵی ١٩٤٨دا لەلایەن (بێرنارد سیلڤەر) کە دەرچووی پەیمانگای (درێکسێل) بوو لە فیلادێلیا و جۆزێف ودلاندی هاوکاری داهێنران. ئەوان سەرەتا بە مەرەکەبی سەروو وەنەوشەیی ئیشیان کرد، بەڵام دواجار لەسەر ئەو سیستەمە گیرسانەوە کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت.

هەندێ لە تیۆردانەرانی گەلەکۆمەکێ بڕوایان وایە کە دواجار حکومەت پلان دادەنێت بۆ دانانی بارکۆد لەسەر هەر هاوڵاتییەك، چ لەسەر پشتەوەی مەچەك یان لەسەر پێشە سەر، ئەمەش بۆ چاودێریکردنی بەردەوامی خەڵکی. جێ سەرنجە کە لەم ماوەیەی دواییدا راگەیەنرا کە تەکنۆلۆژیای بارکۆد تا ئەو ئاستە پێشکەوتووە کە ئێستا دەتوانرێ بارکۆد راستەوخۆ لەسەر گۆشت یان هێلکە چا بکرێت و بەبێ زیان گەیاندن بە کاڵاکە بخوێنرێتەوە.

بەڵێ، ئەمە بەو مانایەیە کە ئێستا دەتوانرێ بارکۆدەکان بخرێنە سەر گۆشتی مرۆڤ. وێنای ئایندەیەك بکە کە تیایدا تۆ لە ماڵەوە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە بلیتێك دەکڕیت بۆیارییەکی بەیسبۆڵ و ژمارەی پێناسی بارکۆدی خۆت بەکاردەهێنیت. کاتێك دەگەیتە ستادیۆمەکە، دەستت بەرز دەکەیتەوە و سکانەرە تیشکییەکە ئەو بارکۆدە دەخوێنێتەوە کە لەسەر

پشتەوەی مەچەکت تاتوو (یان هەر شتێکی تر) کراوە. داتابەیسی ڕێنوێن (کە ئەو کاتە هەمووان دەیانبێت) ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە تۆ بە ڕاستی بلیتێکت کڕی و لەو کاتەدا کە پێی دەچیّ بۆ بردنی زەرفە چیپسێك بۆ سکانەری تۆمارکەری پارەی فرۆشگاکە، تۆ ئەگەیتە دەرگای چوونەدەرەوە.

ئەمە زانستی خەیاڵییە؟ بە ڕاستی نا. ئێمە هەنوکە زۆر لەم سیناریۆیەوە نزیکین".

نمرە: ئەگەر تۆ دەتوانیت بابەتەکە ڕێك و ورد بخوێنیتەوە و ئەوەی کە خوێندووتەوە پوختی بکەیتەوە، هەمووشی کەمتر لە دوو خولەك، ئەوا (A) بە خۆت بدە. ئەگەر تۆ لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی تێکستەکە کێشەت هەیە بەڵام دەتوانی کەمتر لە چوار خولەك واجبەکە تەواو بکەیت، ئەوا (B) بە خۆت بدە. ئەگەر نەتووانی لەو کاتەدا واجبەکە تەواو بکەیت، ئەوەت بیر بێت کە خوێندووتەوە، یان بەهیچ شێوەیەك نەتتووانی تێبینیی ورد و کتومت بەرهەم بێنیت، (C) بە خۆت بدە.

لەبیرمانەوە

تاقیکردنەوەی ژمارە ١: بۆ ماوەی ١٠ چرکە سەیری ئەو ژمارەیەی خوارەوە بکە. پاشان لاپەڕەکە داپۆشە و ئەوەندەی لەبیرت دەمێنێت بینووسەوە:

٧٦٢٠٤٩٥٨٢٠٤٩٧٣٦

نمرە: ئەگەر ١٢ ژمارە یان زیاترت بە ڕیز بیرمابوو، (A) بە خۆت بدە، ئەگەر ٨ تا ١١ ژمارەت بە ڕیز بیرمابوو (B) بە خۆت بدە. ئەگەر ٧ یان کەمتر، ئەوا (C) بە خۆت بدە.

تاقیکردنەوەی ژمارە ٢: لە خوارەوە ١٢ وشەی بێ مانا هەن لە زمانێکەوە کە تازە دروستم کردووە شانبەشانی "پێناسە"کانیان کە ئەویشی بە ڕاستی پێناسە نین. بۆ ماوەی ٦٠ چرکە سەعی لە لیستەکە بکە و هەوڵ بدە هەریەکە لە وشەکان، حینجەیان و پێناسەکانیانت لەبیر بێت:

| | |
|---|---|
| بێریلی: گەرم و گوڕ | نارۆوف: تەوالێت |
| سیمپۆك: دەگریت | مککوسکەر: خەو دەبینێت |
| دێلماك: پیرەپیاو | پەربتری: خویّ |
| تریددلّ: زۆر لە خۆی دەکات | ئارموللا: کوپی قاوە |

گازدۆن: شێر فرابجە: دەقوچێنێت

کۆگنیت: بڕبڕە ئێکلێك: نانی نیوەڕۆ

تەواو؟ کتێبەکەت داخە و هەر یەك لە ١٢ وشەکە و پێناسەکانیان بنوسەرەوە. پێویست ناکات بەو ریزبەندییەش بن کە لەسەرەوە نوسراون.

نمرە: ئەگەر بە دروستی نۆ وشە یان زیاتر و پێناسەکانیانت نووسییەوە (بە حینجەی راستی ئەو وشە نوێیانەشەوە کە نوسیوومن) (A) بە خۆت بدە. ئەگەر پێنج بۆ هەشت وشە و پێناسەکانیانت نوسینەوە، یان بە راستی نۆ وشە یان زیاترت نوسین و حینجە کردن بەلام پێناسەکانیانت تێکەڵ کردن، ئەوا (B) بە خۆتِ بدە. ئەگەر نەتتوانی لانی کەم چوار وشە و پێناسەکانیان بیر خۆت بهێنیتەوە، ئەوا (C) بە خۆت بدە.

بەڕێوەبردنی کات

دەتوانرێ بەکارهێنانی چالاکانەی کاتی هەبووت بۆ سەعی بە دوو ڕاستە پێوانە بکرێت: (١) توانات بۆ بەش بەشکردنی واجبەکانت بۆ پێکهێنەرەکانیان (بۆ نموونە، نوسینەوەی تێبینی، دانانی خاڵە سەرەکییەکان، نوسین) و (٢) توانات بۆ تەواوکردنی هەر ئەرکێك بەشێوازێکی هاوکات.

نمرە: ئەگەر هەست دەکەیت بەشێوەیەکی ژیرانە و هاوکات بەکاردەهێنیت، (A) بە خۆت بدە. ئەگەر دەزانیت کە جار هەن کاتت لێ تەواو دەبێ، (B) بە خۆت بدە، ئەگەر ناتوانیت کات بزانیت، (C) بە خۆت بدە.

شارەزایەتییەکانی کتێبخانە

زۆرترین سوود وەرگرتن لە کتێبخانە، کردارێکی تێگەیشتنە لە ڕێکخستنەکەی- و بەکارهێنانی! چەندەی زۆر کات لەوێ بەسەر ببەیت-سەعیکردن، خوێندنەوە، توێژینەوە- ئەوەندە بە بەرهەم دەبیت. تۆ شارەزا دەبیت لە رۆیشتن لەگەڵ سەرچاوەکان و خێرا دۆزینەوەی ئەو زانیارییەی پێویستتە.

تەقریبەن هەموو کتێبخانەکان هەمان ڕێکخستن پەیڕەو دەکەن- هەر کە لێی تێگەیشتیت ئەوا دەبیتە "خوێندەوارێکی کتێبخانە"، گرنگیش نییە چ کتێبخانەیەك بەکاردەهێنیت. تۆ بۆت دەردەکەوێ چ جۆرە سەرچاوەگەلێك هەن (کتێب، بڵاوکراوە، ڕێبەری، فایلەکانی مایکرۆفیلم) و

فێربە چۆن بە بەکارهێنانی (دەیەی دێوی) و کتێبخانەی سیستەمەکانی کۆنگرێس و سیستەمی کۆمپیوتەریزەکراوی کتێبخانە ماددەکان بدۆزیتەوە. بۆ باشتر هەڵسەنگاندنی شارەزایەتییەکانی کتێبخانەت، وەڵامی ئەو پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە:

١.کام کۆبەندانە لە کتێبخانەکەتدا سنووردارن؟

٢.لە کوێ دەتوانی بایۆگرافیی هێربەرت هوڤەر-ی سی و یەکەمین سەرۆکی ئەمریکا لە کتێبخانە نزیکەکەت بدۆزیتەوە؟ بەشی سەرچاوەکان لە کتێبخانەکە لەکوێیە؟

٣. بەلەبەرچاوگرتنی ژمارەی دەیی (دێوی) بۆ کتێبێك، دەتوانی کەمتر لە پێنج خولەك بیدۆزیتەوە؟

٤.لە ماوەی شەش مانگی رابردوودا چەند جار چوویتە کتێبخانە نزیکەکە؟ یان لە مانگی رابردوودا؟

٥.دەزانی چۆن کتێب، بڵاوکراوە و هیتر بدۆزیتەوە لە رێگەی کەتەلۆگی بە کۆمپیوتەرکراوەوە؟

نمرە: ئەگەر وەڵام بۆ ئەو پرسیارانە هەموو بەلاتەوە روونە، ئاراستەیەکی بەردەوامی بەکارهێنانی کتێبخانە پیشان دەدەیت، ئەوا دەشێ خووی کتێبخانەت هەبێت- (A) بە خۆت بدە. ئەگەر ناتوانیت وەڵامی لانی کەم چوار لەو پرسیارانە بدەیتەوە یان ریکۆردێکی ناتەواوی بەکارهێنانی کتێبخانەت هەیە، (B) بە خۆت بدە. ئەگەر تۆ هیچ فکرەیەکت نیە لەبارەی ئەوەی کە نزیکترین کتێبخانە لە کوێیە، (C) بە خۆت بدە.

### شارەزایەتییەکانی کۆمپیوتەر

ئەمڕۆکە تەقریبەن ئەستەمە لە نزیکەی هەر ئاستێکی خوێندن بەبێ لێهاتوویەکی تەواو لە کۆمپیوتەردا. بەڵام زانینی چۆنێتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر تەنیا سەرەتایە. تۆ دەبێ بزانیت چۆن بەکاری دێنیت بۆئەوەی بەشێوەیەکی هاوکات و پڕاوپڕ و کاریگەر سەعی بکەیت. ئەمە فێربوونی چۆنێتی باشتر نوسینی راپۆرت و دارشتن، پاراستنی خشتەکانت و سوودوەرگرتن لە نزیکەی هەموو ئیختیارەکانی توێژینەوەی بەردەست لەسەر ئینتەرنێتیش دەگرێتەوە.

نمرە: ئەگەر تۆ دەتوانیت تەنانەت هەر شتێك لەسەر ئینتەرنێت دەزانیت جگە لە هاککردنی (پێنتاگۆن) و کۆمپیوتەرت کردووە بە ئامرازێکی سەرەکیی گەشتی خۆت بەرەو سەعییەکی

پراوپڕتر و نمرەی باشتر، (A) بە خۆت بدە. ئەگەر تۆ لە ڕەفتارکردن لەگەڵ وشە و یاریکردن شارەزایت و لانی کەم دەتوانیت بچیتە سەر خەت، بەڵام قەت ٧٥٪ی ئامرازەکانی ترت لەسەر کۆمپیوتەرەکەت بەکار نەهێناوە و زیاتر "وێران دەکەیت" لەبری ئەوەی کە بەکاربهێنیت، (B) بە خۆت بدە. ئەگەر تەنانەت نازانیت "لەسەرخەت بوون" چییە و پێویستت بە چوار خولەك هەیە بزانیت چۆن کۆمپیوتەر داگیرسێنیت، (C) بە خۆت بدە.

تێبینی نووسینەوە

بوارە جیاجیاکان–لەماڵەوە لە کتێبی مەنهەجتەوە، لە ناو پۆلدا، لە کتێبخانە و لەسەر ئینتەرنێت– پێویستیان بە شێوازی جیاجیای نوسینەوەی تێبینی هەیە.

لە کتێبی مەنهەجتەوە: لە ئیشکردن لەسەر کتێبەکانی مەنهەجتدا، پێویستت بە ناسینەوەی بیرۆکە سەرەکییەکان، داڕشتنەوەی زانیاری بە وشەکانی خۆت، هەروەها بە وەرگرتنی ئەو وردەکارییە هەیە کە پێی نائاشنا بوویت. لەکاتێکدا کە دەخوێنیتەوە، تێبینیی پێویست و پوخت لە دەفتەرێکی یادداشتی جیادا بنوسەرەوە. پێویستە تۆ پرسیار و وەڵام بنوسیت بۆ دڵنیابوون لە زاڵبوونت بەسەر ماددەکەدا، ئەو پرسیارانە نیشانە بکە کە وەڵامت بۆیان نییە، بۆئەوەی بتوانیت لە پۆلدا پرسیاریان لەبارەوە بکەیت.

لە پۆلدا: خۆئامادەکردن بۆ ناو پۆل، کلیلە بۆ بەشداریی ناو پۆل. بە خوێندنەوەی ئەو ماددەیەی قسەی لەسەر دەکرێت پێش ئەوەی وانەکە دەست پێبکات، دەتوانیت خاڵەکان و لێکدانەوەکانی مامۆستا هەرس بکەیت. بە بەکارهێنانی شێوازێکی ڕستەی کورتی گرنگ یان شێوازە خێراکەی خۆت یان ڕەمزەکانت، لەو ماددانە تێبینی بنوسەرەوە کە تێگەیشتنێکی مەفهومیت لە ماددەکە پێ دەبەخشن. تێبینییەکانت دەبێ زنجیرەیی بن و لەگەڵ ڕێسای محازەرەی مامۆستادا بڕۆن. لە یەکەم دەرفەتی دوای وانەکە چاو بە تێبینییەکانتدا بخشێنەرەوە. هەر بۆشاییەك کە دروست بووە پڕ بکەرەوە بیرۆکەکانی خۆت دابنێ.

لە کتێبخانە یان لەسەر ئینتەرنێت: جیاوازی چییە لەنێوان نوسینەوەی تێبینی لە کتێبخانە یان سەعیکردن لە ماڵەوە بە کتێبەکانی کتێبخانەوە یان ئەوانەی کە لەسەر ئینتەرنێت دۆزیوتنەوە لەبەرانبەر کتێبەکانی مەنهەجتدا؟ زوو یان درەنگ دەبێ کتێبەکانی کتێبخانە بگەڕێنیتەوە (ڕەنگە هەر ڕێگەشت پێ نەدرێ بیانبەیتە دەرەوە) و کارمەندانی کتێبخانەش بە

هێڵ هێنـان بـەژێر دێڕەکـانی کتێبەکانـدا یـان پێـداهێنانی مـاجیکی فۆسـفۆر بەسـەریاندا، دەموچاویان گرژ بکەن. ئەگەر تۆ پلان دانەنێیت بۆ چاپکردنی هەر لاپەڕەیەکی ئینتـەرنێتی کـە دەیدۆزیتەوە و ماجیکی فۆسفۆری پێدا نەهێنیت، پێویستت بە سیستەمێکی کاریگـەر هەیـە بـۆ نوسینەوەی تێبینییەکان راستەوخۆ لە سەرچاوەکەوە، جا چ ئـەوەی کتێبێکـی کتێبخانـە بێـت یان لاپەڕەیەکی ئینتەرنێتی.

نمـرە: ئایـا شـارەزایەتییەکانی نوسـینەوەی تێبینیـت بەسـن بۆئـەوەی داتـای پێویـست لـە مشتومڕ و محازەرەکانی نـاو پۆلـەوە پوخـت بکەیتـەوە؟ ئایـا رێگـەت پێـدەدەن ئـەو زانیارییـە بەدەست بێنیت کە پێویستت پێیە لە سەرچاوە جیاجیاکان، سەرە بابەتـە چڕوپڕەکان ئامـادە بکەیت و دارشتنی باش بنوسیت؟ (A) بە خـۆت بـدە. ئەگـەر پێـت وایـە لـە هەریـەکێك لەمانـە کـەموکوڕیت هەیـە، (B) بـە خـۆت بـدە. ئەگـەر تێبینییـەکان ئەوانـەن کـە تـۆ رادەسـتی هاوڕێیەکانتی دەکەیت لەناو پۆل، (C) بە خۆت بدە.

خۆئامادەکردن بۆ وانە

زۆربەی مامۆسـتایان بەشـداریی هـەر خوێنـدکارێك لـە پۆلـدا لەبەرچـاو دەگـرن کاتێـك نمـرە دادەنێن، گرنگ نییە چەند کویز ئەنجام دەدەن یان چەند راپۆرت یان وتار دەنووسن. لەوانەشە تـۆ بـۆت دەرکـەوتبێت کـە مامۆسـتا هـەن نمـرە لـەو خوێندکارانـەش دەشـکێنن کـە لـە هـەر تاقیکردنەوە و کویزێك زۆر باشە دێنن ئەگەر لە ناو پۆلدا ئامادەییان نەبێت.

نمرە: ئەگەر تۆ هەمیشە بۆ وانەکان ئامادە بیت (کـە لانـی کـەم، واتـە خوێندنـەوەی هـەموو ماددەی پێ سپێردراو، ئامـادەکردنی پـڕۆژە و واجبی سپێردراو و رادەسـتکردنەوەیان لـەکاتی خۆیدا)، بەشێوەیەکی چالاك بەشداری بکە لە مشتومڕەکان و پرسیاری ناوبەناو و کاریگـەر بکـە وەکو رێگایەکی دانەوەی ئەوەی کە هەنوکە دەیزانیت و پڕکردنـەوەی کەلێنـەکانی ئـەو زانینـە، (A) بە خۆت بدە. ئەگەر لە هەر یەکێك لەم پێوەرانەدا بێ توانایت، (B) بە خۆت بـدە. ئەگـەر تۆ دڵنیا نیت لەوەی ئاخۆ پۆل لە کوێیە، (C) بە خۆت بدە.

**نوسینی بابەت و ئامادەکردنی راپۆرتی زارەکی**

ئامادەکردنی هەر جۆرە راپۆرتێك، نوسراو یان وتراو، ٩٠٪ خۆماندووکردن (لێکۆڵینەوە) و ١٠٪ ئیلهامە (نوسین). بە دەربڕینێکی تر، توانای نوسینی بابەتێکی باش زیاتر بەندە بە لێهاتوویت لە شارەزایەتییەکانی تر کە هەنوکە باسمان کردوون نەك ئەمەی پەیوەندی هەبێ بە لێهاتوویت لە (نوسین)دا. ئەگەر تۆ خوێنەرێکی تامەزرۆیت، ئاشنایت بە نزیکترین کتێبخانە، گەڕیدەیەکی کۆنی ئینتەرنێتیت، تێبینی نوسەرەوەیەکی باشیت و دەتوانیت ئاڵۆزترین ناونیشان دابەش بکەیت بۆ چەند هەنگاوێکی بەڕێوەبراو کە پێویستن بۆ نوسینی بابەتێك، لەوانەیە ئەدایەکی بێ هاوتا بخەیتەڕوو لەم بوارەدا.

نمرە: ئەگەر تۆ لە شارەزاییەتییەکانی کتێبخانە، نوسینەوەی تێبینی لە کتێبخانە و ئینتەرنێت، بەڕێوەبردنی کات و خوێندنەوە ئەسپی خۆتت تاو داوە، ئەوا ، (A) بە خۆت بدە. ئەگەر هەست دەکەیت لە نوسینی بابەت و راپۆرتدا باشیت بەڵام لە یەکێك لەو بوارانەدا خراپیت، (B) بە خۆت بدە. ئەگەر بیرۆکەت لە بارەی نوسینی بابەتدا تەنیا کۆپیکردن و کۆپیکردنەوەی ئەو پوختەیەیە کە بە دەست نوسیووەتەوە، (C) بە خۆت بدە.

**خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە**

کلیلی خۆئامادەکردنێکی دروست بۆ تاقیکردنەوە زانینی ئەوەیە کە چ ماددەیەك داخڵ دەبێت و تاقیکردنەوەکە چ فۆرمێکی دەبێت. کویزی هەفتانە یان تاقیکردنەوە لە بەش یان یونتەکان زۆرجار تازەترین ماددە دەگرنەخۆ. تاقیکردنەوەکانی نیوەی ساڵ و کۆتایی ساڵ بوارێکی فراوانتر دەگرنەخۆ- زۆرجار تێکڕای ماددەکە تاوەکو هەنوکە. تاقیکردنەوەکانی فرە هەڵبژاردن، وتار (یان شەرح)، لیستەکانی پرسیاری ماتماتیك و تاقیکردنەوەکانی تاقیگە، هەمووی پێویستیان بە خۆئامادەکردنی جیاواز هەیە و پیادەکردنی شارەزایەتیی جیاوازی تاقیکردنەوەیان دەوێ. زانینی جۆری ئەو تاقیکردنەوەیەی رووبەڕووی دەبیتەوە، خۆئامادەکردنەکەت ئاسانتر دەکات.

هەروەها بەهەمان شێوە دروستکردنی لیستێك لەو پرسیارانەی کە پێت وایە مامۆستاکەت بە ئەگەرێکی زۆر دەیانپرسێت. لە رێگەی ناوبەناو چاوخشاندنەوە بە تێکستەکەت و تێبینییەکانی

ناو پۆلت، تۆ دەست دەکەیت بە ناسینەوەی ئەو بوارانەی کە پێدەچێ تیایاندا مامۆستاکەت لە هەمووی زۆرتر بایەخیان پێبدات...و بە ئەگەرێکی زۆر تیایاندا ئیمتیحانت دەکات. وەکو فێڵێکی کۆتایی، لیستێکی ١٠ پرسیار یان زیاتر دروست بکە کە تۆ ئەگەر مامۆستا بوویتایە ئەتپرسین.

نمرە: ئەگەر تۆ دەتوانیت ئەو تاقیکردنەوانە بونیاد بنێیت کە لەوە قورسترن مامۆستاکەت رووبەڕووتی ئەکاتەوە– و نمرەی باشیان تێدا دەهێنیت– (A) بە خۆت بدە. ئەگەر هەست دەکەیت لە بابەتەکە دەزانیت، بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان لە کاتی تاقیکردنەوەدا بەو رادەیە باش نیت کە پێت وایە دەبێ باش بیت، (B) بە خۆت بدە. ئەگەر تۆ لە تاقیکردنەوەی شۆفێری دەرنەچوویت، چ جای ئەوەی لە جەبر، (C) بە خۆت بدە.

### تێکڕای نمرەت

جارێکی تر، پاش ئەوەی لە هەریەک لە بوارەکاندا پلەبەندیی توانای خۆت کردەوە، بۆ هەر (A)یەک دوو خاڵ، بۆ هەر (B)یەک خاڵێك و سفر بە خۆت بدە بۆ هەر (C)یەك. ئەگەر تێکڕای نمرەکەت ١٨ یان زیاترە، نایابە (A) بە خۆت بدە، ١٣ بۆ ١٧، باشە (B بە خۆت بدە)، ١٢ یان کەمتر، ناوەند (C بە خۆت بدە). نمرە تازەکەت بخەرە دێری "تێکڕای ئاستی شارەزایەتیی سەعیکردن" لە "خاڵی دەستپێکردنت".

ئەم هەڵسەنگاندنە چڕوپڕترە چۆن بوو بە بەراورد بەو نمرەیەی بە خۆتتدا پێش خوێندنەوەی پاشماوەی ئەم بەشە؟ ئەگەر ئەوەی دواییەکیان کتومت (دقیق) نەبوو، بەو مانایەیە کە تۆ ئەوەندە ئامادەییت تیا نیە کە دەتویست! ئەگەر هەڵسەنگاندنی سەرەتاییت ئەوەندەی ئەو چڕوپڕەیان پۆزەتیڤ نەبوو کە تازە خوێندتەوە، ئەوا لەوە باشتری کە بیرت لێ دەکردەوە!

### ئێستا چی؟

راستیی ئەمەی کە تۆ راستگۆ بوویت لەگەڵ خۆتدا لە هەڵسەنگاندنی ئەو شارەزایەتییانەی لەگەڵ خۆتیاندا دێنیت بۆ گەمەی سەعیکردن، ئیزافەیەکی گەورەیە لە بەرژەوەندی خۆتدا.

زانینی ئەمەی کە لە کوێ بەهێزیت و لە کوێ پێویستت بە خۆ باشکردن هەیە، هەموو شتێکی تر زۆر ئاسانتر دەکات. ئێستا، بە گوێرەی ئەنجامەکانی پشکنینەکەت، لیستێکی توانا و بەرپرسیارێتییەکان دروست بکە– رووبەرەکانی بەهێزی و لاوازیت. ئەمە هۆشت لەسەر ئەو بوارانە چڕ دەکاتەوە کە زۆرترین ئیشیان دەوێ بۆ خۆباشکردن تیایاندا.

لەکاتێکدا کە من تەواو جەخت لەوە دەکەمەوە تەواوی کتێبەکە بخوێنیتەوە، ئەم پشکنینە سادەیە توانای پێداویت تا ئەو بەشانە بناسیتەوە کە بە راستی پێویستە سەعییان لێبکەیت و ئەو شارەزایەتییە دیاریکراوانەش کە لەوانەیە پێویستیان بە هۆشی بەردەوامی تۆ هەبێ پاش ئەوەی خوێندنەوەی ئەم کتێبە تەواو دەکەیت.

## بەشی دووەم

# چۆن سەعیکردنت ڕێك بخەیت

خووە باشەکانی سەعیکردن دەشێ چ کاریگەرییەکیان هەبێت؟ بڕوام وایە کە شارەزایەتی و بەهرە سروشتییەکان– ئەو توانا بنچینەییانەی کە لەگەڵیاندا لەدایك بوویت– پەیوەندیی هەرە زۆریان بە سەرکەوتنەوە هەیە لە قوتابخانەدا: ٥٠٪، تەنانەت لەوانەیە ٦٠٪یش. لەوانەیە ئەو ژینگەیەی کە تۆ تیایدا هەوڵی فێربوون دەدەیت، تەندروستیت و فاکتەری تری لەو جۆرە ١٠٪ و رەنگە ١٥٪ش پێکبێنن. ئەوەی کە ماوەتەوە شارەزایەتییەکانی سەعیکردنە کە ٢٥٪ بۆ ٤٠٪ پێکدێنن.

بڕوات وانییە کە فێربوونی چۆنێتیی سەعیکردن دەشێ ئەو کاریگەرییە قورسەی هەبێت؟ یەکەم، (چۆن سەعی بکەیت) بخوێنەرەوە، پراوەی شارەزایەتییەکان و تەماشای ئەنجامەکان بکە. بڕوام وایە کە بۆت دەردەکەوێ من لەسەر حەقم. دووەم، ئەگەر تۆ بڕوات وانییە کە شارەزایەتییەکانی سەعیکردن ئەوەندە گرنگن، پێویستە بڕوات بە شتێکی وەکو "منداڵە زیرەکەکان سەرکەوتوون چونکە زیرەکن" هەبێت. باشە، ژمارەیەکی زۆری منداڵە زیرەکەکان سەرکەوتوو نین. بە هیچ شێوەیەك. ئەوانیتر لە قوتابخانەدا سەرکەوتوون، بەڵام لە تاقیکردنەوەدا لاوازن. زۆرێکیشیان لە هەندێ ماددەدا باشن و لەوانەیتردا وەها نین. پێویست ناکات ئەمە بسەلمێنم. سەیری هاوڕێکانت بکە، سەیری ئەوانیتر بکە لە قوتابخانەدا. گەرەنتیت دەدەمێ کە خۆت ئەمە دەسەلمێنیت.

ئاخۆ لێرەدا ئێمە باسی چ جۆرە تەقەلایەك دەکەین؟ سەعاتێکی تر لە شەودا؟ دوو سەعات بۆ هەر شەوێك؟ زیاتر؟ ئەی ئەو دروشمەی کە دەڵێت "زیرەکانەتر سەعی بکە نەك سەرسەختانەتر" کە پەیوەندی هەیە بە پرۆگرامەکەی من بۆ "چۆن سەعی بکەیت". لەوانەیە

تۆ قەناعەتت وابێ "ئەگەر کاتێکی درێژتر سەعی بکەم"، "ئەوا دڵنیام سەرسەختانەتر سەعی دەکەم، لانی کە بەپێی ئەم پێناسەیە".

با یەکەم جار ئەو خاڵەی دوایی وەربگرین. تۆ دەتوانیت زیرەکانەتر سەعی بکەیت. دەتوانیت کاتێکی کەمتر تەرخان بکەیت و ئەنجامی باشتر بەدەست بێنیت. بەڵام فێربوونی چۆنێتی کردنی ئەمە قورسە، چونکە هەر جۆرە فێربوونێك پێویستی بە دیسپلینە. فێربوونی خۆدیسپلینکردنیش، بەلای زۆرێك لە ئێمەوە، قورسترین ئەرکە. بۆیە خۆت مەخەڵەتێنە: نەچی دانیشیت، چاوێك بخشێنیت بە (چۆن سەعی بکەیت)دا و بەشێوەیەکی موعجیزەئاسا خۆت لە خوێندکارێکی (C)ەوە بکەیتە خوێندکارێکی (A). بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانیت ئەو ئەنجامانە بەدەست بێنیت ئەگەر کات تەرخان بکەیت بۆ فێربوونی ئەو وانانەی ئەم کتێبە دەیانگرێتەخۆ و، لەوەش گرنگتر، هەر رۆژە پراوەیان بکەیت و بەکاریان بێنیت.

ئەگەر تۆ هەنوکە لەوەی کە پەیوەندی بە قوتابخانەوە هەیە شتێکی کەم یان هیچت لەباردا نییە، ئەوا دەبێ کات و تەقەلایەکی زیاتر بخەیتەکار. چەند زیاتر؟، یان تەنانەت بەشێوەیەکی گشتیتر، دەبێ چەندە زیاتر سەعی بکەیت؟ تا ئەو کاتەی کە ئەو ئەنجامانە بەدەست دێنیت کە دەتەوێ بەدەستیان بێنیت. چەندە زیرەکتر بیت و چەندەی ئاسانتر تەکنیکەکانی (چۆن سەعی بکەیت) فێر ببیت و پەیرەوییان بکەیت، ئەوا ئەوەندەش ئەگەری زیاترە کاتی کەمتر لە پێشوو بە واجبی ماڵەوە بەسەر ببەیت. بەڵام چەندەی زیاتر پێویست بکات لە (D)یەکانەوە بچیت بۆ (A)یەکان نەك (B)یەکان بۆ (A)یەکان–ئەوەندەش زیاتر پێویستت بەوە دەبێ فێر ببیت و ئەوەندەش زیاتر پێویستت بەوە دەبێ خۆت تەرخان بکەیت بۆ فێربوونی.

سارد مەبەرەوە. تۆ بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن خێرا، ئەنجامە پۆزەتیڤەکان بەدی دەکەیت.

### سەعیکردن بکە بە خوو

ئەگەر تۆ لە قوتابخانە سەرکەوتوو نیت ئەگەرچی برێکی مەعقولی کاتی بۆ تەرخان دەکەیت، ئەوا خووی سەعیکردنی لاوازت هەن. کێ چوزانێ لە کوێ و کەی لێت پەیدا بوون، بەڵام شکشت، تا رادەیەك، بووەتە خوویەك.

هەواڵی خۆش! نەك تەنیا دەکرێ خووە خراپەکان بشکێنرێن، بەڵکو دەشێ بە شێوەیەکی تا رادەیەك ئاسان بە خووە باشەکان شوێنگۆڕکێ بکرێن. ئەمەش پلانی شەڕەکەت:

-ئاسانتره كه شوێنگۆڕكێ به خوویەك بكەیت نەك ئەمەی بە تەواوی لەناوی بەریت. بۆیە هەوڵ مەدە خووە لاوازەكانی سەعیكردن نەهێڵیت- تەنیا خووە باشەكان فێر ببە بۆئەوەی شوێنی ئەوان بگرنەوە.

-پراوە بكە، پراوە بكە و پراوە بكە. پراوە، ئەو رۆنی مۆتۆڕەیە كە مەكینەی هەر خوویەك چەور دەكات. چەندەی زیاتر شتێك بكەیت، ئەوەندە قووڵتر رەگ دادەكوتێت.

-بڕیارەكەت بۆ باشكردنی شارەزایەتییەكانی سەعیكردن و سەركەوتووتربوون لە قوتابخانە، بە هاوڕێكان وماڵەوەتان بڵێ. (ئەمە فێڵێكە كە بۆ "هەندێ" لە خەڵك كاریگەرە، واتە ئەوانەی كە پێیان وایە فشارە زیادكراوەكە پاڵنەرێكی باشە.

-لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ ئەوانیتر، ستراتیژییەكی وەها فشاری "یەكجار زۆر" دروست دەكات و ئەگەری زۆرترە كە پەرچەكرداری پێچەوانەی هەبێت، ببێتەهۆی شكست. ئامۆژگاری من ئەوەیە لە بارێكدا ستراتیژییەكی وەها بەكاربێنیت كە بزانیت یارمەتیت دەدات، بەڵام خۆی لێ بەدووربگریت ئەگەر بزانیت لەراستیدا زیانت پێدەگەیەنێت.

-پێویست ناكات بەبێ هەبوونی زانین، لە (D)یەكانەوە بگەیتە (A)یەكان. بۆ دڵنیابوون لەوەی "كە جوڵەیەكی پاڵنراو"ت دەبێ لە هەر دەسكەوتێكدا، بڕیار بدە كە هەر ئینچێكی بەرەوپێشچوونەكەت هەژمار دەكەیت، تەنانەت ئەگەرچی وەكو رۆبەرت فرۆست، "چەندەها كیلۆمەتر برۆیت پێش ئەوەی بخەویت". لەوانەیە تۆ بتەوێ خشتەیەك لەسەر دیوارەكەت هەڵواسی كە "سەركەوتنەكانی ئەمرۆ"ی لە هەر رۆژێكدا تیادا ریزبەندی بكەیت. ئەو هەنگاوە بچوكانەشت لەبیر بێت كە هەڵیاندەگریت-تەرخانكردنی پێنج خولەك بۆ واجبی خوێندنەوە، زۆر خێرا دۆزینەوەی ئەو كتێبانە پێویستت پێیانە لە كتێبخانە، هەستكردن بەوەی كە باش تێبینییەكانی ناو محازەرەیەك نوسیووەتەوە، دەست بەرزكردنەوەت بۆ بە راستی وەڵامدانەوەی پرسیارێك مامۆستایەك لە گفتوگۆكانەی ناو پۆلدا و هیتر.

بە دەستپێكردن بە بەشەكەی دواتر، هەر شتێكی ناو ئەم كتێبە تەركیز دەكاتە سەر ستراتیژییە دیاریكراوە بەكەڵكەكان بۆ ئەركە دیاریكراوەكان- نوسینی راپۆرت یان بابەتێكی واجب، نوسینەوەی تێبینییەكان، ئەنجامدانی تاقیكردنەوە، خوێندنەوە و هیتر. كەواتە دەشێ ئەمە باشترین شوێن بێت بۆ قسەكردن لەسەر هەندێ ستراتیژی كە پەیوەندییەكی كەمیان

هەیە بە هەر کام لە ئەرکە دیاریکراوەکان بەڵام هەموو پەیوەندییەکیان هەیە بە سەرەنجامی سەرکەوتنی سەعی.

ئامادەبە بۆئەوەی ببیتە "زیندانی تامەتایی"

فێربوونی چۆن سەعیکردن بە راستی پرۆسەیەکی دوورمەودایە. هەر گەشتەکەت دەست پێکرد، ئەوا سەرت دەسوڕمێت لەو نیشانە، رێڕەوانە، لاڕێ و تابلۆیانەی سەر رێگا کە دێنەپێشت. تەنانەت پاش ئەوەی خۆت وەرچەرخاند بۆ خوێندکارێکی باشتر لەوەی کە قەت چاوەڕوانیت کردووە ببیت، بە شێوەیەکی حەتمی تابلۆیەکی تر دەدۆزیتەوە کە زانیاریی زیاتر دەدات بە دەستەوە، رێڕەوێکی تر کە بەرەو ئاراستەیەکی نوێی دڵخواز دەتبات.

وایدابنێ کە فێربوونی چۆنێتی سەعیکردن (پرۆسەیەکی درێژخایەن)ە و ئامادە بە بۆ دەستکاریکردنی هەر شتێك کە دەکەیت لەکاتێکدا کە شێوازەکانی تر فێر دەبیت.

ئەمە بەشێوەیەکی تایبەت رێك لە سەرەتاوە گرنگە، کاتێك تۆ ستراتیژییە گشتییەکانی سەعیکردنت لەبەرچاو دەگریت. دەبێ بۆ هەر شەوێك چەندێك سەعی بکەیت؟ چۆن لەنێوان ماددەکاندا کات دیاری دەکەیت؟ دەبێ چۆن ناوبڕەکانت رێك بخەیت؟ وەڵامەکانت بۆ ئەم پرسیارانە بەشێوەیەکی بەرچاو دەگۆڕێن بەپێی ئەوەی کە چەندێك باش و سەرکەوتوو بوویت پێش ئەوەی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە، دەبێ چەندێك دوور بڕۆیت، چەندە بایەخ بەوە دەدەیت بگەیتە ئەوێ، چەندە بە چالاکییەکانی ترەوە، بە کاتی رۆژەوە، بە تەندروستیی گشتیت و گەلێك فاکتەری ترەوە قاڵیت.

زنجیرەی سەعیکردنت چۆنە؟ یەکەمجار واجبە قورسەکان؟ ئاسانترینەکان؟ درێژترینەکان؟ کورتترینەکان؟ ئایا ئاسودەیت بە دەستاودەست کردن پێیان، یان پێت باشترە تەرکیز بخەیتەسەر تاکە واجبێك هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی؟

ستراتیژیی سەعیکردنی تۆ چییە؟ لەوانەیە مامۆستای مێژووت لە قوتابخانەی ئامادەیی بیەوێ زنجیرەیەك لە شەڕەکان، بەروارەکان و ناوەکان لەبەر بکەیت. ئوستادی کۆلێژت چاوەڕوانی تێگەیشتنێکی قوڵترت لێدەکات لە شەڕەکان، چۆن پەیوەندییان هەیە بە تێکڕای هەڵگیرسانی شەڕ و چۆن کاریگەرییان هەبووە یان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەوەی کە لە

بەشـەکانی تـری جیهانـدا روویـداوە. جەختکردنـەوەی مامۆسـتاکەت شـێوازی سـەعیکردنت دەگۆڕێت.

ئەمـە تەنانـەت قورسـتریش دەبێت (پێـت وابێـت یـان نـا!) ئەگـەر تـۆ وایـدابنێیت لەوانەیـە ئەرکەکان خۆیان کاریگەرییەکی گەورەیان هەبێت لەسەر جەدوەلەکـەت. کاتێـك مـن دادەنیـشم پلانی بەشێکی کتێبەکە دابنێم، بۆ نموونە، پێویستم بە ماوەیەکی زەمەنیی تا رادەیەك نەپچڕاو هەیە- لانی کەم سەعاتێك، لەوانەشە سێ سەعات. ئەمە یارمەتیم دەدات تێبینییەکان بـەو ڕێـك و پێکییە بنووسم کە دەمەوێ و سەرتاپای بەشەکە لەبەرچاو بگـرم- گواسـتنەوەکانی نووسـین لـە مێـشکمدا، رەچـاوکردنی رووبـەرەکانی کێـشە، زانـینی ئەمـەی کـە لـە کـوێ پێویـستم بـە نموونەیەکی شـرۆڤە هەیـە. ئەگـەر تـەنیا نیـو سـەعاتم هـەبێ پـێش مەوعیـدی کۆبوونەوەیـەك، تەنانەت هەوڵیش نادەم پرۆژەیەکی وەها دەست پێبکەم.

وانە لە هەموو ئەم شتانە چییە؟ شتێکی نموونەیی، وەڵامێك نییە- بە دڵنیاییەوە وەڵامێکـی "راست" بوونی نییـە- بـۆ زۆرێـك لـەو پرسـیارانەی کـە خـستوومنەتەڕوو. ئەمـە پەیامێکـە تـۆ دووبارە و دووبارە لەم لاپەڕانەدا دەیانخوێنیتەوە: بزانە چ شتێك بۆ تۆ بەسوودە و بەردەوامبـە لە کردنی. ئەگەر دواتر کەڵکی نەما یان وا دیاربێ کە سوودی نامێنێ، بیگۆڕە.

هیچ کام لە تەکنیکەکانی سەعیکردن کە لەم کتێبەدا بە درێـژی بـاس کـراون، نەخـشی سـەر بەرد نین. نەك تەنیا دەبـێ سەربەسـت بیـت لـە پـەیڕەوکردنیان و راکێـشان و هێنانەوەیـەکیان بەپێی پێداویستی خۆت، بەڵکو پێویستە وەها بیت.

### کاتێك مامۆستایان حوکم دەکەن

ڕێگـای سـەرەکی بـۆ سـەرکەوتووتر بـوون لـە تاقیکردنـەوەدا بریتییـە لـە خوێندنـەوەی ڕێنماییەکان بـەر لـەوەی دەسـت پێبکـەیت. ئەمـە یارمـەتیت دەدات خـۆت لـەو ئەنجامـە لاوازە لابدەیت (چ جای ئەوەی نائومێدی و شەرمەزاربوون) کە لـەوەوە دێـت هـەوڵ دەدەیـت وەڵامـی هەر شەش پرسیاری تاقیکردنەوەکە بدەیتەوە لە سەعاتێکدا کاتێك تەنیا پێویستە سێ پرسـیار وەڵام بدەیتەوە.

تەنیا کاتی تاقیکردنـەوەکان نییـە کـە تیایـدا خوێندنـەوەی ڕێنماییـەکان گرنگـە. زۆرێـك لـە مامۆستاکان یاسـا و ڕێـسای تایبـەت بـە خۆیـان هەیـە لـەبارەی رادەسـتکردنەوەی واجبـەکانی

ماڵەوە، ئامادەکردنی بابەت یان پرۆژە، هێنانەوەی ئەنجامەکانی تاقیگە و هیتر. پەیڕەویکردن لە ڕێنماییەکانیان "زۆر" گرنگە- وەکو چۆن پەیڕەوینەکردنیش کارەساتبارە.

بە راستی من لە پۆلی ١٠ مامۆستایەکم هەبوو- کاتێک هیچمان دەستمان بە کۆمپیوتەر نەدەگەیشت و کەمێکمان فێری تایپ کردن ببووین- خوێندکارێکی خست لەبەرئەوەی ئەو بابەتەی پێی سپێردرابوو بە دەست نوسیبووی. ئەوەی کە ئەو کاتە بێ تاقەتی کردم ئەوە بوو کە بابەتەکە بە راستی جوان نوسرابوو...و لای ئەو مامۆستایە بایی فلسێك بوو. چەندەی گوێڕایەڵ و پەیڕەوکار بیت لە قوتابخانەدا، ئەوەندەش کەمتر ئەگەری هەیە لەلایەن مامۆستاکانەوە سەرکۆنە بکرێیت.

شانازی بە ئیشەکەتەوە بکە...و پیشانی بدە

ئایا کەسێك دەناسیت کە جەخت دەکاتەوە لەوەی کە دوایین وشەی ئەو واجبە ٥٠٠ وشەییەی ژماردووە کە پێی سپێردراوە و هەر کە لەو ژمارە جادووییە نزیك کەوتووەتەوە گەیشتووەتە دەرەنجام؟

ئەی ئەو خوێندکارەی کە قەناعەتی وایە ئەو پارچە زبالەیەی نوسیوویەتی بە تەواوی دەخوێنرێتەوە، ئەگەرچی کاتێك مامۆستا دەپرژێتە سەری، کۆمەڵێك هێڵی راست و چەپ بەسەریدا دەهێنێت؟ یان ئەوەیان کە بۆ هەر بابەتێك تەنیا یەك شتی بە دروستی نوسیووە- ناوی خۆی- یان لەوەش خراپتر، دوو سێ جار وشەیەك بە دروستی دەنوسێت و چوار پێنج جاریش بە هەڵە لەوانەیتردا...هەمووشی لە هەمان لاپەڕە؟

مامۆستاکان مرۆڤن. ئەوان لە بەرانبەر نواندندا کاردانەوەیان هەیە. ئەگەر ناوەرۆکی دوو بابەت یان پرۆژە یان تاقیکردنەوە تا رادەیەك یەکسان بێت، لەوانەیە ئەو فۆرمەی کە تیایاندا خراونەتەڕوو، کار بکاتەسەر نمرەکە، لەوانەشە بەشێوەیەکی بەرچاو.

سەرباری ئەمەش، مامۆستای زۆر هەن کە نمرەکان بەهۆی لاوازیی رێزمان، حینجە یان ئەو "فۆرم"ە کە تیایدا خراونەتەڕوو دەشکێنن. هەروەکو چۆن کەسانی تر هەن کە لەوانەیە بەشێوەیەکی ناخودئاگا نمرەیەکی باشتر بدەن بە بابەتێك کە بە روونی دەریدەخات خوێندکار بایەخ بە مەسەلەکە دەدات.

**مامۆستاکانی خۆت بناسە**

مامۆستاکانیش جیاوازن، لە مامەڵەیان لەگەڵ ماددەکاندا، هەروەها چاوەڕوانییەکانیان، ستانداردەکانیان، نەرم و نیانیان و هیتر. بە دڵنیاییەوە هەوڵێکی شایستەیە کە پرۆفایلی هەر یەك لە مامۆستاکانت بزانیت. هەریەکەیان دەیانەوێ چ ببینن لە رووی تێبینی، ئاستی بەشداریکردن، بابەت و راپۆرت، پرۆژەکان؟ بەشێوەیەکی کەسی کەیفیان بەچی دێت و رقیان لە چییە؟ شێوازی نمرەدانان و تاقیکردنەوەیان چۆنە؟

دەبێ زانینی ئەم بنەما جیاوازانە بە دڵنیاییەوە ئاراستەت بکات بەرەو مامەڵەکردن لەگەڵ هەر وانە- و هەر مامۆستایەك- بە شێوەیەکی جیاواز. با بڵێین-بێگومان ئەمە"بە راستی" بەسەر هیچتاندا نایەت- چاڵێکی قووڵت بۆ خۆت هەڵکەندووە. کات ١١ی شەوە، لە کاتی سەرەکیی سەعیکردن تێپەڕیوویت و هێشتا تەواوکردنی واجبی خوێندنەوەت هەیە بۆ ئینگلیزی و مێژوو بۆ سەر لە بەیانی.

مامۆستای ئینگلیزیت داوای ئاستێکی بەرزی بەشداریکردن دەکات لە ناو پۆلدا و دەیکاتە بەشێکی گەورەی نمرەکەت-و نمرەی تاقیکردنەوەش بۆ دۆزەخ. پێدەچێ هیوایەتەکەی بانگ کردنی ئەوانە بێت کە خۆیان ئامادە نەکردووە و مۆرکێکی سەیر و راشکاوانەی هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەو قوتابییانە.

مامۆستای مێژووت لەگەڵ دروستبوونی گفتوگۆدا نییە، پێی باشە محازەرە بڵێتەوە و لە کۆتاییدا یەك دوو پرسیار وەڵام بداتەوە. کەس بۆ هیچ شتێك بانگ ناکات.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بارودۆخە و زانینی ئەمەی کە تۆ دەتوانیت ئەوەندە درەنگ بخەویت کە تەنیا یەك لەو دوو واجبە بخوێنیتەوە، کامیان هەڵدەبژێریت؟ ئایا کاتێك دەبێت تیایدا بە خۆئامادەنەکردوویی بچیتە ئەو وانەیەی ئینگلیزییەوە، مەگەر ئەوەی کە لە هەمان کاتدا زریانێك هەڵبکات، خۆر بگیرێت و پشووی رەسمی بێت؟

لەکاتێکدا کە لە بەشی چوارەم پیشانتان دەدەم چۆن بزانن بەرنامە دانانێکی لاواز نابێتە خوویەك کە رووبەڕووی ئەو رێگایانەتان بکاتەوە، پێم وایە زۆرێك لە ئێوە جیاوازییە سروشتییەکانی نێوان مامۆستاکانتان لەبەرچاو ناگرن کاتێك بەرنامەی واجبیماڵەوە، ئامادەکردنی بابەت یان سەعیکردن بۆ تاقیکردنەوە دادەنێن.

بەهەمان شێوە، پێم وایە کە زۆرێك لە ئێوە هەوڵ دەدەن رایەڵێك لەگەڵ مامۆستایەکی دیاریکراو دروست بکەن– پەیوەندییەکی ئامۆژگاریکەرانە– کە بشێ یارمەتیتان بدات خۆتان لە هەندێ تەگەرە و نشێوی لابدەن و بە گرفتێکی زۆر کەمترەوە بگەنە ئامانجەکەتان. بۆچی دەبێت لە رێگەی خۆت بچیتە دەرەوە بۆ دۆزینەوەی ئامۆژگاریکەرێك؟ لەبەرئەوەی لەوانەیە تۆ پێویستت بە یارمەتیی زیاتر بێت– لە ژیاندا، نەك تەنیا لە قوتابخانەدا– لەوەی کە هاورێکانت یان دایك و باوکت دەتوانن بۆتی دابین بکەن. ئامۆژگاریکەرێك دەتوانێ ئەو بەرچاوروونی، ئامۆژگاری و یارمەتییەت پێ بدات.

**ئەنگێزەی ناوەکی و دەرەکی**

پاڵنەرەکان یان ناوەکین یان دەرەکی. جیاوازییەکە چییە؟ تۆ دەچیتە کلاسێکی دەنگەوە. لەکاتێکدا کە بە دڵنیاییەوە سەعاتەکانی خوێندنت گونجاوە لەگەڵ پێداویستییەکانی تەخەروجکردنت، تۆ لەبەرئەوە دەچیتە ئەو کلاسەوە چونکە حەزت لە گۆرانی وتنە.

هەروەها بەشداری بایۆلۆجی دەکەیت. تۆ رقت لە بیرۆکەی قسەکردنە لەسەر بۆقەکان و باکت نیە بەوەی پەیکەرە ئێسقانی دەرەوە یان ناوەوە، نەرمە ئێسقانی هەیە یان هیچی نیە، بەلام کلاسەکە بەشێکە لە پێداویستییەکانی تەخەروج کردن.

هەر لە سەرەتاوە، تۆ بە فاکتەرە ناوەکییەکان دەکەویتە جۆش– تۆ تەنیا لەبەرئەوە کلاسی دەنگ وەردەگریت چونکە بە راستی خۆشی لێ دەبینیت.

دووەم سیناریۆ نموونەیەکە لە پاڵنەری دەرەکی. لەکاتێکدا کە تۆ بایەخ بە بایۆلۆژی نادەیت، پاداشتی بەشداربوونەکەت دەرەکییە– تۆ دەتوانیت تەخەروج بکەیت.

پاڵنەری دەرەکی دەتوانێ یارمەتیت بدات بەو ئەرکە بێزارکەر و ناخۆشانەدا رەت ببیت کە بەشێکن لە پرۆسەی گەیشتن بە ئامانجەکانت. وێنەیەکی زیندووی دوایین ئامانجت دەشێت هێزێکی پاڵنەری بەهێز بێت. خوێندکارێك وێنای ئەوەی دەکرد کە کارەکەی وەکو پرۆگرام دانەری کۆمپیوتەر چۆن چۆنی دەبێ هەر کاتێك پێویستی بە هەندێ یارمەتی ببوایە بۆ سەرکەوتن لە کلاسدا.

وێنای ژیانت بکە پاش ٥ یان دە ساڵ دواتر. ئەگەر ناشتوانیت، سەیر نییە کاتێك سەخت بەسەر دەبەیت لە بزواندنی خۆت بۆ شیکردن بەرەو ئەو ژیانە پیشەییە وەکو دوایین ئامانج!

ڕۆڵ مۆدێل (کەسایەتی سەرسامکەر)یش لەوانەیە بەهەمان شێوە پاڵنەرێکی کاریگەر بێت. کاتێک پۆلی یەک بوو، (لیندسەی)ی کچم سەرسامی (ویلما رودۆلف) بوو. گەورەبوون بە ڕەشپێستی و هەژاری لایەنێکی لاوەکیی کێشەکانی منالیی ویلما بوو. کاتێک تووشی ئیفلیجی منالان بوو، دکتۆرەکان پێیان وت قەت ناتوانێ جارێکی تر بە ڕێگادا بڕوات، بەلام بوو بە خێراترین ژن لە جیهاندا، چەندەها میدالی ئالتونیی یارییەکانی ئۆلەمپیکی بردەوە. کاتێک ڕووبەڕووی کێشە (بچوکترەکان!)ی خۆی بووەوە، کچەکەم هێشتا ئەوە بیر خۆی دێنێتەوە کە "ئەگەر ویلما بتوانێ سەرکەوتوو بێت، منیش دەتوانم". چ ڕێگایەکی مەزنە بۆ جولاندنی خۆت! بیر لە ڕۆڵ مۆدێلەکانی ژیانت بکەرەوە. ئەگەر نیشتە، دانەیەک بدۆزەرەوە!

### هەرەمی ئامانج

ڕێگایەک بۆ هێنانەبەرچاوی هەموو ئامانجەکانت– و پەیوەندییان بە یەکترییەوە–بریتییە لەوەی کە من پێی دەڵێم هەرەمێکی باش. بزانە چۆن:

١.لە سەری سەرەوەی کاغەزەکە، بنوسە کە ٢،٥، یان ١٠ ساڵ دوای ئێستا دەتەوێ لە کوێ بیت–و دەتەوێ خەریکی کردنی چ شتێك بیت. ئەمە ئامانجی دوورمەوداتە و لەهەموویان گرنگترە.

٢.لەژێر ئامانجە دوورمەوداکەت (یان دوورمەوداکانت)ەوە، ئامانجە ناوەند مەوداکان بنووسە–ئەو بناغە یان هەنگاوانەی کە دەتگەیەننە دوایین مەنزڵت.

٣.لەژێر ئامانجە ناوەند مەوداکاندا، چەندەی ئامانجی کورت مەودا دەتوانیت بنووسە–هەنگاوی بچوکتر کە دەکرێ لە ماوە تا ڕادەیەك کورتەکاندا تەواو بکرێن.

لەکاتێکدا کە لە قوتابخانە بەرەو پێش دەڕۆیت هەرەمی ئامانجەکەت بگۆڕە. دەشێ دواجار بڕیار لەسەر پیشەیەکی جیاواز بدەیت. یان دەشێ ئامانجە ناوەند مەوداکانت بگۆڕێن لەکاتێکدا کە بڕیار لە ڕێڕەوێکی جیاواز دەدەیت بەرەو ئامانجی دوورمەودا. هەڵبەت ئامانجە کورت مەوداکان دەگۆڕێن، تەنانەت بەشێوەیەکی ڕۆژانەش.

پرۆسەی دروستکردنی هەرەمی ئامانجی خۆت ڕێگەت بۆ خۆش دەکات تا ببینیت چۆن ئەو هەنگاوە ڕۆژانە و هەفتانانە کە دەیانگریتە بەر، دەشێ بتگەیەننە ئامانجە ناوەند مەودا و کورت

مەوداکانت و بەم شێوەیەش پاڵت دەنێن تا بە وزە و تامەزرۆیی زیاترەوە ئیش لەسەر ئەرکە هەفتانە و رۆژانەکان بکەیت.

پەیداکردنی شارەزایەتییە باشەکانی سەعیکردن شارێن بەرەو ئامانجەکانت، جا هەرچییەك بن. گرنگ نییە چەندە پێویستە خۆت ماندوو بکەیت یان بە درێژایی رێگاکە چەندە زەحمەتت لەبەردەمدایە، گەشتەکە شایستەیە.

چۆن ئامانج دانان دەکەیتە بەشێکی ژیانت؟ ئەمەی خوارەوە چەند ئاماژەیەکی یارمەتیدەرن:

–واقعی بە کاتێك ئامانج دادەنێیت. زۆر بەرزەفڕ یان نزم فڕ مەبە و بەشێوەیەکی دیاریکراو مەشڵەژێ کاتێك (نەك ئەگەر) پێویستە بە درێژایی رێگاکە دەستکاری و هەموارکردن بکەیت.

–لەبارەی چاوەڕوانییەکانتەوە واقیعی بە. سۆراخی تێگەیشتنێکی فراوانتر بکە لە ماددەیەك کە تامەزرۆییەکی کەمت بۆی هەیە نەك ئەمەی کە نائومێدانە تیایدا بچەقیت ئەگەر شارەزابوونی تەواو تیایدا دەست نادات.

–هەروا بە ئاسانی کۆڵ مەدە. لەوانەیە تۆ لە رادەبەدەر واقیعی بیت– زۆر لەوە ئامادەتر بیت کە دەستبەردار ببیت تەنیا لەبەرئەوەی کە شتێك کەمێك قورسترە لەوەی کە حەز دەکەیت. زۆر بەرز مەفڕە و هەست بە نەگبەتی مەکە کاتێك لە هێڵەکە نزیك نابیتەوە، یان نزم مەفڕە کە قەت بەو پەڕی توانا و لێهاتوویی خۆت نەگەیت– ئەو رێچکەیە بدۆزەرەوە کە گونجاوە بۆت.

–تەرکیز بخەرە سەر ئەو بوارانەی کە باشترین هەل بۆ باشبوون دەرەخسێنن. سەرکەوتنە چاوەڕواننەکراوەکان دەتوانن شتی جادوویی بکەن بۆ بروابەخۆبوونت و لەوانەیە رێگەت بۆ خۆش بکەن تا زۆر لەوە زیاتر بەدەست بێنیت کە پێت وابووە دەتووانی، تەنانەت لە بوارەکانی تریشدا.

–چاودێریی دەستکەوتەکانت بکە و بەردەوامبە لە دانانەوەی ئامانجەکانت. بەشێوەیەکی رۆژانە، هەفتانە، مانگانە، ساڵانە– پرسیار لە خۆت بکە چۆن بوویت و ئێستا دەتەوێ بەرەو کوێ ڕێ بکەیت.

–هەرەمی ئامانجەکەت رێك بە دیوارەوە هەڵواسە. بیبینە. هەستی پێبکە. لەسەری بژی.

### پاداشتەکان وەکو پاڵنەری دەستکرد بەکاربێنە

شێوازی بڕیاردانت بۆ بەکارهێنانی سیستەمی پاداشت بەندە بەوەی کە چەندە یارمەتیت پێویستە بۆ جوڵانت تا سەعی بکەیت. بەو شێوەیەی کە تێبینیمان کردووە، ئەو ئەرکانەی کە لەناو خۆیاندا سەرنجراکێشن پێویستیان بە پاڵنەری دەرەکیی کەم هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەشێ بەشی هەرە زۆری واجبی قوتابخانە لە ڕێگەی بەڵێنی پاداشتی بچوک بچوک هان بدرێت بۆ ئەنجامدانی. ئەگەر ئەرکەکە تایبەت تاقەتبەر یان قورس بێت، پاداشتەکان زووزوو دووبارە بکەرەوە بۆئەوەی وزە و مکوڕییت لەناونەچن.

وەکو ڕێسایەکی گشتی، دەبێ قەبارەی پاداشتەکە لەگەڵ قورسیی ئەرکەکەدا بگونجێت. بۆ سەعاتێك خوێندنەوە، بەڵێنی ١٥ خولەك ناوبڕی خواردنی ئایس کریم بە خۆت بدە. کاتێك تۆ ڕەشنووسی واجبێکی گەورە تەواو دەکەیت، فەرمووی خۆت بکە بۆ تەماشاکردنی فیلمێکی سینەمایی.

### سێ ڕێگای مەزن بۆ بە بەرنامە و پلان بوون بەشێوەیەکی بێ سنوور

لەکاتێکدا کە دەست دەکەیت بەوەی دانانی ئامانج و ڕێکخستن بکەیتە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەت، سێ چەمك هەن کە جیاوازیی گەورە لە سەرکەوتنتدا دروست دەکەن.

### گۆڕانکارییە بچوکەکان ئەنجامی گەورەیان لێ دەکەوێتەوە

دەشێ گۆڕانکارییەکی سادە و بچوك لە ڕەفتارتدا بە ڕواڵەت ئەنجامی بچوکی هەیە، بەڵام سەدان گۆڕانکاریی بچوك ئەنجام بدە و دەشێ کاریگەرییەکان هەژێنەر بن!

ئەم یاسایە بکە بەشێکی ئۆتۆماتیکیی پرۆسەی بیرکردنەوەت و کردارەکانت. ئەمە یارمەتیت دەدات جیاوازیی زۆرجار بچوکی نێوان سەرکەوتن و شکست، بەبەرهەم بوون و ناکامی، خۆشبەختی و ئازار. هەروا سادەیە، ئەمە فریودەرە. کلیلی سەرکەوتنی تۆ چییە؟ لەوانەیە تەنیا کەمێکی تر مەشق بێت. لەوانەیە شێوازێکی کەمێك باشتری پلاندانان بێت. لەوانەیە تەنیا زاڵبوون بێت بەسەر خوویەکی خراپی زۆر بچوك. لەوانەشە هەموو ئەمانە و زیاتریش بێت. لەوانەیە هەر گۆڕانکارییەك بە تەنیا تەقریبەن بێ دەرەنجام بێت، بەڵام کاتێك کۆ دەکرێتەوە، کۆمەڵێك گۆڕانگاریی بچوك دەشێ ئەنجامی باوەڕنەکراویان هەبێ!

### یاسای ٨٠–٢٠ (پرەنسیپی پارێتۆ)

یاسایەکی تر کە تۆ دەتوانیت پیادەی بکەیت بۆ دروستکردنی جیاوازی لەوەدا کە چەندێك باش ئەولەویەتەکانت ڕێك دەخەیت و بەڕێوە دەبەیت، یاسای ٨٠–٢٠ە، کە بە پرەنسیپی پارێتۆش ناسراوە.

ڤیکتۆر پارێتۆ کۆمەڵناس و ئابووریناسێکی ئیتاڵی بوو لە سەرەتای سەدەی بیستدا کە لە ئیتاڵیا لێکۆڵینەوەی لە خاوەندارێتیی زەوی کرد. پارێتۆ بۆی دەرکەوت کە زیاتر لە ٨٠٪ی زەوی لەلایەن کەمتر لە ٢٠٪ی خەڵکییەوە خاوەندارێتی دەکرێت. کاتێك تاووتوێی ئەو شتانەی تری کرد کە خەڵکی خاوەنی بوون (لەوانەش پارە)، بۆی دەرکەوت هەمان پرەنسیپ بۆیان راستە:

٢٠٪ یان کەمتری خەڵکی هەمیشە ٨٠٪ یان زیاتری ئەو شتانەیان هەبوو کە ئەو پێوانەی دەکرد.

سەرسوڕهێنەرترین دەرخستن لەبارەی یاسای ٨٠–٢٠ ئەنجامە راستەوخۆیەکەیەتی: ئەگەر ٢٠٪ی چالاکییەکان ٨٠٪ی ئەنجامەکان بەرهەم بێنن، ئەوا ٨٠٪ەکەی تری چالاکییەکان تەنیا ٢٠٪ بەرهەم دێنن.

بیرت بێت: بۆ پیادەکردنی یاسای ٨٠–٢٠ بۆ بەڕێوەبردنی ئەولەویەتەکانت، ئەوە بیر خۆت بهێنەرەوە کە ٢٠٪ی چالاکییەکانی ناو لیستەکەت ٨٠٪ی ئەنجامەکان دەستەبەر دەکەن. پێویستە پرسیارەکەت بە بەردەوامی ئەوە بێت، "کام چالاکییانە بەشێکن لە ٢٠٪؟"

بەڵام ئەوەندە دەست مەگرە بە ئامارەوە، بەتایبەت ئەو ئامارانەی کە گومڕاکەرن. یەکێك لە هاوکارەکانی پێشووم جارێکیان تێبینی ئەوەی کرد کە ٤٥٪ی ئەو کتێبانەی کە لە ساڵێکدا چاپ کران، زۆربەی قازانجەکانیان هەڵگرتبووەوە، بۆیە ئامۆژگاریی هەمووانی کرد کە ساڵی دواتر تەنیا ٤٥٪ی ئەو کتێبانە چاپ بکەن کە پارەیان پێوەیە. بیری لێبکەوە.

### سوود وەربگرە لە کاتی "نێوانی"

تۆ دەتوانیت لە ڕێگەی ناسینەوەی ئەو پەنجەرە بچوکانەی دەرفەت کە هەموو ڕۆژێك دەکرێنەوە بەرهەمهێنتریش بیت. ئەمانە بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر نایەن، بۆیە ئەگەر تۆ لێیان

بەئاگا نیت، ئەوا تەنانەت هەرگیز تێبینیشیان ناکەیت. پێویستە چی بکەیت لەگەڵ ئەم کاتە "نێوانی"یەدا لەکاتێکدا کە تۆ لە ترافیکدا گیرت خواردووە، لە سرەدا چاوەڕوانیت، یان لە تەنیشت تەلەفۆنەکەوە دانیشتوویت؟ هەر کە ڕوودەدات بیناسەرەوە و لە ڕێگەی کرداری لە پێشدا پلان بۆدانراوەوە دەستبەجێ بیقۆزەرەوە. ئەگەر تۆ پلانێکت نییە، ئەوا ئەم کاتە بەفیڕۆ دەدەیت!

ئەمەی خوارەوە چەند پێشنیارێکن:

–پەیوەندیی تەلەفۆنی ئەنجام بدە.

–شتێك بخوێنەرەوە.

–نامە بنێرە.

–سەوزە و میوە بکڕە (یان لیستی کڕینەکەت ئامادە بکە)

–کورسی و مێزەکەت خاوێن بکەرەوە و شتەکان بگەڕێنەرەوە شوێنی خۆیان

–چاو بە خشتەی ڕۆژانەتدا بخشێنەرەوە و جارێکی تر ئەولەویەت دابنێرەوە، ئەگەر پێویست بوو.

–چاو بە ئیمەیڵەکەتدا بخشێنەرەوە

–تێبینییەکی خێرا یان نامەیەك بۆ ماڵەوەت بنێرە

–هەموو بابەتە واجبەکانت یان هەندێکیان چاو پێدا بخشێنەرەوە

–بیر بکەوە! (لەبارەی واجبی داهاتوو، بابەتێك کە دەینووسیت، یان هەر پرۆژەیەکی تری داهاتوو).

–پشوو بدە!

چەندێك کامڵ (پێرفێکت)یت؟

خوێندکارە نایابەکان مشووری کاری خۆیان دەخۆن و بە بەردەوامی هەوڵی پێویست پیادە دەکەن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان. لەوانەیە کامڵخوازەکان (زۆر) مشوور بخۆن، بەلایانەوە زەحمەت بێ بە شتێکی کەمتر لە کاری "پێرفێکت" قەناعەت بێنن (بەو شێوەیەی

کە خۆیان پێناسەی دەکەین)، بۆ ساتێك گریمانەی ئەوەی دەکەن کە خەونێکی وەها بە راستی بەدی دێت.

بێگومان، ئەوە مومکینە، نمرەیەکی "پێرفێکت"ی ١٠٠ بێنیت لە تاقیکردنەوەیەك یان (A+) لە بابەتێك بێنیت کە مامۆستا لە خوارەوە دەنووسێت نایاب یان "پێرفێکت!". بەڵام لە واقیعدا، کردنی هەر شتێك "بەشێوەیەکی پێرفێکت" ئەرکێکی ئەستەمە.

هەموو ئەمانە چ پەیوەندییان بە تۆوە هەیە؟ هیچ، ئەگەر دوو سەعات بەسەر نەبەیت بە چاککردنی ئەو بابەتە یان پرۆژەیەی کە هەنوکە (A) یان نیو سەعات بە گەڕان بە دوای ئەو وشە "پێرفێکت"ە یان نیو سەعات بە نووسینەوەی تێبینییە مەزنەکان بۆ کردنیان بە "بەشێوەیەکی رەها پێرفێکت". بە دەربڕینێکی تر، لەکاتێکدا کە دەشێت کۆشش بۆ کامڵبوون تایبەتمەندییەکی پیرۆز بێت، دەشێ بە ئاسانی، لەوانەشە بەشێوەیەکی حەتمی، ببێتە ئەنگێزەیەکی کۆنترۆڵنەکراو و نەوەستێنراو کە بەشێوەیەکی شێلگیرانە رێگر دەبێ لە خۆشی بینینیت لە کارەکەت و ژیانت.

ئەگەر تۆ خۆت لە ململانێی ئەم دێوەزمەیەدا دەبینیتەوە، (زوو زوو) یاسای "دەرەنجامە کەمبووەوەکان"بیر خۆت بهێنەرەوە: هەوڵی سەرەتاییت گەورەترین ئەنجامەکان دەخاتەوە، کەچی هەر هەوڵێکی دواتر رادەیەکی کەمتر ئەنجامی هەیە. لێرەشەوە خاڵێك دێتە پێشەوە کە تیایدا تەنانەت هەوڵە هەرە گەورەکان ئەنجامی هەست پێنەکراو دەخەنەوە. ئەمە نەك تەنیا بەسەر کامڵخوازەکاندا پیادە دەبێ، بەڵکو بەسەر ئەوانەش لە نێوەدا دێت کە گاڵتەتان بە هەر بیرۆکەیەکی بەکارهێنانی پوختەیەکی سادە یان ئامادەکردنی راپۆرتێکی "سواو" دێت. پێویست ناکات هەمیشە نوێکار، سەرسوڕهێن و ئەفرێنەر بیت. پێویست ناکات راپۆرتێکی نوێ دابهێنیت. هەندێ جار راپۆرتێکی شەش لاپەڕەیی لەسەر کتێبێك کە (A-) دێنێت باشە و ئەو نوێسازییەی کە (A+) دێنێت کە پڕگرفتترە (و کاتیش دەبات!) لەوەی کە شایستەیەتی.

کاتێك من فریوی ئەوە دەخۆم زۆر زیاد لە پێویست ئەنجام بدەم، تەنیا لەبەرئەوەی کە رێگەچارەیەکی "خۆش" (و کات بەر و بەفیڕۆدەر و ناشایستە و قورس) دەبێت، بیر لە (جۆرج سیمێنۆن)ی نووسەری فەرەنسی دەکەمەوە کە بە نووسینی زنجیرەی رازئامێزی (پشکنەر میگرێت)– و نووسەری باشترین ٥٠٠ کتێبە کە لە تەمەنیدا نوسیوونی. چۆن ئەمەی کرد...و هێشتا کاتی خواردن و خەوی هەبووە؟ ئاسانە– ئەو تەنیا ٢٠٠٠ وشەی فەرهەنگی بەکارهێنا

(لەو ۸۰۰,۰۰۰ وشەیەی کە لەبەردەستیدابوو) بۆیە پێویستی نەدەکرد کردەی نووسینەکەی بپچڕێنیت تا لە قاموسی وشەکان و هاوماناکاندا بگەڕێت. (لەوانەشە زۆر نەیخواردبێت و نەخەوتبێت).

ئەگەر تۆ بەراستی بەلاتەوە باشە دوو سەعاتی تر بە دەستکاریکردنی پرۆژە (A+)ەکەت بەسەر ببەیت یان لەو وێبسایەتەدا بگەڕێیت کە مامۆستاکەت قەت لەبارەیەوە نەیبیستووە لەبری چوون بۆ سینەما، کتێب خوێندنەوە، یان ئەنجامدانی واجبێکی تر، ئەوا میوانی من بە. ئایا تەقەلای زیاتر شایستەیە؟ لەوانەیە لە هەندێ حاڵەتدا وابێت، بەڵام نەك زۆرجار.

## دروستکردنی ژینگەی سەعیکردنی خۆت

لە خوارەوە لیستێکم بۆ ئامادە کردوون بۆئەوەی پلەبەندیی ژینگەی سەعیکردنتان بکەن. نەك تەنیا لەکوێ سەعی دەکەیت دەگرێتەخۆ، بەڵکو چ کاتێك و چۆنیش سەعی دەکەیت دەگرێتەخۆ.

هەر کە زانیت چ شتێك بەکەڵکت دێت، خۆت لەو بارودۆخانە لابدە کە تیایاندا دەزانیت ئەدائت باشترین نییە. ئەگەر وەڵامی پرسیارێك یان زیاتر نازانیت، کات تەرخان بکە بۆ خۆتاقیکردنەوەت.

### ژینگەی نموونەیی سەعیکردنم

چۆن بە باشترین شێوە زانیاری وەردەگرم:

١.بەشێوەی زارەکی ( ) بە بینین ( )

لەناو پۆلدا، دەبێ من:

٢.لە پێشەوە دانیشم ( ) لە پشتەوە دانیشم ( )

لە نزیك دەرگا یان پەنجەرەیەکەوە دانیشم ( )

ئەو شوێنەی کە بە باشترین شێوە سەعی تیا دەکەم:

٤.ماڵەوەیە ( ) کتێبخانەیە ( )

شوێنێکی ترە ——————————

ئەو کاتەی کە بە باشترین شێوە سەعی تیا دەکەم:

٥.هەموو شەوێك، کەمێك لە کۆتایی هەفتەکاندا ( )

بەشێوەیەکی سەرەکی لە کۆتایی هەفتەکاندایە ( )

بە درێژایی حەوت ڕۆژەکەیە ( )

٦. لە بەیانیاندایە ( ) لە ئێوارانداید ( ) دوانیوەڕۆیە ( )

٧.پێش نانی ئێوارەیە ( ) پاش نانی ئێوارەیە ( )

چۆن بە باشترین شێوە سەعی دەکەم:

٨.بەتەنیا ( ) لەگەڵ هاوڕێیەکدا ( ) بەشێوەی گروپ ( )

٩.لەژێر فشاری کاتدا

١٠.بە مۆسیقاوە ( ) لەبەردەم تەلەڤزیۆن ( ) لە ژوورێکی هێمندا ( )

١١.ڕێکخستنی سەعیکردنی سەرانسەری شەوێك پێش ئەوەی دەست پێبکەم ( )

خەریکبوون و تەواوکردنی ماددەیەك لە یەك کاتدا

پێویستم بە ناوبڕە:

١٢.هەر ٣٠ خولەك یان زیاتر جارێك ( ) هەر سەعات جارێك ( )

هەر دوو سەعات جارێك ( ) هەر ---- سەعات جارێك ( )

---

ئێستا هەر بڕگەیەکی ئەو خشتەیەی سەرەوە مایەی تێگەیشتنە بۆت. ئەمەی کە بۆچی هەست دەکەیت پێویستت بە ژینگەیەکی دیاریکراوە، گرنگ نییە. زانینی ئەمەی کە ژینگەیەکت لە یەکێکی تر پێباشترە، گرنگە. ئەمەش چۆنێتی هەوڵدانت بۆ هەڵسەنگاندنی هەر بڕگەیەکی ناو لیستەکە:

١.ئەگەر "گوێگرتن"ت پێباشترە لە "بینین" ئەوا کێشەیەکی کەمت هەیە لە بەدەستهێنانی ئەو زانیارییەی پێویستتە لە محازەرەکان و گفتوگۆکانی ناو پۆلەوە. لە ڕاستیدا تۆ لە سەعیکردن لە کتێبەکانی مەنهەجت پێتباشترە. (لەوانەیە پێویست بکات تەرکیز بخەیتەسەر شارەزایەتییەکانی خوێندنەوەت و بەسەربردنی کاتی زۆرتر بە کتێبەکانی مەنهەجت بۆ

قەرەبووکردنەوەی ئەو ئارەزوومەندییە. لەوانەیە بە فۆسفۆر رەنگ کردنی تێکستەکانت یارمەتیدەر بێت).

ئەگەر تۆ زیاتر کەسێکی "بینایی"یت، لەوانەیە خوێندنەوەی کتێبی مەنهەجت بەلاوە ئاسانتر بێت و لەوانەیە پێویست بکات کۆشش بکەیت بۆ چاککردنی تەرکیزی ناو پۆلت. لەوانەیە نوسینەوەی رێك و پێکی تێبینییەکانی ناو پۆل کە بتوانیت دواتر سوودیان لێوەربگریت، گرنگ بێت بۆت. هەروەها تۆ دەبێ شێوازەکانی نوسینەوەی تێبینییەکانت لەگەڵ ئارەزوومەندیی بیناییت بگونجێنیت: لەبری ئەوەی کە وەکو هەر کەسێکی تر تێبینی بنووسیتەوە، وێنە بکێشە، خشتە بەکاربێنە و فێربە چۆن محازەرە یان وانەیەك بکەیت بە نەخشە.

دەبێ ئەمە لەگەڵ وەڵامت بۆ ژمارە (١) بێتەوە. چەندەی تۆ پەیوەست بیت بە "بیستن"ەوە، ئەوەندەش زیاتر دەبێت تەرکیز بکەیتە سەر گوێگرتن. چەندەی زۆر پەیوەست بیت بە "بینایی"یەوە، ئەوەندەش تێبینییەکانت لە چاوخشاندنەوەکانی دواتردا باشتر بن.

٣.لەوانەیە ئەمە لەبەر چەند هۆکارێك جیاوازی دروست بکات. لەوانەیە تۆ بەلاتەوە سەخت بێت کە لە پشتەوەی ناو پۆل ببیستیت یان ببینیت. لەوانەیە تۆ شەرمن بیت و بتەوێ لە پێشەوە دانیشیت بۆ جوڵاندنی خۆت بۆ بەشداریکردن لە گفتوگۆکانی ناو پۆلدا. لەوانەیە تۆ دانیشتنت لەنزیك پەنجەرە کەمێك ترست لە شوێنی بەرتەسك برەوێنێتەوە، لەبەرانبەردا، لەوانەیە ئەگەر لە پەنجەرەوە نزیك بیت زۆر خەیاڵت بڕوا و دەبێ ئەوەندەی بکرێ بچیتە "ناوەوە"ی پۆل.

٤.هەر شوێنێك کە بەلاتەوە لە هەمووی ئاسانکەرتر بێت بۆ سەعیکردن (بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سنووربەندییانەی بارودۆخی هەنوکەیی ژیانت و جەدوەلەکەت) دەبێ شوێنێك بێت کە زۆربەی کاتی سەعیکردنتی تیادا بەسەر دەبەیت.

٥.لەوانەیە بڕیاردان لەسەر رێکخستنی کاتت بۆئەوەی بە کاریگەرترین شێوە ماددەکە بگریتەوە، تا رادەیەك پەیوەست بێت بە ئەو بڕە واجبەیماڵەوە کە لەسەرتە و/یان کاتی ساڵەکە. لەوانەیە تۆ لە بەشی زۆری ساڵی خوێندندا جەدوەلێکت هەبێت بەلام پێویست بکات لەکاتی تاقیکردنەوە، کاتی هاتنی نووسینی بابەت یان بۆ پرۆژە تایبەتەکان و هیتر خۆت بگونجێنیت.

٦.بەلای هەندێك لە ئێوەوە، ئەمە جیاوازیپێكردنە تەنیا لە كۆتایی هەفتەكاندا فاكتەرێك بێت، چونكە سەعاتەكانی رۆژت دیاریكراون– تۆ لە قوتابخانەیت.

بەڵام ئەگەر لە كۆلێژ بیت ئەوا دەبێ ئەم فاكتەرە بەكار بێنیت لە دیاریكردنی كاتی خشتە دانان بۆ كلاسەكانت.

بۆنموونە، ئەگەر لە بەیانیاندا بە باشترین شێوە سەعی بكەیت، هەوڵ بدە خشتەی ژمارەی هەرچی زیاتری وانەكان بخەیتە پاش نیوەڕۆ (یان، لە خراپترین حاڵەتدا، درەنگانی بەیانیان).

ئەگەر لە ئێواراندا بەباشترین شێوە سەعی بكەیت، یان خشتەی وانەكانی بەیانیان دابنێ و دوانیوەڕۆیان بە بەتاڵی جێ بێڵە بۆ چالاكییەكانی تر، یان بۆ دوانیوەڕۆ بیانخەرە جەدوەلەوە بۆئەوەی بتوانیت دوایی بخەویت (و كاتی دواتری شەوی پێش وانەكان سەعی بكەیت)

٧.هەندێك لە ئێمە میزاجمان تێك دەچێت ئەگەر هەوڵ بدەین هەر شتێك بكەین كاتێك برسین. ئەگەر تۆ سەعییەكی لاواز بكەیت كاتێ مەعیدەت قۆڕەیەتی، شتێك بخۆ!

٨.زۆربەمان ئۆتۆماتیكیی لە سەعیكردنی تەنیاییدا گەورە دەبین. ئەگەر لەگەڵ هاوڕێیەكدا سەعی بكەین، ئەوا زیاتر قسەكردن، تەماشاكردنی تەلەفزیۆن و هەرشتێكی تر جگە لە سەعیكردن هەیە. بەڵام ئەو كاریگەرییە پۆزەتیڤەی سەعیكردن لەگەڵ یەك دوو هاوڕێ–یان گروپێكی گەورەتری سەعی– بە بێكەڵك تەماشا مەكە كە دەشێ لەسەر لێهاتووبوونت لە واجبی قوتابخانە و نمرەكانت هەبێت. (دوایی درێژتر قسە لەسەر سەعیكردن بە گروپ دەكەم)

٩.تەنیا لەبەرئەوەی لەژێر فشاردا باشتر سەعی دەكەیت، مانای ئەوە نییە كە دەبێ هەمیشە پرۆژەكان، بابەت و راپۆرتەكان و سەعیكردن بۆ تاقیكردنەوە بۆ دوایین خولەك جێ بهێڵیت. ئەمە تەنیا بەو مانایەیە كە تۆ ناترسێیت كاتێك پرۆژەیەكی چاوەڕواننەكراو دەبێتە واجب یان تاقیكردنەوەیەكی لەپڕ رادەیەگەیەنرێت.

ئەگەر لە ژێر فشاردا باش سەعی نەكەیت، بە دڵنیاییەوە مانای ئەوە نییە كە تۆ ناوبەناو پێویست نییە ئەمە بكەیت. چەندەی زیاتر بەپلان و بەرنامە بیت، ئاسانتر دەبێت بۆت كە خۆت لە ترسان لابدەیت كاتێك شتی لەپڕ سەرهەڵدەدات.

١٠.هەروەكو باسمان كرد، هەندێك لە ئێوە (وەكو من) بەلایەوە سەختە تەركیز بكات بەبێ مۆسیقا یان جۆرە دەنگە دەنگێك. ئەوانیتر ناتوانن لەبەردەم تەلەفزیۆن دانیشن و هیچ شتێك بكەن جگەلە هەناسەدان و خواردن.

زۆرێکیشتان دەکەونە ئەو نێوانەوە—دەتوانن بخوێننەوە و تەنانەت بە گوێگرتن لە مۆسیقا تێبینییەکان بنووسنەوە بەڵام پێویستتان بە بێدەنگییەکی رەها هەیە بۆ سەعیکردن بۆ تاقیکردنەوە یان دەرەقەتهاتنی چەمکە قورسەکان. ئەگەر نازانیت چۆن بەباشترین شێوە سەعی دەکەیت، ئێستا کاتی زانینە.

١١.هەڵبژاردنی بژارەی دووەم—دەستپێکردن و تەواوکردنی پرۆژەیەک—بەو مانایە نییە کە تۆ لانی کەم ناتوانیت پلانی سەرانسەری شەوێك سەعیکردن دابنێیت پێش پرژانە سەر هەر ماددەیەك، هەریەکە لە یەك کاتدا. دانانی خشتەیەکی سەعیکردنی وەها باشە. بەڵام لەوانەیە بەو مانایە بێت کە تۆ بە راستی ناتوانیت بچیتە سەر پرۆژەیەکی تر لەکاتێکدا کە یەکەمیان تەواو نەبووە. لەوانەیە خەڵکی تر گرفتیان نەبێ لە ئیشکردن لەسەر پرۆژەیەك و چوونەسەر یەکێکی تر کاتێك گیر دەخۆن یان تەنیا دەیانەوێ پشوویەك بدەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەوەی یەکەمیان.

١٢.بەشێوەیەکی دیاریکراو، وەرگرتنی ناوبڕێك هیچ عەیبێکی تێدا نییە هەرکاتێك هەست بکەیت پێویستت بەوەیە خۆت بە زیتەڵی بهێڵیتەوە و کوالیتی کاتی سەعیکردنت بەرز بکەیتەوە— تا ئەو شوێنەی کە ناوبڕەکان پێنج خولەك جارێك نین و درێژتر نین لە کاتەکانی سەعیکردن! لەگەڵ ئەوەشدا بە گشتی هەوڵ بدە تەرکیزت لە رێگەی پراوەکردنەوە زیاد بکەیت بۆئەوەی بتوانیت لانی کەم سەعاتێك بەردەوام بیت پێش ئەوەی هەستیت، خۆت لێك بکێشیتەوە و شتێك بخۆیتەوە یان شتێکی سەرپێیی بخۆیت. برێکی زۆری پرۆژەکان لانی کەم پێویستیان بەو ماوە درێژە هەیە بۆئەوەی "بچیتە ناویانەوە" یان رێك بخرێن و لەوانەیە تۆ بۆت دەربکەوێت کە ناوبڕی زووزوو پێویستی بە "کاتی چاوپێداخشاندنەوە"ی زۆر هەبێ کاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ سەر مێزی سەعیکردنەکەت.

### گروپەکانی سەعیکردن: هاوڕێیان بۆچین؟

من قەت بانگ نەکراوم بۆئەوەی بچمە پاڵ گروپێکی سەعیکردنەوە لەکاتێکدا کە لە کۆلێژ بووم و خۆشم بیرم لە دروستکردنی گروپێکی وەها نەکردەوە. ئەگەر بیرم لێ بکردایەتەوە، تەنانەت لەکاتێکدا کە لە قوتابخانەی ئامادەیی بووم، ئەوا لەوانەبوو دانەیەك دروست بکەم.

بیرۆکەکە سادەیە: گروپێکی بچوکی خوێندکاری هاوبیر بدۆزەرەوە و تێبینی ئاڵوگۆڕ بکەن، پرسیار لە یەکتری بکەن و بەیەکەوە خۆتان بۆ تاقیکردنەوە ئامادە بکەن. ئاشکرایە، بۆئەوەی کاریگەر بێت، ئەو خوێندکارانەی هەڵیاندەبژێریت دەبێ لە هەموو یان لانی کەم زۆربەی وانەکانتدا هاوبەش بن.

سۆراخی ئەو خوێندکارانە بکە کە لە تۆ زیرەکترن، بەڵام زۆر زیرەکتر نەبن. ئەگەر ئەوان لە ئاستێکی زۆر بەرزتردابن لە تۆ، ئەوا بەزوویی لە ژێر تۆزدا بەجێ دەمێنیت و لە هەر کاتێکی پێشوو زیاتر سارد دەبیتەوە. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ئەو خوێندکارانە هەڵبژێریت کە زۆر لە خوار تۆوەن، لەوانەیە خۆشی ببینیت لەوەی کە "ئەقڵ"ی گروپەکەیت بەڵام مەبەستی گردبوونەوەکەدا ناپێکیت– تەحەدیی ئەقڵەکانی تر کە هانت بدات.

دەشێ گروپەکانی سەعی بە جۆرەها شێواز رێك بخرێن. هەر ئەندامێك دەتوانرێ بەرپرسیارێتیی سەرەکی بۆ هەر تاکە وانەیەك پێ بسپێردرێت، بۆ نموونە ئامادەکردنی تێبینییە چڕوپڕەکان لە محازەرەکان و گروپەکانی گفتوگۆوە. ئەگەر خوێندنەوەی زیادە پێشنیار کرابێت بەڵام داوا نەکرابێت، ئەو کەسە دەتوانێ بەرپرس بێت لە ئەنجامدانی هەموو ئەو خوێندنەوەیە و ئامادەکردنی پوختە چڕوپڕەکان.

لە بەرانبەردا، هەرکەسێك دەتوانێت بەرپرس بێت لە تێبینییەکانی خۆی، بەڵام گروپەکە دەتوانێ وەکو گروپێکی مشتومڕی بەپەلە (یان زەرووری) رەفتار بکات، تێگەیشتن لە خاڵە سەرەکییەکان بپاڵێوێت، پێکەوە کار لەسەر پرسیارەکان بکات، پرسیار ئاراستەی یەکتری بکات، بۆ تاقیکردنەوەکان پراوە بکات و هیتر.

تەنانەت ئەگەر تۆ یەك یان دوو خوێندکاری ئارەزوومەند بدۆزیتەوە بۆئەوەی ئیشت لەگەڵ بکەن، هاریکارییەکی وەها بەنرخ دەبێ، بەتایبەت لە خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە گەورەکاندا.

رێنمایی بۆ دروستکردنی گروپی سەعیکردنی خۆت

–من لانی کەم پێشنیاری چوار خوێندکار دەکەم، لەوانەشە لانی زۆر شەش. دەبێ تۆ دڵنیا بیتەوە لەوەی کە هەریەکە هەلی ئەوەی دەبێ چەندەی بیەوێ بەشداری دەکات لەکاتێکدا ژیری و زانینی بەکۆمەڵی گروپەکە زیاد دەکات.

—لەکاتێکدا کە پێویست ناکات ئەندامانی گروپەکان باشترین هاوڕێ بن، نابێ بەشێوەیەکی ئاشکراش دژی یەکتری بوەستنەوە. سۆراخی گیروگرفتی ئەزموون بکە و داوای دڵسۆزیی هاوبەش بکە.

—هەوڵ بدە ئەو خوێندکارانە هەڵبژێریت کە لانی کەم ئەوەندەی تۆ زیرەك، خۆتەرخانکردوو و جددین. ئەمە هانت دەدات تا دوانەکەویت و کەمێکیش ڕووبەڕووی تەحەدی بوەستیتەوە. خۆت لە گروپێك لادە کە تیایدا تۆ "ئەستێرە"یت— لانی کەم تا ئەو کاتەی کە لە ماوەی یەکەم تاقیکردنەوەدا شەوقت نامێنێت.

—خۆت لادە لە بانگکردنی ئەو ئەندامانەی کە بەشێوەیەکی سروشتی لە گروپەکەدا ناگونجێن— پێڕی دەنکەکان، کە تیایاندا لەوانەیە یەکێکیان بەهۆی ئامادەبوونی عاشقانەی ئەویترەوە پەکی بکەوێ، ئەو بارودۆخانەی کە تیایاندا خوێندکارێك ئیش بۆ خوێنکارێکی تر دەکات، ئەو بارودۆخانەی کە تیایاندا پۆلەکانی سەرەوە، پۆلەکانی خوارەوەی خوێندن پەراوێز بخەن—تێدەگەن دەڵێم چی.

—زوو بڕیار بدە لەوەی ئاخۆ تۆ گروپێکی سەعی پێکدێنیت یان گروپێکی کۆمەڵایەتی. ئەگەر ئەوەی دووەمیانە، وا دەریمەخە کە ئەوەی یەکەمیانە. ئەگەر ئەوەی یەکەمیانە، هاوڕێکانت بانگ مەکە بۆ دانیشتن بە شێوەیەکی نارەسمی و قسەکردن لەسەر مامۆستاکانتان هەر هەفتەی سەعاتێك.

—پێشنیاری من ئەوەیە هەر وانەیەك بسپێریت بە خوێندکارێك. پێویستە هەر خوێندکارێك لە وانە پێسپێردراوەکەی خۆی شارەزا بێت، هەر خوێندنەوەیەکی پێسپێردراوی زیادە تەواو بکات، تێبینیی گرنگ بنوسێتەوە، سەرەباسەکانی کۆرسەکە بنوسێتەوە (ئەگەر گروپەکە حەز بکات)، ئامادە بێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان و کویزی راهێنانی جۆراوجۆر، تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ و کۆتایی بەپێی پێویست ئامادە بکات.

گومانی تیا نییە کە دەبێ هەموو خوێندکارانی تر هەر ئامادە بن لە پۆلدا، تێبینییەکانی خۆیان بنووسنەوە و خوێندنەوە و واجبی پێسپێردراوی ماڵەوەی خۆیان ئەنجام بدەن. بەڵام ئەو خوێندکارەی کە وانەیەکی دیاریکراوی پێ سپێردراوە دەبێ هەوڵ بدات کە بە راستی ببێتە "مامۆستای جێگرەوە"ی ئەو وانەیە لە گروپی سەعیکردنەکەدا.

کەواتە ئەگەر نۆ وانەتان هەیە، گروپێکی سەعیکردنی پێنج کەسی، نموونەییە.

-کاتەکانی کۆبوونەوە و واجبەکان بکە بە رەسمی و گرنگی پێدراو. یاسای توندی هەڵسوکەوتکردن لەبەرچاو بگرە. وا باشترە کە خوێندکارە ناجددییەکان هەر زوو وێڵ بکەیت. تۆ کەسێکت ناوێ کە دەیەوێ ئەوەندەی بکرێ ئیشی کەم بکات بۆئەوەی ئیشی پڕهەوڵ و بێ وچانی تۆ بقۆزێتەوە.

-دەستنیشانکردنی کەسێك لەبەرچاو بگرە وەکو بەرپرسی پابەندکردنی هەر کەسە بە خشتەکەوە و رەواندنەوەی ناکۆکییەکان پێش ئەوەی گروپی سەعییەکە پەرتەوازە بکەن.

-هەرچۆنێك پلان دابنێیت، بە روونی بڕیار بدە-زوو- لەسەر واجب و پێداویستییە کتومتەکانی هەر خوێندکارێك. جارێکی تر، تۆ هەرگیز ناتەوێ ئەو هەستە دروست ببێت کە یەکێك یان دووان لە ئێوە هەوڵ دەدەن "سواری کۆڵی"ی ئەوانیتر بن.

دەبێ لە کوێ سەعی بکەیت؟

-لە کتێبخانە. دەشێ چەندەها رێگەچارە هەبن لەبەردەمتدا، هەر لە ژووری گەورەی خوێندنەوەوە تا ژوورە تایبەتە، هێمنترە، هەندێ جار گۆشەگیرەترەکان و تا ژوورە بچکۆلانەکەی سەعیکردنی خۆت. من "ماڵ دوور لە ماڵ"ی دڵخوازم لە (پرینستن) ژوورێکی بچوك بوو کە لە رواڵەتدا چوار پێنج کەسێکمان لەبارەیانەوە دەزانی-کە کورسی ئاسودەبەخش، رۆشناییەکی کزر، فۆتۆگراف و هەڵبژاردەیەکی ٥٠٠ میوزیکی کلاسیکی لێبوو. بۆ کەسێك کە پێویستی بە میوزیك بوو بۆ سەعیکردن، ئەمە فیت بوو!

-لە ماڵەوە. بیرت بێت ئەمە شوێنێکە کە تیایدا ئەگەری زیاترە هۆش پەرتکەرەکان بێنەئاراوە. کەس نایەوێ لە کتێبخانەدا تەلەفۆنت بۆ بکات و برا بچوکەکان (یان مناڵەکانی خۆت) لەناو بەستە کتێبەکاندا بە ئاسانی ناتدۆزنەوە. لەکاتێکدا کە ماڵەوە بەزۆری گونجاوترین شوێنە کە بیکەیتە بارەگای سەعیکردنت، لەوانەیە کاریگەرترین نەبێت.

-لە ماڵی هاوڕێ، دراوسێ یان خزمێکت. لەوانەیە بۆ زۆرێك لە ئێوە، ئەمە رێگەچارەیەك نەبێت، تەنانەت لەسەر بنەمای ناوبەناویش، بەڵام لەوانەیە تۆ بتەوێ یەك دوو شوێنگەی سەعیکردنی جێگرەوە دابنێیت. سەرباری زۆرێك لە رای شارەزایان کە پێویستە تۆ هەموو شەوێك لەهەمان شوێن سەعی بکەیت (کە من لەگەڵیدا نیم)، هاوڕێیەکم هەبوو کە مردووی هەمەڕەنگییەك بوو بۆئەوەی یارمەتی جوڵاندنی بدات.ئەو چوار شوێنی جیاوازی هەبوو کە

حەزی دەکرد سەعییان تێدا بکات و لە شەوێکەوە بۆ شەوێکی تر نۆرەی پێدەکردن. هەرشتێك کە بۆت دەست دەدات بیکە.

-لەناو پۆلێکی چۆڵدا. بە دڵنیاییەوە یەکێك لە ڕێگەچارەکانە لە زۆرێك لە کۆلێژەکان و لەوانەشە هەندێ لە قوتابخانە ئامادەییە تایبەتەکان و ئەمە بیرۆکەیەکی سەرنجڕاکێشە بەشێوەیەکی سەرەکیش لەبەرئەوەی کە ژمارەیەکی کەم لە خوێندکاران بیریان لێ کردووەتەوە! لەکاتێکدا کە لەوانەیە لە قوتابخانە گشتییەکاندا ڕێگەچارەیەك نەبێت، ئازارت نادات ئەگەر پرسیار بکەیت ئەگەر ناتوانیت مەجالێك دروست بکەیت. لەبەرئەوەی زۆرێك لە تیمە وەرزشییەکان تاوەکو ٦ی دوانیوەڕۆ یان دواتر پڕاوە دەکەن، تەنانەت لەسەر ئاستی قوتابخانەی ئامادەییش، لەوانەیە بەشێك لە قوتابخانەکە کراوە بێت- و بە وەرگرتنی مۆڵەت شیاوی بەکارهێنان بێت-ئەگەرچی بەشەکانی تر بە توندی قوفڵیان لێدرابێت.

-لەسەر کارەکەت. چ ئەوەی خوێندکارێك بیت کە بە شێوەی بەشەکات (پارت تایم) ئیش دەکەیت یان بە شێوەی تەواوکات (فوڵ تایم) ئیش دەکەیت و بەشێوەی بەشەکات دەچیتە قوتابخانە، لەوانەیە باش بتوانیت بوار دروست بکەیت بۆ بەکارهێنانی ئۆفیسێکی چۆڵ، تەنانەت لە ماوەی دەوامی ئاسایی ئۆفیسدا، یان لەوانەیە پاش ئەوەی کە هەموان ڕۆیشتوونەتەوە (بەندە بەوەی کە بەڕێوەبەرەکەت چەندێك متمانەی پێتە). ئەگەر تۆ لە ناوەندیت یان لە ئامادەییت و باوکت یان دایکت، هاوڕێیەکەت یان خزمێکت لەو دەوروبەرە ئیش دەکات، لەوانەیە تۆ بتوانیت ڕێك لە پاش تەواوبوونی دەوامی قوتابخانەوە دەست بکەیت بە سەعی تا ئەو کاتەی دەوامی کاری ئەو تەواو دەبێت.

هەرشتێك کە بۆ پانتایی سەعیکردنت هەڵیدەبژێریت، بیکە بە شوێنێك کە تەنیا بۆ سەعیکردنە. هەرچی ناو جێگەی خەوتنە، بەردەم تەلەفزیۆن و ژووری نان خواردنە، ڕێگەچارەی خراپن.

هەر کە دادەنیشیت و دەست دەکەیت بە سەعیکردن کاتێك دەچیتە ناو پۆلێکەوە (وایدابنێین کە مامۆستای لێ نییە!)، تێڕوانین و هۆشت ئۆتۆماتیك دەبێت ئەگەر تۆ پانتایی سەعیکردنت تەنیاوتەنیا پەیوەست بکەیتەوە بە واجبی ماڵەوە، نەك خەوتن، خواردن یان سەرگەرم کردنت. ئەمەش ئەو کاتەکەی کە بەسەری دەبەیت پڕاوپڕتر و کاریگەرتر دەکات.

دەبێ کەی سەعی بکەیت؟

ئەوەندەی دەکرێ، کاتێکی رۆتینی رۆژ دروست بکە بۆ سەعیکردنت. هەندێ لە شارەزایان بڕوایان وایە کە ئەنجامدانی هەمان شت لە هەمان کات و هەموو رۆژێك، کاریگەرترین رێگایە بۆ رێکخستنی هەر ئەرکێکی بەردەوام. هەندێ خوێندکار بەلایانەوە ئاسانترە لەماوەی رۆژدا، هەر رۆژێك، بڕی دیاریکراوی کات بەلاوەنێن کە تیایاندا پلان بۆ سەعی کردن دادەنێن.

گرنگ نییە کێیت، ئەو کاتەی رۆژ کە سەعی تیا دەکەیت بەم فاکتەرانەی خوارەوە دیاری دەکرێت:

–سەعی بکە کاتێك لە باشترین حاڵەتی خۆتدایت. ماوەی لوتکەی جموجۆڵت کەیە–ئەو کاتەی رۆژ کە باشترین کارت ئەنجام دەدەی؟ ئەم ماوەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت– لەوانەیە تۆ ئاگات لە دنیا نەبێت تاوەکو نیوەڕۆ بەڵام بتوانیت تاوەکو شەو بەباشی سەعی بکەیت، یان لە کازیوەی بەیاندا بێدار و چالاك بیت بەڵام خەیاڵ رۆیشتوو و ماندوو بیت ئەگەر هەوڵ بدەیت وزەی نیوەشەو بسوتێنیت. تەنیا بیرت بێت، تەرکیز یەکسانە بە کەفائەت.

–خووەکانی خەوت لەبەرچاو بگرە. خوو کاریگەرییەکی زۆر بەهێزە. ئەگەر هەمیشە زەنگی وریاکردنەوەکە بیخەیتە سەر ٧ی بەیانی، ئەوا لەوانەیە بەزوویی رێك پێش ئەوەی زەنگەکە بوەستێت بێدار بیتەوە. ئەگەر تۆ لەسەر ئەوە راهاتوویت دەوروبەری ١١ی شەو بخەویت، ئەوا بە دڵنیاییەوە تەواو بێتاقەت دەبیت ئەگەر هەوڵ بدەیت تاوەکو ٢ی بەیانی سەعی بکەیت و لەوانەشە لەماوەی ئەو سێ سەعاتە زیادەیەدا سەعییەکی کەم بکەیت.

ئەو کاتە سەعی بکە کە دەتوانیت. هەرچەندە تۆ دەتەوێ ئەو کاتەی کە لە رووی ئەقڵییەوە چالاکترینیت، دانیشیت سەعی بکەیت، فاکتەرە دەرەکییەکانیش بەهەمان شێوە رۆڵیان هەیە لە بڕیاردان لەوەی کە کەی سەعی بکەیت. لە باشترین حاڵەتبووتندا، ئامانجێکی گەورەیە، بەڵام هەمیشە ئاسان نییە. هەرکاتێك بارودۆخ رێگەیدا سەعی بکە.

–ئاڵۆزیی واجبەکە لەبەرچاو بگرە کاتێك کات تەرخان دەکەیت. لەوانەیە ئەرکەکان خۆیان کاریگەرییەکی گەورەیان هەبێت لەسەر خشتەکەت. خشتەیەکی یەك سەعاتی دامەنێ بۆ واجبێکی خوێندنەوەی ٨٠ لاپەڕەیی کاتێك دەزانیت بۆ هەر خولەکێك نیولاپەڕە دەخوێنیتەوە...لەرۆژێکی باشدا.

–"کاتە ناسەرەکییەکان" بەکاربێنە بۆ ئاسانترین ئەرکەکان. کاتێك وزە و جۆش و خرۆشت لەوپەڕی نزمیدایە، ئایا بە راستی پرژانەسەر ئەو پرۆژەیەی پێت دراوە، دەگونجێ؟ یان تەنیا هەندێ تێبینی بنووسیتەوە، سەیرێکی رۆژژمێرەکەت بکەیت یان هەڵەکانی ئەو بابەتەی نوسیووتە راست بکەیتەوە؟ کاتێك تۆ تەواو بێ هێزیت و کەمترین جۆش و خرۆشت هەیە، بۆچی تەنانەت خەریکی پڕتەحەدیترین واجبەکانت دەبیت؟ وەکو زۆرێك لەو پیاوە خاوەنکارانە مەبە کە دەیانناسم کە بە ئاراستەی پێچەوانە بەرنامەی کاتەکەیان دادەنێن: لە بەیانیدا، کاتێك پەلەی رۆیشتن دەکەن، رۆژنامە دەخوێننەوە، سەیری ئیمەیلەکەیان دەکەن و چاو بە بلاوکراوەکانی بزنسدا دەخشێنن. دواجار، کاتێك ئەوان دەتوانن بە زەحمەت ببینن، دەست دەکەن بە وتاردان بۆ کۆبوونەوەی بۆردی بەڕێوەبەران...کۆبوونەوەی بەیانیی بۆردی بەڕێوەبەران.

–راستەوخۆ پاش وانە سەعی بکە، ئەگەر ئەمە ئاسان نییە، راستەوخۆ پێش وانە. ئەمە بۆ خوێندکارانی خریج و کۆلێژ باوترینە کە لەوانەیە کاتێکی بەتاڵی گرنگیان هەبێت لەنێوان وانەکاندا. سەیر نییە کە یادەوەریت لە وانەیەك راستەوخۆ پاش خوێندنی، بەهێزترینە، بۆیە تەرخانکردنی سەعاتێکی کراوە پاش وانە بۆ چاوخشاندنەوە بە تێبینییەکاندا، بیرکردنەوە لەبارەی محازەرەکە و تەواوکردنی واجبی ئەو رۆژە باشترین رێگەیە بۆ گوزەراندنی سەعاتێك.

ئەگەر ئەمە ناشێت، کەواتە وەرگرتنی کات بۆ سەعیکردن راستەوخۆ پێش وانە، رێگەچارەیەکی دووەمی نایابە، بەتایبەت ئەگەر تۆ بەزۆری پێویستت بەو کاتە بێت بۆ تەواوکردنی واجبەکانت!

## پانتایی سەعیکردنت هەڵسەنگێنە

هەر شوێنگەیەك هەڵبژێریت وەکو بارگەی سەعیکردنت، چۆنێتی رێکخستنی رووبەری سەعیکردنت دەتوانێ کار بکاتەسەر توانات بۆ مانەوەی تەرکیزت و ئەگەر وریا نەبیت، بە جددی رێگر دەبیت لە کوالیتی کاتی سەعیت. لەسەر مێزی سەعیکردنت یان رووبەری سەعیکردنت دانیشە و ژینگەی سەعیکردنی خۆت هەڵسەنگێنە:

–ئایا یەك دوو جێگای تایبەتت هەیە کە تەنیا بۆ سەعیکردن جیا کراونەتەوە؟ یان ئایا لە هەر شوێنێك کە گونجاو دیار بێت یان لەو کاتەدا بەردەست بێت سەعی دەکەیت؟

–ئایا شوێنی سەعیکردنت خۆشە؟ ئایا هاوڕێکەتی پێ ڕازی دەکەیت وەك شوێنێکی باش بۆ سەعیکردن؟ یان تۆقیوویت لێی چونکە شوێنێکی زۆر خەمناکە؟

–ڕۆشنایییەکە چۆنە؟ ئایا زۆر لێڵە یان زۆر درەوشاوەیە؟ ئایا تەواوی پانتاییەکە بە باشی ڕووناکی لەسەرە؟

–ئایا هەموو ئەو کەرەستانەی پێویستتن، لەبەردەستدان؟

– لێرە چیتر دەکەیت؟ دەخۆیت؟ دەخەویت؟ نامە دەنووسیت؟ بۆ خۆشی دەخوێنیتەوە؟ ئەگەر هەوڵ بدەیت لەهەمان شوێن سەعی بکەیت کە گوێ لە مۆسیقا دەگریت یان بە تەلەفۆن دەمەتەقێ دەکەیت، لەوانەیە بۆت دەرکەوێ کە یەکێکیان ئەنجام دەدەیت کاتێك پێت وایە ئەویتریان دەکەیت!

–ئایا پانتایی سەعیکردن هاتوچۆی زۆر لەسەرە؟ چەند جار سەعیت پێدەبڕدرێت لەلایەن ئەو خەڵکانەوە کە تێدەپەڕن؟

–دەتوانی دەرگای ژوورەکە دابخەیت بۆ خۆلادان لە سەرکردنەسەر و ژاوەژاوی دەرەوە؟

–کەی زۆربەی کات لێرە دەگوزەرێنیت؟ چ کاتێك ڕۆژ سەعی دەکەیت؟ ئایا ئەو کاتەیە کە لە باشترین حاڵەتی خۆتدایت؟ یان ئایا بەشێوەیەکی حەتمی سەعی دەکەیت کاتێك بێ تاقەت و کەمتر بەرهەمهێنیت؟

–ئایا فایلەکان، فۆڵدەرەکان و کەرەستەکانی تری سەعیکردنت ڕێکخراون و نزیکن لە شوێنی سەعیت؟ ئایا سیستەمێکی هەڵگرتنی کاریگەرت هەیە بۆیان؟

بۆشایییەکی "ئایندە" فەراهەم بکە لە سیستەمی هەڵگرتنتدا. کاتێك بیرۆکە دەدۆزیتەوە، بەدوای ماددەدا دەگەڕێیت و هیتر (لە گۆڤارەکان، کتێبەکان، ڕۆژنامەکان، وێبسایتەکان، هەرشتێکی تر) کە پێت وایە دەشێ لەکاتێکی ئایندەدا گرنگ بن، تێبینییەکی پەیوەندیدار بۆ خۆت بنووسە و هەڵیگرە. ئەو کاتەی کە ئێستا وەری دەگریت تەنیا لایەکی ئەو کاتە دەبێت لە ئایندەدا هەڵیدەگریت.

### بە تەرکیز مانەوە لەسەر سەعیکردنەکەت

ئەگەر بۆت دەرکەوت خەریکی هێڵکاری و خۆهێنان و بردنیت زیاتر لەوەی کە بخوێنیتەوە و بیربهێنیتەوە، ئەو چارەسەرانەی خوارەوە بگرە بەر:

–ژینگەیەکی ئیشکردن دروست بکە کە تیایدا ئاسودەیت. لەوانەیە قەبارە، ستایلّ و شوێنی مێزەکـەت، کورسـییەکەت و ڕۆشـنایی هـەمووی کاربکەنەسـەر ئـەوەی ئـاخۆ هـۆش لـە ئیـشی بەردەستت پەرت بووە یان نا. کات وەربگرە بۆ دیزاینکردنی ئەو پانتاییەی کە پێرفێکتە بۆت. گومانی تیا نییە کە، هەر شتێك کە دەزانی هۆشت پەرت دەکات– وێنەی کچە هاوڕێکەت، ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن، هەرچییەك، دەبیّ لە پانتایی سەعیکردنەکەت لابرێت.

–گلۆپـەکان هەڵبکـە. دانـان و چـڕی ڕوونـاکی تـاقی بکـەرەوە تـا ئـەو کاتـەی کـە بـۆت دەردەکەویّ چۆن گونجاوە بۆت، هەم لە ڕووی پانتایی سـەعیکردنەوە و هـەم وەکـو ئـامرازێکی بێدار مانەوە و بەتەرکیز بوون.

–هەندیّ سنووربەندی دابنیّ. بـا خێـزان، خزمـان و بەتایبـەت هاوڕێیـان بـزانن سـەعییەکەت چەنیّ گرنگە و ئەمەی کە کاتە دیاریکراوەکان سەعی شیاوی پێشێلکردن نین.

–ئەو ناوبڕانە وەربگرە کە پێویستتن. تەنیا پەیڕەوی لەو ئامۆژگارییە مەکە کە بە مەبەستە بەڵام ڕووکەشە لەبارەی ماوەی درێژ سەعیکردن بەر لە وەرگرتنی ناوبڕ. بیبڕە کاتێك پێویـستت پێیەتی.

–ڕەمزێکـی سـەعیکردن هەڵبـژێرە. شـتێك هەڵبـژێرە کـە دەتوانیـت ڕایـەڵی بکەیتـەوە بـە سەعیکردن، وەکو کڵاو، ملپێچ، تەنانەت یەکێك لەو شتە پوچانەش کە خەڵك لەسەر مێزەکانیان دادەنێن. هەرکاتێك کاتی سەعیکردن هات، تەنیا کڵاوەکەت لەسەر بنیّ، ملپێچەکەت لە گەردنت وەربێنە، یان شتەکە بەشێوەیەکی جێگیر لەسـەر مێزەکـە دابـنیّ. کـاتی سـەعییە ! نـەك تـەنیا ئەمــە "دەخاتــە میزاجــی ســەعیکردن"ەوە، بــەڵکو نیــشانەی زەنگێکــی هۆشــدارییە بــۆ هاوژوورەکان، هاوڕێکان، یان ئەندامانی خێزانت کە تۆ سەرقاڵیت.

"ڕەمزی سەعیکردن"ە نوێکـەت پەیوەسـت مەکـەوە بـە هـیچ شـتێك جگـە لـە سـەعیکردن. کڵاوی سەعیکردنت بۆ یارییەکانی بەیسبۆڵ لەسەر مەکە یان شتە پوچەکە لەسەر مێزەکـە جـیّ مەهێڵە لەکاتێکدا کە لەگەڵ هاوڕێیان لەسەر تەلەفۆنیت. هەرکە ڕەمزی سـەعیکردنەکەت ڕایـەڵ کردەوە بە شتێك جگـە لـە سـەعیکردن، ئـەوا کاریگـەریی خـۆی وەکـو یارمەتیـدەرێکی سـەعی لەدەست دەدات.

### شەڕ لەدژی بێتاقەتی و بێزاری

تۆ باشترین پانتایی سەعیکردنت هەڵبژاردووە و کەس ناتوانێ لەسەر ڕێکخستنەکەی هەڵەت لێبگرێت. ئەی کەواتە بۆچی هێشتا قەڵەمەکەت بەکاردێنیت بۆ هەڵهێنانی پێلوی چاوەکانت؟ بڕوانە خوارەوە بۆئەوەی بزانیت چی دەکەیت ئەگەر وزەت لە پشوویەکی کورتدا بێت:

–سەرخەوێك بشکێنە. چ چەمکێکە! کاتێك زۆر لەوە ماندووتریت کە سەعی بکەیت، سەرخەوێکی کورت بشکێنە بۆ بوژاندنەوەی خۆت. کاریگەریی ئەو سەرخەوە بە کورتکردنی ، زیاد بکە– ٢٠ خولەك نموونەییە، ٤٠ خولەك ئەوپەڕیەتی. پاش ئەو سنوورە، تۆ دەچیتە قۆناغێکی تری خەوەوە و لەوانەیە لەوانەیە تەنانەت بێتاقەتتر لە پێشوو هەڵبستیت.

–شتێك بخۆرەوە. کەمێك کافین ئازارت نادات– کوپێك قاوە یان چا، پەرداخێك خواردنەوەی گازی. تەنیا ئاگادار بە سنوور نەبەزێنیت– پێدەچێ پێکهاتە "هۆشیارکەرەوە"ەکانی کافین پێچەوانە ببنەوە کاتێك دەگەیتە ئاستێکی دیاریکراو، وات لێدەکات زیاتر لە پێشوو بێتاقەت ببیت!

–سیستەمی گەرمکەرەکە بکوژێنەرەوە. پێویست ناکات لە دەرەوە خانوچکەیەکی بەفرین دروست بکەیت، بەڵام ئەگەر ژوورێك زۆر گەرم بێت ئەوا بەشێوەیەکی حەتمی وات لێدەکات خەو بە حەلواوە ببینیت...لەکاتێکدا کە پرۆژەی سەعییەکەت لەسەر مێزەکە دەمێنێتەوە.

–قاچەکانت بخەرە جوڵە. پیاسەیەك بکە، بە دەوری مەتبەخەکەدا، چەند بازێك بدە– تەنانەت خۆ لێککێشانەوەیەکی لەسەرخۆ تەکانێکی دەستبەجێت پێدەداتەوە.

–خشتەی سەعیکردنەکەت بگۆڕە. وایدابنێین تۆ لێرە بژارەیەکت لەبەردەمدایە، ڕێگایەك بدۆزەرەوە بۆ سەعیکردن کاتێك تۆ بەشێوەیەکی ئاسایی بێدارتر و/یان زیاترینت لەبارداییە.

### سەعیکردن لەگەڵ منالی بچوکدا

لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆرتان لەکاتێکدا دەچنە خوێندن کە خێزانێك پەروەردە دەکەن، دەمەوێ هەندێ بیرۆکەتان بدەمێ کە یارمەتیتان دەدات لەگەڵ هەڵمەتی لیوای خەفیفەی ڕەوزەدا خۆتان بگونجێنن.

–پلانی چالاکی دابنێ بۆ سەرقاڵکردنی منالان. چەندەی سەرقاڵتر بیت لە قوتابخانە و/یان لەسەر کار، ئەوەندە منالەکانت زیاتر کاتیان دەوێ کە لەگەڵیاندا بەسەری ببەیت کاتێك لە

ماڵەوەیت. ئەگەر بەرنامەی کاتێك لەگەڵ ئەواندا دابنێیت، ئەوا لەوانەیە بۆیان ئاسانتر بێت بەتەنیا یاری بکەن لە تەواوی پاشماوەی کاتەکەدا، بەتایبەت ئەگەر ئەو پرۆژانەت دروست کردبێت کە بتوانن ئیشی لەسەر بکەن لەکاتێکدا کە تۆ ئیش لەسەر واجبی ماڵەوە دەکەیت.

-منداڵەکانت بکە بە بەشێك لە رۆتینی سەعیکردنت. منداڵ حەزی لە رۆتینە، کەواتە بۆچی نەیانخەیتە ناو ئەوەی خۆتەوە؟ ئەگەر ٤ی پاش نیوەڕۆ بۆ شەشی ئێوارە هەمیشە "کاتی سەعیکردنی دایکە" بێت، ئەوا بەزوویی رادێن لەسەری، بەتایبەت ئەگەر تۆ بەسەربردنی کاتی تر لەگەڵیان بکەیتە ئەولەویەتێك و لەماوەی ئەو کاتەدا شتێکیان پێ بدەیت بیکەن. روونکردنەوەی گرنگیی ئەوەی کە دەیکەیت- بە جۆرێك کە هەندێ سوودی بەرجەستەی بۆ ئەوان تێدابێت-بەهەمان شێوە هانیان دەدات تا بەشێك بن لە "تیمی سەعیکردن"ت.

-تەلەفزیۆن وەکو دایەنێك بەکاربێنە. لەکاتێکدا کە زۆرێك لە ئێوە کێشەتان لەگەڵ ئەمەدا هەیە-ئەمە حاڵەتێکە کە من و کچەکەم بە شێوەی هەفتانە سەروکارمان لەگەڵدا هەبووە، ئەگەر نەڵێم رۆژانە- لەوانەیە ئەمە لە دوو بیرۆکەی خراپن خراپترینیان نەبێ. بە دڵنیاییەوە دەشتووانیت بە ئاگاداربوون لە کاتی بەرنامەکان، لە منداڵەکانت نیگەران نەبیت لەوەی تەماشای شەڕی مافیاکان دەکەن.

-بەو پێیەش پلانی سەعیکردنت دابنێ. هەموو ئەو پێشنیارانە منداڵەکانت دوور ناخاتەوە لە پچڕاندنی ناوبەناوی سەعیکردنت. لەکاتێکدا کە دەتووانی ئەو پچڕاندنانە کەم بکەیتەوە، تەقریبەن مەحاڵە بە تەواوی بنەبڕیان بکەیت. بۆیە هەوڵ مەدە- بەو گریمانەیە پلانێك دابنێت. بەلای یەکێکەوە، ئەمە بەمانای وەرگرتنی ناوبڕی زۆرتر دێت بۆ وەرگرتنی پێنج خولەك لەگەڵ منداڵەکانتدا. ئەگەر ئەوان ناوبەناو سەرنجت بەلاخۆیاندا رابکێشن، ئەوا ئەگەری زیاترە ئەو ١٥ بۆ ٢٠ خولەکەت پێبدەن کە پێویستتە.

-یارمەتی بدۆزەرەوە. دەشێ هاوسەرەکان ناوبەناو منداڵەکانیان بۆ نانی ئێوارە یان سینەما ببەنە دەرەوە. (و متمانەم پێبکە، منداڵەکانت هانت دەدەن زیاتر سەعی بکەیت ئەگەر ئەم کردارە بونیاد بنێیت!). کەس و کار دەتوانێ بەشێوەی نۆرە (لە ماڵەکانیاندا) دایەنی بکەن. دەتوانرێ هاوڕێی یارییان بانگ بکرێن (رێگەت خۆش دەکات رۆژی دواتر منداڵەکەت بنێریتە ماڵەکانیان). لەوانەیە تۆ بتوانیت ئاڵوگۆڕی دایەنی بکەیت لەگەڵ دایك و باوکی تردا لە

قوتابخانە. لەوانەشە ڕۆژێکی چاودێریی پرۆفێشناڵانە لە قوتابخانەی منداڵەکەتدا یان لە ماڵی کەسێك هەبێت بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لە ڕۆژێکدا.

### بزانە لە کوێدا بەهێزیت

ئەوە تاکەکەسێکی دەگمەنەکە کە باڵا بێت، یان تەنانەت باش بێت لە هەموو ماددەکان. ئەگەر تۆ وەهایت، نیعمەتەکانت بژمێرە. زۆربەمان لە ماددەیەك، کەمێك باشترین. هەندێکمان تەنیا زیاتر حەزی لە بابەتێکە بە بەراورد بە بابەتێکی تر–و بیر لەوە ناکەیتەوە کە ئەمە تێڕوانینت بەرانبەری دەگۆڕێت. ئەوانیتر بەشێوەیەکی سروشتی لە بوارێکدا بەهرەمەندن، لەوانیتریشدا مام ناوەندن.

بۆ نموونە، لەوانەیە ژمارەکان و پەیوەندیی قەبارە و مەوداکان زۆر بەلاتەوە ئاسان بن، بەڵام گوێچکەی زمانەکان یان مۆسیقات نەبێ. یان لەوانەیە فێربوونی زمان بۆت زۆر ئاسان بێت، بەڵام فرت بەسەر ئەوەوە نەبێت کە بۆچی فیساگۆرس ئەو قاعیدەیەی گەڵاڵە کردووە– یان بۆچی دەبێ بەلاتەوە گرنگ بێت. هەندێ لە خوێندکاران لە دەستەکانیاندا باشن. لەوانەیە ئەوانیتر (من لەم گروپەم) دروستکردنی سادەترین کەرەستە ئازاربەخش بێت (و ئەنجامەکانیش پێکەنیناوی بن).

هۆکارەکانی ئەم دابەشبوونە نایەکسانەی بەهرە سکماکییەکان دەکەوێتە شوێنێك لەنێوان چارەنووس و خودا، بەپێی فەلسەفەی خۆت.

ئامۆژگاری من ئەوەیە سوپاسگوزار بیت لەبەرانبەر هەر بەهرەیەکی سروشتی کە هەتە و بەهرەکە وەکو شمشێرێکی دووسەرە بەکاربێنیت. کاتی سەعیکردنەکەت لەو ئەرکانەوە کە بە ئاسانی جێبەجێ دەبن ببەرەسەر کە بەلاتەوە قورسترن. ئەو هاوسەنگییەی کە لە گەشەکردنەکەتدا دەیبینیت شایستەی هەوڵەکە دەبێت.

ئەگەر بە ڕاستیش قەت بیرت لەو ماددانە نەکردووەتەوە کە بە ڕاستی ڕقت لێیانە یان کەیفت پێیان دێت ، ئەو خشتەیە بەکاربێنە کە لە کۆتایی ئەم بەشەدایە بۆ ناسینەوەیان. تۆ بەهەمان شێوە پرسیارت لێدەکرێت ئەو ماددانە بناسیتەوە کە تیایاندا لێهاتوویت یان لاوازیت. (دەبێ کارتی نمرەکانت پیشاندەری ئەمە بێت!)ئەم لیستە بەکاربێنە بۆ ڕێکخستنی خشتەی خۆت بۆ

سوودوەرگرتن لە بەهرە سروشتییەکانت و کاتی زیادە بدە بەو ماددانەی کە زۆرترین ماندووبوونیان پێویستە.

### هەڵسەنگاندنی بوارەکان

ئەو ماددانە/کۆرسانە ریزبەندی بکە کە لە هەموویان زیاتر کەیفت پێیان دێت

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

ئەوانە ریزبەندی بکە کە لە هەموویان کەمتر کەیفت پێیان دێت

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

ئەو کۆرسانە ریزبەندی بکە کە تیایاندا باشترین نمرە دێنیت:

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

ئەوانەش کە خراپترین نمرەیان تێدا دەهێنیت:

______________________________________________

______________________________________________

______________________________________________

قوتابخانه. لەوانەشە رۆژێکی چاودێریی پرۆفێشناڵانە لە قوتابخانەی منداڵەکەتدا یان لە ماڵی کەسێك هەبێت بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لە رۆژێکدا.

بزانە لە کوێدا بەهێزیت

ئەوە تاکەکەسێکی دەگمەنەکە کە باڵا بێت، یان تەنانەت باش بێت لە هەموو ماددەکان. ئەگەر تۆ وەهایت، نیعمەتەکانت بژمێرە. زۆربەمان لە ماددەیەك، کەمێك باشترین. هەندێکمان تەنیا زیاتر حەزی لە بابەتێکە بە بەراورد بە بابەتێکی تر- و بیر لەوە ناکەیتەوە کە ئەمە تێڕوانینت بەرانبەری دەگۆڕێت. ئەوانیتر بەشێوەیەکی سروشتی لە بوارێکدا بەهرەمەندن، لەوانیتریشدا مام ناوەندن.

بۆ نموونە، لەوانەیە ژمارەکان و پەیوەندیی قەبارە و مەوداکان زۆر بەلاتەوە ئاسان بن، بەڵام گوێچکەی زمانەکان یان مۆسیقات نەبێ. یان لەوانەیە فێربوونی زمان بۆت زۆر ئاسان بێت، بەڵام فرت بەسەر ئەوەوە نەبێت کە بۆچی فیساگۆرس ئەو قاعیدەیەی گەڵاڵە کردووە- یان بۆچی دەبێ بەلاتەوە گرنگ بێت. هەندێ لە خوێندکاران لە دەستەکانیاندا باشن. لەوانەیە ئەوانیتر (من لەم گروپەم) دروستکردنی سادەترین کەرەستە ئازاربەخش بێت (و ئەنجامەکانیش پێکەنیناوی بن).

هۆکارەکانی ئەم دابەشبوونە نایەکسانەی بەهرە سکماکییەکان دەکەوێتە شوێنێك لەنێوان چارەنووس و خودا، بەپێی فەلسەفەی خۆت.

ئامۆژگاری من ئەوەیە سوپاسگوزار بیت لەبەرانبەر هەر بەهرەیەکی سروشتی کە هەتە و بەهرەکە وەکو شمشێرێکی دووسەرە بەکاربێنیت. کاتی سەعیکردنەکەت لەو ئەرکانەوە کە بە ئاسانی جێبەجێ دەبن ببەرەسەر کە بەلاتەوە قورسترن. ئەو هاوسەنگییەی کە لە گەشەکردنەکەتدا دەیبینیت شایستەی هەوڵەکە دەبێت.

ئەگەر بە راستیش قەت بیرت لەو ماددانە نەکردووەتەوە کە بە راستی رقت لێیانە یان کەیفت پێیان دێت ، ئەو خشتەیە بەکاربێنە کە لە کۆتایی ئەم بەشەدایە بۆ ناسینەوەیان. تۆ بەهەمان شێوە پرسیارت لێدەکرێت ئەو ماددانە بناسیتەوە کە تیایاندا لێهاتوویت یان لاوازیت. (دەبێ کارتی نمرەکانت پیشاندەری ئەمە بێت!)ئەم لیستە بەکاربێنە بۆ رێکخستنی خشتەی خۆت بۆ

سـوودوەرگرتن لـە بـەهرە سروشـتییەکانت و کـاتی زیـادە بـدە بـەو مادانـەی کـە زۆرتـرین ماندووبوونیان پێویستە.

**هەڵسەنگاندنی بوارەکان**

ئەو ماددانە/کۆرسانە ریزبەندی بکە کە لە هەموویان زیاتر کەیفت پێیان دێت

___

___

___

ئەوانە ریزبەندی بکە کە لە هەموویان کەمتر کەیفت پێیان دێت

___

___

___

___

ئەو کۆرسانە ریزبەندی بکە کە تیایاندا باشترین نمرە دێنیت:

___

___

___

ئەوانەش کە خراپترین نمرەیان تێدا دەهێنیت:

___

___

___

# بەشی سێیەم

## چۆن بخوێنیتەوە و بیرت بێتەوە

من بەش بە حاڵی خۆم، هەرشتێکی بەسوود دەخوێنمەوە، تەنیا بۆئەوەی بتوانم شتێك بخوێنمەوە. بەڵام راستی ئەمەی کە هەمیشە حەزم کردووە بخوێنمەوە، رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هەندێ لە واجبەکانی کتێبە ئەکادیمییەکان ئاسانتر نەکردووە. وەکو خوێندکار، تۆش وەکو من، داوات لێدەکرێت چەندەها سەعات بەسەر ببەیت بە واجبە قووڵ و ئاڵۆزەکانی خوێندنەوە بۆ ئەو ماددانەی کە پێویستن، بەڵام خۆش نین.

لەوانەیە تۆ وەکو خۆشییەك، حەزت لە خوێندنەوە بێت بەڵام گرفتت هەبێ لە خوێندنەوەی واجباتی هەندێ لە ماددەکان. لەوانەیە تۆ خوێندنەوەکە تەواو بکەیت، بەڵام هەر کە خوێندتەوە تەقریبەن دەستبەجێ لەبیرت بچێت چیت خوێندووەتەوە. یان لەوانەیە تەنیا رقت لە بیرۆکەی کپ دانیشتن بێت بۆ خوێندنەوەی هەر شتێك. هەرجۆرە خوێندکارێك بیت– و ئاستی شارەزایەتیی خوێندنەوەت هەرچییەك بێت– ئەم بەشە یارمەتیت دەدات بەسەر تەحەدیی خوێندنەوەتدا زاڵ بیت.

ئەمەش، بۆ ئەوانەتان کە لەمێژە لە خوێندن هاتوونەتەدەرەوە، خوێندنەوەی کتێبە قەبەکانی بزنس، وتارەکانی گۆڤارەکانی بازرگانی و شتی تری پەیوەندیدار بە کار دەگرێتەخۆ کە بە دەگمەن قابیلی خوێندنەوەن.

تۆ فێر دەبیت، چی (پێویستە) بخوێنیتەوە–و چی (نابێ) بخوێنیتەوە. تۆ بۆت دەردەکەوێت چۆن ئەو کاتە کەم بکەیتەوە کە بە خوێندنەوە بەسەری دەبەیت، چۆن بیرۆکەی سەرەکی و وردەکاریی گرنگ بناسیتەوە و چۆن بەشێکی زیاتری ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە بیر بێتەوە.

کێ چوزانێت؟ لەوانەیە تەنانەت قەناعەتتان پێ بێنم کە خوێندنەوە، سەرگەرمییە!

**ئامانجی خۆت بۆ خوێندنەوە پێناسە بکە**

ئامانجت لە خوێندنەوە چییە؟ ئەگەر باشترین وەڵامت ئەمە بێت "لەبەرئەوەی مامۆستاکەم وتی دەبێ ئەمە بکەم" ئەوا دەبێت هەندێ هۆکاری باشتر دەربخەین. خوێندنەوەی بەشێك تەنیا بۆئەوەی بڵێیت "واجبەکەمم تەواو کرد" تا رادەیەك پوچە. دەشتووانی کتێبەکەت بخەیتە ژێر سەرینەکەت و هیوادار بیت لە رێگەی پرۆسەی هەڵمژینەوە بچێتە ناو مێشکتەوە.

ئەگەر ئامانجێك بۆ خوێندنەوە نەناسیتەوە، ئەوا خۆت دەبینیتەوە کە خەریکی هەڵدانەوەی پەڕەکانی کتێبەکەتی لەکاتێکدا کە شتێکی کەمتر لە ناونیشانی بەشەکان وەردەگریت.

بە پێی شارەزایانی خوێندنەوە، شەش مەبەستی بنەڕەتی هەن بۆ خوێندنەوە:

١.بۆ وەرگرتنی پەیامێکی دیاریکراو.

٢.بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی دیاریکراو.

٣.بۆ هەڵسەندگاندنی ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە

٤.بۆ پیادەکردنی ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە.

٥.بۆئەوەی سەرت گەرم بکەیت.

**بەکارهێنانی ئاماژەکان لە کتێبەکانتدا**

چەند بەشێکی تایبەت لە نزیکەی هەموو کتێبەکانی مەنهەج و مادده تەکنیکییەکاندا هەن (لە راستیدا، لە نزیکەی هەموو کتێبەکاندا جگە لە رۆمان) کە سامانێك لە زانیاری دەگرنەخۆ دەتوانن یارمەتیت بدەن شتێکی زیاتر لە خوێندنەوەکەت بەدەست بێنیت. ئاشنابوون بەم داتایە ئەزموونی خوێندنەوەت دەوڵەمەند دەکات و زۆرجار ئاسانتری دەکات. بزانە دەبێ سۆراخی چی بکەیت:

یەکەم لاپەڕەی پاش تایتڵەکە بەزۆری پێڕستە- لیستێکی بەش لەدوای بەشی ناوەڕۆکی کتێبەکە. هەندێکیان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن چڕوپڕن، هەر بابەتێك یان خاڵێکی سەرەکی کە لە بەشێکدا هاتووە ریزبەندی دەکەن.

یەکەم دێڕی نووسین (پاش لاپەڕەی تایتڵ، خشتەی ناوەڕۆك و لەوانەشە، لاپەڕەی سوپاس و پێزانین) پێشەکی بێت، کە زۆرجار وەسفێکی ئەو زانیارییە کە لە کتێبەکەدا هاتووە. هەروەها لەوانەیە نووسەران پێشەکی بەکاربێنن بۆ روونکردنەوەی لایەنە ناوازەکانی کتێبەکانیان.

لەوانەیە (ناساندن) لە شوێنی یان لەدوای پێشەکی بێت و لەوانەیە لەلایەن نووسەرەوە یان "ناوێك"ەوە نووسرابێت کە نووسەر پێی وتووە بۆ بەخشینی شکۆمەندییەکی زیاتر بە ئیشەکەی. زۆربەی ناساندنەکان تەنانەت وەسفێکی چڕوپڕتری کتێبەکەن– زۆرجار پوختەی بەش لەدوای بەش خراونەتەڕوو بۆ ئەوەی خوێنەر بەو ماددەیەی کە باس دەکرێت ئاشناتر بکەن.

لەوانەیە پەراوێزەکان بە درێژایی تێکستەکە بەدی بکرێن و یان لە خوارەوەی لاپەڕەکە یان لە بەشێکی تایبەت لە دواوەی تێکستەکە روون بکرێنەوە. لەوانەیە پەراوێزەکان بەکاربهێنرێن بۆ ناوهێنانی سەرچاوەکانی ئیقتیباسە راستەوخۆکان یان/و بیرۆکەگەلێك بۆ روونکردنەوەی خاڵێك، یان بۆ زیادکردنی زانیاریی لە دەرەوەی تێکستەکەدا. لەوانەیە تۆ بیکەیتە خوویەك کە سۆراخی ئەو سەرچاوانە بکەیت کە بەم شێوەیە ناوهێنراون، ئەمەش بۆ خوێندنەوەی زیاتر.

ئەگەر تێکستێك ژمارەیەکی یەکجار زۆر زاراوە بەکاربهێنێت کە لەوانەیە تۆ پێیان ئاشنا نەبیت، نووسەرە بەئاگاکە فەرهەنگۆکێك دەخاتە ناو کتێبەکەوە– قاموسێکی کورت کە هەموو ئەو زاراوانە پێناسە دەکات.

زۆرجار (بیبلیۆگرافی) لە کۆتایی کتێبەکەدا هەیە، لەوانەیە ئەو سەرچاوەیە بێت کە نووسەر بەکاری هێناوە بۆ لێکۆڵینەوەی کتێبی مەنهەجەکە، لیستێك لە "خوێندنەوەی پێشنیارکراو"، یان هەردووکیان بێت. زۆرجار ئەمە بە بابەت بەشێوەیەی ئەلف و بێ ریزبەندی کراوە، کە بۆتی ئاسانتر دەکات تا زانیاریی زیاتر لەسەر بابەتێکی دیاریکراو بدۆزیتەوە.

پاشکۆکانیش داتای زیادە یان نموونەی پەیوەندیدار بە بابەتەکە دەگرنەخۆ کە لە تێکستەکەدا هاتوون. لەوانەیە ئەمانەش لە دواوەی کتێبەکە دەرکەون.

زۆرجار دوایین شت لە کتێبدا (ئیندێکس)ە کە ریزکردنێکی ئەلف بێیە و بە ژمارەی لاپەڕە ناوی دیاریکراو، بابەت و ناونیشان کە لە تێکستەدا هاتوون ئاماژە پێدەدات.

کردنی بە خوویەك کە هەموو ئەو ئامرازانەی ناو کتێبەکانی مەنهەجت بەکاربێنێت، سەعیکردنت ئاسانتر دەکات.

**کتێبی مەنهەجی تر بدۆزەرەوە ئەگەر پێویست بوو**

ژمارەیەکی کەمی کتێبی مەنهەجی لەلایەن ئەوانەوە نووسراون کە ئێمە تەنانەت بە سەری زمانیش پێیان بڵێین نووسەری پرۆفێشناڵ. لەکاتێکدا کە دەشێ نووسەرەکان پرۆفێشناڵ بن، تەنانەت ئەفسانەش بن لە بوارە تایبەتمەندەکانی خۆیاندا، لەوانەیە نووسین بە شێوازی دوور لە زاراوە، بەئاسانی دەرککراو، ئیشی ئەوان نەبێت. ناوبەناو تۆ کتێبێکت پێ دەسپێردرێت کە ئەوەندە وشکە کە دڵنیا نیت ئاخۆ لە پێشەوە بۆ پاشەوە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە یان لە ناوەوەڕا بۆ دەرەوە بیخوێنیتەوە.

ئەگەر تۆ بەشێکی دیاریکراو یان تەواوی کتێبەکەت وەکو داواکردن لە برا ساواکەت بۆئەوەی چاکەیەکت لەگەڵ بکات بەلاوە سەخت بوو بۆ خوێندنەوەن بچۆرە کتێبخانەکە یان کتێبفرۆشێك و کتێبێکی تر بدۆزەرەوە کە قسە لەسەر هەمان مادده بکات و تۆ بتوانیت تێی بگەیت. دەشتووانی تەنانەت پرسیار لە مامۆستاکەت بکەیت بۆ پێشنیارکردن. لەوانەیە ئەو، کاری دۆزینەوەی کتێبێکی سادەت بۆ ئاسانتر بکات. لەوانەشە تۆ تەنانەت هەندێ ئیمتیاز بەدەست بێنیت لەبەرانبەر ئەو دەستپێشخەرییە ئاشکرایە (چونکە تۆ بە دەنگی بەرز هاوار ناکەیت کە چی بووەتەهۆی ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ئەو تێکستە پڕ عەزابە هەڵبژێرێت!).

گوێم لێیە دەڵێیت "ڕۆن، زیرەکانەتر سەعی بکە نەك سەرسەختتر، چی بەسەرهات؟" ئەمە ناشێ گلدەرەوەیەکی کات بێت. من گرەو دەکەم کتێبەکان تەنانەت ناتوانن بابەتەکە بەهەمان شێوازیش باس بکەن، چ جای ئەوەی کە پەیڕەوەی لە هەمان سیستەم بکەن! من بە ڕۆیشتنی کیسەڵیانە بەناو دوو کتێبدا گیر دەخۆم".

لەوانەیە وابێ. بەڵام ئەگەر تۆ تێی نەگەیت، لەوانەیە ئەوە بێت کە نووسەرەکە هەر نازانێت چۆن ڕوونی بکاتەوە. لەوانەیە هەڵەی تۆ نەبێ! ژمارەیەکی زۆری خوێندکاران ئارەقیان کردووەتەوە، ناڵەیان پێکەوتووە، وازیان لە خوێندن هێناوە، تەنانەت وازیان لەو بەشە هێناوە کە هەڵیانبژاردووە چونکە پێیان وابووە گەمژەن، لەکاتێکدا کە بۆی هەیە کتێبە نەفرەتییەکە بێت کە قورسە. بۆیە، لەبری بەردەوامبوون لە ڕۆیشتن بەناو قوڕەکەدا، شارەزایەك بدۆزەرەوە

که به راستی دەتوانیٚ بنووسیٚ و ئەوە فێربە کە پێویستتە. ئەگەر دواجار تێکستەکەی تر یارمەتیت بدات لە ماددەکە تێبگەیت، بۆت دەردەکەوێت کە کتێبە بنچینەییەکە زۆر ئاسانترە بۆ تێگەیشتن...لەوانەشە هەر ئەوەت پێویست بێت.

لە هەر بەشێکدا ئاماژەکان بەکاربێنە

بە خوێندنەوەیەکی خێرای واجبەکە دەست پێبکە، بۆ ئەو پرسیارانە بگەڕێ کە دەتەوێ وەلامیانت دەستکەوێ. ئەو بڕگانەی خوارەوەی واجبی خوێندنەوەکەت لەبەرچاو بگرە پێش ئەوەی دەست بکەیت بە خوێندنەوە:

تایتڵی بەشەکان و سەرە بابەتە تۆخەکان، دەربڕی وردەکارین لەبارەی بابەتە سەرەکییەکەوە. لە هەندیٚ کتێبی مەنهەجیشدا، سەرە پەرەگرافەکان یان سەردێرە تۆخ نوسراوەکان دەربڕی ئەوەن کە نووسەر خەریکە وردەکاریی روونتر دەخاتەڕوو بۆیە هەر واجبێکی خوێندنەوە بە ڕۆیشتن بەناو بەشەکەدا دەست پێبکە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، تەنیا سەرە بابەت و سەرەبابەتە بچوکترە تۆخەکان بخوێنەرەوە.

سۆراخی پوختەکانی کۆتایی بەشەکان بکە. زانینی ئەمەی کە نووسەر لەسەر چ هێڵێك دەڕوات، یارمەتیت دەدات تا بەدوای بلۆکەکانی بناغەی ئەنجامگیرییەکەیدا بگەڕێیت لەکاتێکدا کە خەریکی خوێندنەوەیت.

زۆربەی کتێبەکانی مەنهەج، بەتایبەت ئەوانەی زانستەکان، خشتە، هێڵکاری و خشتەی ژمارەیی، نەخشە و شرۆڤەی تریان تێدایە. دڵنیابە لەوەی کە چاودێری ئەوە بکەیت چۆن تێکستەکە دەوڵەمەند دەکەن و جەخت لە چ خاڵێك دەکەنەوە و تێبینی لەسەر ئەمانە بنووسەرەوە.

لە هەندیٚ لە کتێبە مەنهەجییەکاندا، بۆت دەردەکەویٚ کە زانیاری و زاراوە سەرەکییەکان و لەناو تێکستەکدا تیشکیان خراوەتەسەر. لەوانەیە ئەو کاتە دۆزینەوەی پێناسەی ئەو زاراوانە مەبەستی خوێندنەوەی تۆ بێت.

هەندیٚ لە دەزگاکانی چاپکردنی کتێب، فۆرماتێك بەکاردێنن کە تیایدا خاڵە سەرەکییەکان بە پرسیار جەختیان لێکراوەتەوە، جا چ لەناو یان لە کۆتایی بەشەکەدا. ئەگەر تۆ پێش

خوێندنەوەی بەشەکە، ئەم پرسیارانە بخوێنیتەوە، ئەوا بیرۆکەیەکی باشترت دەبێ لەبارەی ئەوەی کە دەبێ تەرکیزی زیاتر بخەیتە سەر چ شتێك.

ئەگەر واجبی خوێندنەوەکەت بە گەڕان بەدوای ئەو سەرەبابەتانە و بڕگەی تری ئامانج پیشاندەری بەشەکە دەست پێبکەیت، ئەوا هەنگاوی (پێش خوێندنەوە)ت تەواو کردووە. من ئامۆژگاریت دەکەم هەمیشە پێش خوێندنەوە بۆ هەر واجبێك بکەیت.

### سێ شێوازی خوێندنەوە

پەیوەست بەوەی کە تۆ هەوڵ دەدەی لە واجبێکی خوێندنەوەی دیاریکراودا بەدەستی بێنیت و ئەو جۆرە کتێبەی کە خەریکیت، سێ شێوازی خوێندنەوەی جیاواز هەن. زانینی ئەمەی کە هەریەکەیان چ کاتێك بەکاربێنیت، هەر واجبێك ئاسانتر دەکات:

١.خوێندنەوەی خێرای سەرچاوە، تەرکیز دەکاتە سەر سۆراخکردنی زانیاریی دیاریکراو کە موخاتەبەی شتێکی جێ بایەخ یان پرسیارێکی دیاریکراو دەکات کە لەوانەیە خوێنەرێك هەیبێت.

٢.خوێندنەوەی رەخنەگرانە بەکاردێت بۆ ناسینەوەی ئەو ئایدیا و چەمکانەی کە پێویستیان بە راڤەی گشتگیر هەیە.

٣.خوێندنەوەی جوانناسیانە یان بۆ خۆشی، بۆ سەرگەرمی زۆر یان پەیبردن بە توانا و ستایلی نووسەرێکە.

### گرنگیی پێش خوێندنەوە

باشترین رێگا بۆ دەستپێکردنی هەر واجبێکی خوێندنەوە بریتییە لە چاوخشاندنی لاپەڕەکان بۆ بەدەستهێنانی دیدێکی گشتی لەو زانیارییەی هەیە. پاشان تێکستەکە بەشێوەیەکی وریایانەتر بخوێنەرەوە و ماجیکی فۆسفۆری پێدا بێنە و /یان تێبینی لە دەفتەری یادداشتەکەتدا بنووسەرەوە.

لادانێکی کاتی: زۆر کەس دەناسم کە چاوخشاندن و سەیرکردن تێکەڵ دەکەن. با بە روونی پێتان بڵێم. چاوخشاندن بریتییە لە خوێندنەوەیەکی خێرا و رووکەش. سەیرێك کردن بریتییە لە خوێندنەوەی ورد، بەڵام بۆ بڕگەیەکی دیاریکراو. کەواتە کاتێك تۆ چاو دەخشێنیت بە پارچە

نوسراوێکدا، گشتەکەی ئەخوێنیتەوە، هەرچەندە تەنیا "شتە گرنگەکان" دەپێکیت. کاتێك تۆ سەیرێکی پارچە نوسراوێك دەکەیت، تۆ بەچڕوپڕی دەیخوێنیتەوە بەڵام تەنیا تا ئەو کاتەی کە ئەوە دەدۆزیتەوە کە بەدوایدا دەگەڕێیت. سەیرکردن، خێراترین ئاستی خوێندنەوەیە- هەرچەندە بە وردی دەخوێنیتەوە، مەبەستت نییە ئیستیعابی ئەو شتە بکەیت یان بیر بێتەوە کە دەیبینیت تا ئەو کاتەی کە ئەو برە زانیارییە دەدۆزیتەوە کە بۆی دەگەڕێیت.

لەوانەیە تۆ برێکی زۆر خوێندنەوەت پێ سپێردرابێت کە بکرێ بەهۆی چاوخشاندن بۆ فاکتەکان جێبەجێ ببێت. بە بونیادنانی ئەو پرسیارانەی کە دەتەوێ وەڵام بدرێنەوە بەر لەوەی دەست بکەیت بە خوێندنەوە، دەتوانیت بە خێرایی تەماشایەکی ماددەکە بکەیت، تەنیا ئەو زانیارییە دەربێنیت کە پێویستتە.

با بڵێین تۆ کتێبێکی زانست دەخوێنیتەوە بە ئامانجی ناسینەوەی کرداری ناوکی خانە. دەتوانیت بەو بەشەدا گوزەر بکەیت کە پێکهاتەکانی خانە دەردەخات. دەتوانیت چاو بخشێنیت بەوەی خانەکان چی دەکەن. تۆ هەنوکە دەزانیت بە دوای چیدا دەگەڕێیت-و لەو بەشەدایە کە قسە لەسەر کرداری هەر پێکهاتەیەکی خانە دەکات. ئێستا دەتوانیت دەست بکەیت بە خوێندنەوە.

بە ناسینەوەی ئەو پرسیارانەی ویستت لە پێشدا وەڵامیان بدەیتەوە (واتە ئامانجەکەت)، دەتوانیت چاو بخشێنیت بە بەشەکەدا و لە کاتێکی زۆر کەمتردا وەڵامی پرسیارەکانت بدەیتەوە لەوەی کە بەوپەڕی خۆماندووکردنەوە یەك بە یەکی وشەکان بخوێنیتەوە.

چاوخشاندن، یان پێش خوێندنەوە، هەنگاوێکی بەنرخە ئەگەرچی مەبەستت نەبێت فاکتەکان بەشێوەیەکی دیاریکراو بخوێنیتەوە. کاتێك بۆ باسێکی گشتی چاودەخشێنیت، ڕێوشێوینێکی زۆر سادە هەیە لەسەری بڕۆیت:

١.ئەگەر سەرەبابەت یان ناونیشانێك هەبێت، وەکو پرسیار دایڕێژەوە. ئەمە دەبێتە مەبەستی خوێندنەوەت.

٢.هەموو سەرەبابەتە فەرعییەکان، ڕوونکردنەوەکان و هێڵکارییەکان بپشکنە وەك بڵێی ئەمانە یارمەتیت دەدەن بۆ ناسینەوەی مەسەلەی گرنگی ناو تێکستەکە.

٣.پەرەگرافەکانی سەرەتا، پوختە و پرسیارەکانی کۆتایی بەشەکە بە تەواوەتی بخوێنەرەوە.

٤.رستەی یەکەمی هەر پەرەگرافێك بخوێنەرەوە، کە بە گشتی خاڵی سەرەکیی پەرەگرافەکە دەگرێتەخۆی.

٥.ئەو شتەی کە لەم پرۆسەیەدا بەدەستت هێناوە هەڵسەنگێنە: دەتوانیت وەڵامی پرسیارەکانی کۆتایی بەشەکە بدەیتەوە؟ دەتوانیت بەشێوەیەکی زیرەکانە بەشداری بکەیت لە پۆلدا بۆ گفتوگۆ لەسەر ماددەکە؟

٦.پوختەیەکی کورت بنووسە کە ئەوەی لە چاوخشاندنەکە فێری بوویت بەرجەستە دەکات.

٧.لەسەر بنەمای ئەم هەڵسەنگاندنە، بڕیار بدە ئاخۆ خوێندنەوەیەکی تەواوەتیی تر پێویستە یان نا.

وەکو یاسایەکی گشتی، ئەگەر تۆ ماددەی کتێبی مەنهەج وشە بە وشە دەخوێنیتەوە، لەوانەیە خەریکی بەفیڕۆدانی بڕێکی بەرچاوی کاتەکەت بیت. خوێنەرە باشەکان دەتوانن ئەوە جیابکەنەوە کە دەبێ چ بەم شێوازە بخوێننەوە و چ شتێك بە چاوخشاندن دەستەبەر دەکەن. لەکاتی هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی وردەکاری و فاکتەکان، چاوخشاندن بە تێکستێکدا قەدبڕێکی زۆر گرنگ و سادەیە کە دەتوانێ بڕێکی زۆری کاتی خوێندنەوەت بۆ بگەڕێنێتەوە. تەنانەت ئەگەرچی خوێندنەوەی قووڵ پێویستە، بۆت دەردەکەوێت کە بە دەرچوون بەناو ئەم پرۆسەیەدا، جۆرێك لە سیستەمی پەیکەریت بونیادناوە کە خوێندنەوەی دواترت خێراتر، ئاسانتر و پڕماناتر دەکات. ئەگەر هەموو ئەوەشی کە پێویستتە "تەنیا فاکتەکان"ە، هەر هەفتەیەك توانات بۆ سەیرکردنێکی بژاردەیەك، بەشێك یان کتێبێك، چەندەها خولەك ئەگەر نەڵێم سەعاتت بۆ دەگەڕێنێتەوە.

چ ئەوەی کە سەیر بکەیت یان چاو بخشێنیت، تۆ خۆتت بە توانایەك دەوڵەمەند کردووە بۆ باشتر هەرسکردنی هەر شتێك کە نووسەر دەیەوێ بیگەیەنێت.

سۆراخی وشە ئاماژەییەکانیش بکە

لەکاتێکدا کە سەرە بابەتەکان، ناونیشانە فەرعییەکان، یەکەم رستە و نیشانە دابینکراوەکانی تری نووسەر کە قسەمان لەسەر کردن یارمەتیدەرن بۆئەوەی خوێندنەوەیەکی خێرای مەبەستی بەشێك بکەیت، هەندێ لە وشەکانی ناو ئەو بەشە یارمەتیت دەدەن تەرکیز بخەیتەسەر خاڵە گرنگەکان و ئەوەی کە گرنگ نییە فەرامۆشی بکەیت. زانینی ئەمەی کە کەی

خێرا تێپەڕیت، خاو بیتەوە، فەرامۆش بکەیت یان بە راستی تەرکیز بکەیت، یارمەتیت دەدا هەم خێراتر و هەم کاریگەرتر بخوێنیتەوە.

کاتێك وشەی وەکو "بەهەمان شێوە"، "سەرباری ئەمەش"، "وێڕای ئەمە" ، "هەروەها" و هیتر دەبینیت، دەبێ بزانیت کە شتێکی نوێ ناناسێنرێت. ئەگەر تۆ هەنوکە دەزانیت چ باسە، خێرا بکە و ئەوە بە تەواوی بپەڕێنە کە دێت.

هەروەها کاتێك تۆ وشەی وەکو "لەلایەکی ترەوە"، "لەگەڵ ئەوەشدا"، "هەرچۆنێك بێت"، "بەڵکو"، "بەڵام" و هیتری هاوشێوە دەبینیت، خاو بەرەوە—تۆ زانیارییەکت دەست دەکەوێ کە روانگەیەکی نوێت دەداتێ یان هاودژە لەگەڵ ئەوەی تازە خوێندووتەوە.

دواجار، ئاگاداری دەستەواژە "ئاکام"ەکان بە وەکو "بە کورتی"، "سەرەنجام"، "بۆیە"، "لە ئەنجامدا"، "بەمشێوەیە"– بەتایبەت ئەگەر تۆ تەنیا ئەوەندەت کات هەبێت کە "خاڵە سەرەکییەکان"ی بەشێك بخوێنیتەوە یان بۆ تاقیکردنەوەیەك بخوێنیتەوە. بەمشێوەیە لێرەدا پێویست ناکات تەواوی بەشەکە بخوێنیتەوە.

### ئێستا بگەڕێرەوە بۆ چڕوپڕی

ئەگەر خوێندنەوەیەکی چڕوپڕ و تەواوتر پێویست بێت، بچۆرەوە سەرەتا. یەك بەش (چاپتەر، یونت، فەسڵ، یان هەرشتێکی تر) لە یەك کاتدا بخوێنەرەوە.

لەکاتێکدا کە دەخوێنیتەوە، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە چ دەگوزەرێت لەرێگەی پرسیارکردن لە خۆت ئاخۆ پارچەکە بۆ موخاتەبەکردنی یەکێك لەم پرسیارانەی خوارەوە نووسراوە:

١.کێ؟ پەرەگرافەکە تەرکیز دەخاتەسەر کەسێکی دیاریکراو یان گروپێکی خەڵك. ڕستەی سەرەکی پێت دەڵێت ئەو کێیە.

٢.کەی؟پەرەگرافەکە بە شێوەیەکی دیاریکراو پەیوەندی هەیە بە کاتەوە. تەنانەت لەوانەیە رستەی سەرەکی بە وشەی "کەی" دەست پێبکات.

٣.کوێ؟ پەرەگرافەکە لەسەر شوێنێکی دیاریکراو سەنتەر دەگرێت. رستەی سەرەکی پێت دەڵێت کە لەبارەی "کوێ"وە دەخوێنیتەوە.

٤.بۆچی؟ پەرەگرافێك کە بە زۆری هۆکارگەلێك دەردەبڕێت بۆ بڕوایەك یان ڕووداوێك، موخاتەبەی ئەم پرسیارە دەکات. ڕستەی سەرەکی وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە بۆچی شتێ ڕاستە یان بۆچی ڕووداوێك ڕوویداوە.

٥.چۆن؟ پەرەگرافەکە شێوازی ئیشکردنی شتێك یان ئەو ئامرازانە دەناسێنێت کە بەهۆیانەوە شتێك دەکرێ. ڕستەی سەرەکی "چۆنێتی"ی ئەو شتەی کە باسکراوە ڕوون دەکاتەوە.

نەچیتە بەشێك یان لاپەڕەیەکی تر تا ئەو کاتەی کە ئەو ڕاهێنانەی خوارەوە تەواو نەکەیت:

١.پێناسەی هەر زاراوەیەکی سەرەکی بنووسە کە هەست دەکەیت جەوهەرییە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە.

٢.ئەو پرسیار و وەڵامانە بنووسە کە هەست دەکەی بابەتە ڕوون دەکەنەوە.

٣.هەر پرسیارێك بنووسە کە وەڵامت بۆی نییە–ئینجا دڵنیا بەرەوە لەوەی کە لە ڕێگەی خوێندنەوە، لێکۆڵینەوەی زیاتر یان پرسیارکردن لە خوێندکارێکی تر یان مامۆستاکەت، وەڵامەکەی بدۆزەرەوە.

٤.تەنانەت ئەگەر تۆ هێشتا پرسیاری وەڵام نەدراوەت هەن، بچۆرە سەر بەشی دواتر و ژمارە یەك تا ژمارە سێ بۆ ئەو بەشە تەواو بکە. (و بەم شێوەیە، تا ئەو کاتەی کە واجبی خوێندنەوەکەت تەواو دەبێت).

### تەحەدای تێکستە تەکنیکییەکان

ئەی ئەو تەحەدییانەی کە لەلایەن تێکستە تەکنیکییەکانەوە ئاراستە دەکرێن– فیزیا، کیمیا، حسابات– دەزانیت خۆ، ئەو ماددانەی کە سێ لەسەر چواری هەموو خوێندکاران وەکو ئافات لێیانی دوور دەکەونەوە؟ ئەم ماددانە پێویستیان بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕێکخراوی لۆژیکی و شێوازی هەنگاوبەهەنگاوی خوێندنەوە هەیە. هەروەها پێویستیان بە پشکنینی ئامرازە بونیادییەکانی تێکستەکە هەیە.

پەیداکردنی شارەزایەتیی ناسینەوەی زنجیرەی بنچینەیی تێکستەکە توانات پێدەدات تا بەدوای بەرەوپێشچوونی بیرکردنەوە بکەویت، بەرەوپێشچوونێك کە گرنگە بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنت.

بۆچی؟ لە زۆربەی نووسینە تەکنیکییەکاندا، هەر چەمکێك وەکو بلۆکێکی بونیادنانی تێگەیشتنە– ئەگەر تۆ لە چەمکێك یان بەشێکی دیاریکراو تێنەگەیت، ئەوا ناتوانیت لە بەشی دواتریش تێبگەیت.

زۆربەی کتێبە تەکنیکییەکان پڕاوپڕن لە ئایدیا، زاراوە، هاوکێشە و تیۆرەکان. بەشەکان چڕن لە زانیاری، سامانێکی گەورەی ئایدیاکان دەئاخننە بۆشاییەکی بچوکەوە. خوێندنەوەیەکی وریایانە پێویست دەکەن.

بۆئەوەی ئەوەندەی بکرێت شت لەم واجبانەی خوێندنەوەی بەدەست بێنیت، دەتوانیت سوود لە هەندێ لە ئامۆژگارییەکان وەربگریت بۆ تێگەیشتن لە بونیادەکە. ئەمەش پێنج بنچینە بۆ ئاگاداربوون لێیان:

١.پێناسەکان و زاراوەکان

٢.نموونەکان

٣.پۆلێنبەندییەکان و ریزبەندییەکان

٤.بەکارهێنانی جیاوازی

٥.پەیوەندییە هۆ و دەرەنجامەکان

لە خوێندنەوەی هەر تێکستێکی تایبەتکراودا، پێویستە لە سەرەتاوە دەست پێبکەیت– تێگەیشتن لە زاراوەی ئاڵۆز پەیوەندی بەم بوارەوە هەیە. وشە ئاشنا رۆژانەییەکان پێناسەی زۆر دەقیقیان هەیە لە نووسینی تەکنیکیدا. دەشێ وشە رۆژانەییەکان جۆرەها مانایان هەبێت، هەندێکیان تەنانەت هاودژن، پەیوەست بەو کۆنتێکستەی کە تیایدا بەکارهێنراون.

بە پێچەوانەوە، لە زانستەکاندا، زاراوەکان مانای جێگیر و دیاریکراویان هەیە. بۆ نموونە، پێناسەی کشۆکی (توانای مادده بۆ بەدەستهێنانەوەی شکڵەکەی پاش ئەوەی هێزێکی شێوێنەری لەسەر بەکارهێنراوە) لە (لۆس ئەنجلس) و لە (لاس پالماس) هەر یەکە. ئەم کتومتییە زاراوەییە توانا بە زانایان دەدات تا لەگەڵ دەقاودەقی کە بوارەکەیان پێویستی دەکات، لە پەیوەندیدا بن.

لەوانەیە پێناسەکان لە درێژیدا جیاواز بن. لەوانەیە زاراوەیەك پێویستی بە پێناسەیەکی یەك رستەیی هەبێت. ئەویتر تەواوی پەرەگرافەکەی پێویست بێت. تەنانەت لەوانەیە هەندێکیان پێویستیان بە تەواوی بەشەکە بێت بۆ گەیاندنی دەقاودەقی پێناسەکە.

بۆ ئەو وشە گرنگانە بگەڕێ کە کرداری ماتماتیکیی دیاریکراو پیشان دەدەن. پێویستە تۆ کۆ بکەیتەوە کاتێك وشەی وەکو "زیادکرا بە ڕێژەی"، "پێکەوە لەگەڵ"، "کۆ" یان "تێکڕای" دەبینیت، لێدەرکەیت کاتێك وشەی وەکو "کەمبووەوە بە ڕێژەی"، "ناقص"، "کەمتر"، "جیاوازی" دەبینیت، لێکدان بکەیت کاتێك وشەی وەکو "بەرهەم"، "زیادی کرد"، "بە کۆلکەی" و "جارانی" و دابەش بکەیت کاتێك "بۆ هەر"، "ڕێژە"، "ڕێژەی سەدی" دەبینیت.

ئامرازێکی تر پەیوەندیکردن بریتییە لە نموونە. نووسەران نموونە بەکاردێنن بۆ بەیەکەوەبەستنەوەی قاعیدە ئەبستراکتەکان بە ڕوونکردنەوە کۆنکریتییەکانەوە. ئەم نموونانە جەوهەرین بۆ توانات بۆ تێگەیشتن لە تیۆرە ئاڵۆز و درێژبووەوەکان.

بە پێچەوانەی نووسینی تر، نووسینی تەکنیکی، ئەفزەڵیەتێکی گەورە دەدات کورتبڕی. دەستگیرۆیی لە وشەکاندا، کلیلە بۆ ڕووماڵکردنی بڕێکی زۆری مەعریفە لە بۆشاییەکی تا رادەیەك بچوکدا. بابەت یان تێکستی تەکنیکی کەم هەن کە بەسەرهات و حیکایەتی پەیوەندیدار بە نووسەرەکە بگرنەخۆ.

ئەم فاکتە تەحەدای خوێنەرەکە دەکات کە هۆشێکی تایبەت بدات بەو نموونانەی کە هاتوون. بۆچی؟ نووسینی تەکنیکی زۆرجار پڕە لە ئایدیا نوێ یان دەرەکییەکان– کە زۆرێکیان هەروا بە ئاسانی هەرس ناکرێن. ئەمانە بەشێکی لەبەرئەوە قورسن چونکە ئەبستراکت (مجرد)ن. نموونەکان ئیش دەکەن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکانە، لە سۆنگەیەکەوە کە لێتێگەیشتنیان ئاسانترە.

ئامرازی سێیەم کە زۆرجار لە تێکستەکاندا بەکاردەهێنرێت بریتییە لە پۆلێنبەندی و ڕیزبەندی. پۆلێنبەندی بریتییە لە پرۆسەیەك کە بەهۆیەوە ماددە هاوبەشەکان لەژێر ناونیشانێکی گشتیدا پۆلێن دەکرێن. بەتایبەت لە نووسینی تەکنیکیدا، نووسەرەکان پۆلێنبەندی بەکاردەهێنن بۆ خانەخانەکردنی لیستە فراوانەکانی وردەکاری.

ئامرازی چوارەم کە بەکاردێت لە گەیاندنی زانیاریی قورس، بریتییە لە بەراوردکردن و جیاوازیکردن. تێکستەکان ئەم ئامرازە بەکاردێنن بۆ هێنانەبەر تەرکیزی ماددەی ئاڵۆزکاو لە ڕێگەی خستنەڕووی وێنەی هاوشێوە یان ناکۆك. لە ڕێگەی بەراوردکردنەوە، تێکستێك چەمکێك رایەڵ دەکاتەوە بەو چەمکەی کە پێشتر پێناسە کراوە– یان ئەو چەمکەی کە خوێنەر بە ئاسانی تێیگەیشتووە. لە ڕێگەی جیاوازیکردنەوە، تێکستەکە تەرکیز دەخاتەسەر

جیاوازییەکانی نێوان دوو ئایدیا. بە تەرکیز خستنەسەر تایبەتمەندە جیاوازەکان، ئەم ئایدیایانە روونتر دەبنەوە لەکاتێکدا کە ئایدیایەك لەدژی ئەویترياندا دەوەستێنرێتەوە.

دوایین ئامراز کە تێکستەکان پیادەی دەکەن بۆ گەیاندن، بریتییە لە پەیوەندیی هۆکار-دەرەنجام. ئەم ئامرازە لە کۆتێکست (سیاق)ی زانستدا باشتر پێناسەکراوە، کە تیایدا گەڕانی بنچینەیی زۆربەی توێژینەوە زانستییەکانە. زانست بە چاودێریکردنی دەرەنجام دەستپێدەکات- چ روودەدات؟ بەفر دەبارێت. هەنگاوی دواتر ئەنجامدانی توێژینەوەیە لە هۆکارەکە: بۆچی بەفر دەبارێت؟ درێژکردنەوەی ئەم پەیوەندییەی هۆکار-دەرەنجام زۆرجار جەوهەری نووسینی زانستی و تەکنیکییە.

لە خوێندنەوەکەتدا، زۆر گرنگە ئەم پەیوەندییە و گرنگییەکەی بناسیتەوە.

### بە پلانێك بخوێنەرەوە

زیاتر لە هەر جۆرێکی تری نووسین، پێویستە نووسینی تەکنیکیی تایبەتمەند تا ئاستێکی بەرز، بە پلانێك بخوێنرێتەوە. تۆ ناتوانیت تەنیا بە ئامانجی تەواوکردنی، لە واجبی خوێندنەوەکەت نزیك بکەویتەوە. خوێندنەوەیەکی وەها بێ مانا، بە سەرگەردانی و نائومێدی دەتهێڵێتەوە و لە ئۆقیانووسێکی تیۆرەکان، چەمکەکان، زاراوەکان و نموونەکاندا نغرۆت دەکات.

دەبێ پلانەکەت ئەم رێنماییانەی خوارەوە بگرێتەخۆ:

١.ئەو زاراوانە فێربە کە جەوهەرین بۆ تێگەیشتن لەو چەمکانەی خراونەتەڕوو. زانینی ئەو پێناسە دەقاودەقانەی کە نووسەرەکە بەکاریدەهێنێت توانات پێدەدات لە رێگەی تێکستەکەوە دوای زنجیرەی بیرکردنەوەکەی بکەویت.

٢.بونیاد یان رێکخستنی تێکستەکە دیاریبکە. زۆربەی بەشەکان بنەمایەکی دیاریکراویان هەیە کە ئێسکەپەیکەری ماددەکە پێکدەهێنێت. لەوانەیە کتێبێك بە دەستەواژەیەکی تیۆرەیەك دەست پێبکات، نموونە بدات، نموونە (سامپڵ)ی پرسیارەکان بخاتەڕوو، پاشان پوختە بدات بە دەستەوە. زۆرجار دەتوانرێ ئەم بنەمایە لەرێگەی پیشاندانێکی خشتەی پێڕست یان ناونیشان و ناونیشانە فەرعییەکان بناسرێتەوە.

٣.چاو بخشێنە بە بەشەکەدا بۆ بەدەستهێنانی مەفهومێك لە روانگەی نووسەرەکە. پرسیار بکە بۆ پێناسەکردنی مەبەستەکەت لە خوێندنەوەدا. هەر پوختەیەك کە هەیە بەکاربێنە یان چاو بە پرسیارەکان بخشێنە بۆ ئاراستەکردنی خوێندنەوەکەت.

٤.خوێندنەوەیەکی شیکاریی گشتگیر بۆ تێکستەکە ئەنجام بدە. لە بەشێکەوە نەپەڕیتە سەر بەشێکی تر تا ئەو کاتەی کە تێگەیشتنێکی روونت هەیە لەو بەشەی کە دەیخوێنیتەوە- چەمکەکان بە شێوەیەکی گشتی لەسەر یەکتری جێگیر دەبن. چوونەسەر بەشێکی نوێ بەبێ تێگەیشتن لەوانەی کە لە پێشیەوە هاتوون، لە باشترین حاڵەتدا، بێ سوودە.

٥.هەر دەستبەجێ لەگەڵ ئەنجامگیریی خوێندنەوە گشتگیرەکەت، چاوی پێدابخشێنەرەوە! پوختەیەکی ئەو چەمك و تیۆرانە بنووسە کە تۆ پێویستە لەبیرت بن. هەر پرسیارێك وەڵام بدەرەوە کە لات دروستبووە کاتێك چاوت بە تێکستەکەدا خشاند. پرسیارەکان شیکار بکە. ئەگەر دەکرێ، هاوکێشەکان پیادە بکە.

ماددەی تەکنیکی پڕە لە ئایدیاکان. کاتێك دەیخوێنیتەوە، پێویستە قەناعەتت بە فاکتێك هەبێت: هەر تاکە وشەیەك حسابی لەسەرە! دەبێ تۆ ماددەیەکی وەها بەوپەڕی تەرکیزەوە بخوێنیتەوە- بۆ ئەوە نییە بە پرتاو پیایدا رەت بیت.

خوێنەرە باشەکان دەزانن کە ماددەیەکی وەها پێویستی بە خوێندنەوەیەکی هێواش هەیە کە تەرکیز بخاتەسەر بەدەستهێنانی گەورەترین ئاستی تێگەیشتن.

-دەبێت هەر پێناسەیەك هەرس بکرێت.

-پێویستە هەر هاوکێشەیەك ببەسترێتەوە بە یادەوەرییەوە.

-دەبێ هەر نموونەیەك لەبەرچاو بگیردرێت.

بۆ باشکردنی خوێندنەوەت بۆ ماددەیەکی تەکنیکی وەها، دەبێت شارەزایەتیی ناسینەوەی ئەو ئامرازانە پەیدا بکەیت کە نووسەرەکە بەکاری دەهێنێت بۆ گەیاندن. بەمشێوەیە، تۆ دەتوانیت ئەو زنجیرەیەی بیرکردنەوەی رایەڵ بکەیت بە یەکترییەوە کە روودەدات. کاتێك ئەو جۆرە تێکستانە دەخوێنیتەوە-یان هەوڵ دەدەیت پرسیارە تەکنیکییەکان شیکار بکەیت- ئەو "فێڵ"انەی خوارەوە تاقی بکەرەوە:

-هەر کاتێك کە دەتوانیت، ژمارەکان و هاوکێشەکان تەرجەمە بکە بۆ وشەکان. بۆ تاقیکردنەوەی تێگەیشتنت، هەوڵ بدە تەرجەمەکەت بخەیتەناو وشە (جیاوازەکان)ەوە.

-تەنانەت ئەگەرچی تۆ بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەست نەبیت بە بینابیەوە، وێنەکان هەر دەتوانن یارمەتیدەر بن. دەبێت هەوڵ بدەیت پرسیارێکی ماتماتیکی ئاڵۆز بکەیتە هێڵکاری یان دایاگرامێك.

-تەنانەت بەر لەوەی بچیتە سەر شیکارکردنی پرسیارێك، ئایا رێگایەك هەیە بۆت کە مەزەندەی وەڵامەکە بکەیت یان لانی کەم مەزەندەی ئەو مەودایە بکەیت کە دەبێ وەڵامەکەی بکەوێتەناو (گەورەتر لە ١، بەڵام کەمتر لە ١٠)؟ ئەمە رێگایەکی ئاسانە بۆ لانی کەم دڵنیابوون لەوەی کە دەگەیتە پانتاییەکی دروست.

- یاری بکە. زۆرجار رێگای جیاواز هەن بەرەو هەمان شیکار، یان تەنانەت هەمان شیکاری دروست. ئەگەر یەکێکی وەها بدۆزیتەوە، هەوڵ بدە ئەوانەیتریش بدۆزیتەوە. ئەمە رێگایەکی گەورەیە بەرەو زیادکردنی تێگەیشتنت لە هەموو ئەو قاعیدانەی کە ئامادەییان هەیە.

-کاتێك تۆ پشکنینێکی حساباتەکەت دەکەیتەوە، هەوڵ بدە بە ئاراستەیەکی پێچەوانە ئیش بکەیت. من ئەمەم وەکو رێگایەکی ئاسان بۆ دەرکەوت بۆ گرتنی خەلەلە ماتماتیکییە سادەکان.

-هەوڵ بدە بزانیت پرسیار لە چی کراوە، کام قاعیدانە ئامادەییان هەیە، چ زانیارییەك گرنگە و چ زانیارییەك گرنگ نییە.

-وانە بە یەکێکیتر بڵێ. هەوڵدان بۆ روونکردنەوەی چەمکە ماتماتیکییەکان بۆ کەسێکی تر، بە خێرایی ئەوەی کە بە راستی دەیزانیت یان نایزانیت دەستنیشان دەکات. تەقریبەن ئەستەمە کە وا لە کەسێك بکەیت-بەتایبەت کەسێك کە لە هەموو ئەو شتانەدا خاوترە لە تۆ- تێبگات ئەگەر تۆ تێنەگەیت!

### خوێندنەوەی تێکستەکانی زمانی بیانی

دەبێ تێکستەکانی زمانی بیانی بە هەمان شێواز رووبەڕوویان بیتەوە، بەتایبەت ئەوانەی بەشێوەیەکی بنچینەیی وشەکارییان لەگەڵدایە. ئەگەر تۆ بەسەر ئەو وشانەدا زاڵ نەبوویت کە قەرار وایە لە بەشی یەکەمدا زاڵ بیت بەسەریاندا، ئەوا لە کۆتایی بەشی سێیەمدا گرفتی خوێندنەوەی بابەت یان چیرۆکەکەت بۆ دروست دەبێت، تەنانەت ئەگەر هەموو ئەو وشانە فێربوویت کە لە بەشی دوو یان سێدا هاتوون. بۆیە لە یەك کاتدا هەنگاوێك هەڵبگرە و دڵنیا

بەرەوە لەوەی کە بەسەر چەمکێك، لیستێك وشە، وانە و هیتردا زاڵ بوویت بەر لەوەی کە بەرەو پێشەوە باز بدەیت.

**خوێندنەوەی جوانناسییانە (بۆ خۆشی)**

"خوێندنەوەی نووسەرێك بۆ من تەنیا بۆ بەدەستهێنانی ئایدیای ئەوە نییە کە چی دەڵێت، بەڵکو بۆ رۆیشتنیشە لەگەڵیدا و سەفەرکردنە لە تەکیەوە" ئەندرێ جید

بەشی زۆری چیرۆك هەوڵدانە بۆ گێڕانەوەی حیکایەتێك یان بەسەرهاتێك. دەستپێکێك هەیە کە تیایدا کارەکتەرەکان و شوێنەکە دەناسێنرێن. ململانێیەك هەیە کە چیرۆکەکە بەرەو لوتکە دەبات- کە لەوێ ململانێیەکە یەکلایی دەبێتەوە. هەرچی کۆتاییە، چیرۆکەکە بە ئاکام دەگەیەنێت. وانەی ئەدەبت بە بەکارهێنانی ئەو زاراوانەی کە زۆرجار سەرلێشێوێنەرن لەوەی یارمەتیدەر بن، موخاتەبەی ئەم بەشانە دەکات. ئەمانەی خوارەوە پێناسەی کورتی هەندێ لە گرنگەکانیانن:

پلۆت. سیستەم یان زنجیرەی چیرۆکەکەیە- چۆنێتی رۆیشتنی لە دەستپێکەوە بەرەو لوتکە. توانای تۆ بۆ تێگەیشتن و پەیپێبردنی ئەدەب بەندە بە چۆنێتی سۆراخکردنت بۆ پلۆت- چیرۆکەکە.

کارەکتەرایزەیشن. ئەو کەسایەتی یان کارەکتەرانەی کە سەنتەری چیرۆکەکەن- پاڵەوانەکان، جەلادەکان و کارەکتەرە پالپشتەکان. دەبێ تۆ کارەکتەرە سەرەکییەکانی چیرۆکەکە و پەیوەندییەکانیان بە ململانێیەکان و بە یەکترییەوە بناسیتەوە.

سیم. پەیامی کۆنترۆلکەر یان بابەتی چیرۆکەکەیە، ئەو وانە یان بیرۆکەیەیە کە نووسەر پلۆت و کارەکتەرەکان بەکاردەهێنێت بۆ گەیاندنی.

سێتینگ. کات و شوێن کە تیایدا چیرۆکەکە روودەدات. ئەمە بەتایبەت گرنگە کاتێك رۆمانێکی مێژوویی دەخوێنیتەوە یان ئەوەیان کە لە کەلتوورێکی تردایە.

دیدگا.کێ چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە؟ ئایا ئەوە یەکێکە لە کارەکتەرە سەنتەرییەکان کە زانیاریی کورت کورتت پێدەدات؟ یان گێڕەرەوەیەکی کەسی سێیەمە کە وتار و تێبینی دەخاتەڕوو لەبارەی کارەکتەرەکان، شوێن-کات و پلۆتەکە؟

یەکەم هەنگاوی خوێندنەوەی ئەدەب بریتییە لە ئاشناکردنی خۆت بەم چەمکانە، پاشان هەوڵدانە بۆ ناسینەوەیان لە هەر رۆمانێك یان کورتە چیرۆکێکدا کە دەیخوێنیتەوە. لەکاتێکدا کە تۆ دەست دەکەیت بە خوێندنەوە، یەکەم جار لە دیدگایەکی جوانناسییەوە لێی بڕوانە: وات لێدەکات هەست بە چی بکەیت؟ بۆچوونت لەبارەی کارەکتەرەکانەوە چییە؟ کەیفت پێیان دێت؟ رقت لێیانە؟ خۆت تیایاندا دەبینیتەوە؟

دووەم، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە دەزانی چی روودەدات– ئەمە پلۆت و دروستبوونی کارەکتەرەکان دەگرێتەوە. لە سەر بنەمایەکی بەش لەدوای بەش، لەوانەی یارمەتیدەر بێت بۆت کە کاغەزێك لای خۆت دابنێیت کە تیایدا دەتوانیت رستەیەك یان دووان لەسەر دروستبوونی پلۆت بنووسیت و تێبینی هەر کارەکتەرێکی نوێ بکەیت کە پەیدا دەبێت.

چەندێك خێرا دەتوانیت تێبگەیت؟

"کاتێك زۆر خێرا یان زۆر خاو دەخوێنینەوە، لە هیچ تێناگەین". بلەیس پاسکال

ئایا نیگەرانیت لەوەی کە هێواش دەخوێنیتەوە؟ لەوانەیە پێویست نەکات نیگەران بیت– خوێنەرە کەمتر خێراکان مەرج نییە کەم تواناتر بن. ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە ئەقڵت وەریبگرێت و لەبیرت بمێنێت. وەکو هەر شتێکی تریش، لەوانەیە پراکتیس ئاستەکانی خێراییت زیاد بکات. ئەگەر پێویست بکات پلەبەندییەکت هەبێت، ئەو بژاردە چەند سەد وشەیەی خوارەوە کە لە (دۆزینەوەی فێنگ شوی)ی نووسەر (شۆن میشێل ٢٠٠٤) وەرگیراوە، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی بخوێنەرەوە به تێبینیکردنی کاتی خایاندوو لە سەعاتەکەتەوە. بەم شێوەیەی خوارەوە پلەبەندیی خۆت بکە:

| | |
|---|---|
| ٤٥ چرکە یان کەمتر | زۆر خێرا |
| ٤٦–٦٠ چرکە | خێرا |
| ٦١–٩٠ چرکە | ناوەندی باڵا |
| ٩١–١١٩ چرکە | ناوەند |
| ١٢٠–١٥٠ چرکە | خاو |
| ١٥١ چرکە و زیاتر | زۆر خاو |

"فەلسەفەی ڕێپیشاندەری (فێنگ) ئەوەیە کە هەموو شتێك لە گەردووندا، لەوانەش هەر یەکێك لە ئێمە، لە هەمان وزەی بنچینەیی دروست بوو. ئەم وزە گەردوونییە، کە بە (چی) ناسراوە، زیندووە و هۆشی هەیە. لەبەرئەوەی لەسەر ئەم ئاستە بنەڕەتییە هەموو شتێك لەگەڵ هەر شتێکی تر لە پەیوەندیدایە، هەرکاتێك شتێك دەگۆڕێت، لە ئەنجامدا هەمووشتێکی تریش گۆڕانی بەسەردا دێت.

(چی)بە بەردەوامیی لە دەورمانەوە و بەناوماندا لەسەر بنەمای هەمیشە گۆڕاوی چڕی کەم و زیاد دەکات. زانستی مۆدێرن ئەوەی پشتڕاستکردووتەوە کە هونەری چینیی کۆنی فێنگ شوی زیاتر لە ٤٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر دانی پێداناوە لە ڕێگەی ئەو دۆزینەوەیەی کە هەموو مادده و نامادده‌کان لە تەنۆلکە ژێرگەردیلەییەکانی وزە پێکهاتوون. فیزیاناسانی کوانتەم لەو کاتەوە تاقیکردنەوەگەلێکیان ئەنجام داوە کە پیشانی دەدات ئەم بڕە بێسنوور بچوکانەی وزە ڕێك کاردانەوەیان هەیە بەرانبەر بیرکردنەوە، پەیوەست بەوەی کە لە کوێ و چۆن توێژەران تەرکیزیان ئاراستە دەکەن، ڕەفتاریان دەگۆڕێت.

ئەم دەرخستنە، جەخت لە هێزی فێنگ شوی دەکاتەوە.

وێنای ئەوە بکە کە بڵقێك لە وزە دەوری جەستەت دەدات و بە درێژایی ١٠ پێ لە هەر ئاراستەیەکەوە درێژ دەبێتەوە. لەکاتێکدا کە بە جیهاندا دەجوڵێیت، خەڵکی و شتەکان بەشێوەیەکی کۆنترۆڵنەکراو بەم بڵقەدا ڕەت دەبن. لەو شوێنەوە کە بڵقی وزەکەت لەگەڵ بڵقەکانی ئەوانیتردا یەکتردەبڕێت، جۆرێك لە پرۆسەی ئاوێتەبوون ڕوودەدات کە تیایدا وزەی تۆ کاردانەوە بەرانبەر وزەی ئەوان پیشان دەدات و وزەی ئەوانیتر بەرانبەر هی تۆ. دەشێ بیرۆکە و هەستە نابەرجەستەکان لە ڕێگەی ئەم ڕووبەرانەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە ڕێگەی چوونەناو بۆشاییە جیاجیاکان اتصالیان پێوەبکرێت.

ئەگەر ئەو پیاوەی کە لە پاسدا لە تەنیشتتەوە دانیشتووە تووڕە بێت، وزەکەی هەستی "تووڕەیی" دەدات. تۆ دەتوانیت لە ڕێگەی ڕووبەڕی وزەکەتەوە حاڵەتەکەی بخوێنیتەوە هەرچەندەش گفتوگۆت لەگەڵ نەکردبێت. ئەگەر تۆ چوویتە ناو کەنیسەیەك یان پەرستگایەك کە تیایدا خەڵکی چەند سەدەیەکە نزای تیادا دەکەن، تۆش لەوانەیە بەهەمان شێوە شوێنەواری وزەی "هێمنی" و "تەقوا" هەڵبگرێت لە دیوارەکان و میحرابیدا بەرجەستە بووە.

ئامادەیی تورەیی و تەقوا دەجولێتە ناو رووبەرەکەی تۆوە. لەوانەیە تۆ بەهەمان شێوە تورە یان ئارام بگریت تەنیا بەوەی کە بکەویتەبەر و کاردانەوە بکەیت لەبەرانبەر وزەی ئەم هەست و بیرۆکانە.

دەشێ بلّقی وزەی تۆ زیاتر لە ١٠ پێ درێژ بێتەوە. دەشێ لە مەودا دا بێسنوور بێت، چونکە لەسەر ئاستی ژێر گەردیلەیی، وزەی کەسیت تەنیا دلۆپێکە لە سەراپای دەریای (چی)ی گەردوونی. لەو حالەتەدا، هەر لایەنێکی جیهان وەکو هەمەکێك تا ئاستێکی بەرچاو کار دەکاتە سەرت. هەرکەسێك و هەر شتێك لەسەر هەسارەکە لەم سیناریۆیەدا دەشێ بەشێوەی چووەناویەك و وابەستەبەیەك ببینرێت.

ئەو گریمانەیە لەبەرچاو بگرە کە ئەم دیمەنە دەیگرێتەخۆ: ئێمە هەمووومان بەستراوین بەیەکەوە، بەشێکین لە پوچیی گەردوون. ئەوە پەیوەندی بە تێروانینەوە هەیە کە بشێ سۆفییەکان و زاناکان، ئیمان و لۆژیك هاورا بن. هەرچەندە فێنگ شوی بە راستی بە پراوەیەکی رۆحی یان ئایینێك لەقەڵەم نادرێت، هونەرێکی تەمومژاوی و هەستپێکراوە کە لەوانەیە سەرەنجام باوەرە رۆحییەکانت پەرە پێبدات. وێرای ئەمەش، روونە کە پرەنسیپەکانی وزە لە ژیانماندا ئیش دەکەن چ ئەوەی ئاگایانە یان نائاگایانە لەسەر هێلّ بین لەگەڵیاندا. لە رێگەی فێنگ شویەوە، دەتوانین بە مەبەست تەوژمی وزەی پۆزەتیف لە ژینگەماندا رێك بخەین و سەرەنجام ژیانمان دەوڵەمەند بکەین".

بنچینەی فەلسەفەی فێنگ شوی چییە؟ (چی) چییە؟ دەتوانیت چەمکی "بلّقی وزە" روون بکەیتەوە؟ پیادەکردنی کرداریی فێنگ شوی چییە؟

دەبێت خوێنەرێکی باش خێرا یان زۆر خێرا بخوێنێتەوە و لانی کەم سێ لەو چوار پرسیارە بە راستی وەڵام بداتەوە. (بگەرێرەوە سەر پارچەکە بۆ زانینی وەڵامەکان).

چ شتێك خێرایی/ئیستیعاب کەم دەکاتەوە

-خوێندنەوە بە دەنگی بەرز یان جوڵاندنی لێوەکانت کاتێك دەخوێنیتەوە.

-خوێندنەوە بە شێوەیەکی میکانیکی- بەکارهێنانی پەنجەکانت بۆ رۆیشتن بەدوای وشەکاندا، جوڵاندنی سەرت کاتێك دەخوێنیتەوە.

-پیادەکردنی "جۆر"ی هەڵەی خوێندنەوە بەسەر ماددەکەدا.

-نەبوونی وشەکاریی پێویست.

بۆ زیادکردنی خێرایی خوێندنەوەت

–هۆشی خۆت و تەرکیزت چڕ بکەرەوە.

–هۆش پەرتکەرەکانی دەرەوەی خۆت لاببە.

–ژینگەیەکی نەپچڕێنراو، ئاسودە دابین بکە.

–بە تاکە وشەکان یان رستەکانەوە خۆت هەڵمەواسە، بەڵکو (لە قاموسدا) سۆراخی وشە گرنگەگان بکە کە پێویستە تێیان بگەیت بۆئەوەی تەواوی مەفهومەکە دەرك بکەیت.

–هەوڵ بدە چەمکەکان لە فۆرمێکی گشتیدا دەرك بکەیت نەك ئەوەی هەوڵ بدەیت وردەکارییە چرووپرەکان تێبگەیت.

–ئەگەر زانیت کاتێك دەخوێنیتەوە لێوەکانت دەجولێنیت (دەنگە خوێندنەوە)، بە قەڵەمێك یان کەرەستەیەکی تر (ی ناژەهراوی، بێ شەکر) لە دەمتدا پراوەی خوێندنەوەکە بکە. ئەگەر لەکاتێکدا کە دەخوێنیتەوە بەر بووەوە، ئەوا دەبێ بزانیت کە بەردەوام بیت لە ئیشەکەت!

–ئیش بکە لەسەر بونیادنانی وشەکارییت. لەوانەیە تۆ خاو بخوێنیتەوە (و/یان گرفتت هەبێ لە تێگەیشتنی ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە)چونکە وشەکاریت بایی پێویست نییە بۆ ئەو ئاستەی خوێندنەوەت.

–زۆر بخوێنەرەوە...و زووزووش بخوێنەرەوە. خوێندنەوە خوویەکە کە بە پراوەکردن چاك دەبێت.

–خۆت لە دووبارەخوێندنەوەی وشەکان یان دەستەواژەکان بەدوور بگرە. بەپێی توێژینەوەیەکی ئەم دواییە، تێکڕای هەر خوێندکارێك کە ٢٥٠ وشە لە هەر خولەکێکدا دەخوێنێتەوە، لە هەر لاپەڕەیەکدا ٢٠ جار خوێندنەوە دووبارە دەکاتەوە. خاوترین خوێنەرەکان، زۆرترین کات دووبارە خوێندنەوە ئەنجام دەدەن.

بۆ زیادکردنی وەرگرتن (ئیستیعاب)ت

–هەوڵ بدە کرداری فێربووین بکەیت بە یەکلەدوای یەك– ئیستیعاب بە زیادکردنی مەعریفەی نوێ بۆ سەر مەعریفەی هەبوو، بونیاد دەنرێت.

–خاڵە دیاریکراوەکان لە خوێندنەوەکەتدا چاوپێدابخشێنەرەوە و جارێکی تر بیر لێبکەرەوە.

خۆت تاقی بکەرەوە بۆئەوەی بزانیت ئاخۆ گرنگیی ماددەکە دەگاتە شوێنی خۆی.

-ئەگەر شتەکان نەگەیشتنە ئاکام، ئەنجامگیرییەکەت ویَلّ بکە. بگەڕێرەوە، جارێکی تر بخوێنەرەوە و هەولّ بدە ئەنجامگیرییەکی جێگرەوە بدۆزیتەوە.

-ئەوەی کە خوێندووتەوە پوختی بکەرەوە، جارێکی تر لە تێبینییەکانتدا بە وشەکانی خۆت دایبڕێژەرەوە.

لە هەمووشی گرنگتر، بەو خێراییە بخوێنەرەوە کە ئاسودەبەخشە بۆت. هەرچەندە من خۆم دەتوانم زۆر خێرا بخوێنمەوە، پێم خۆشترە ڕۆمانەکان زۆر خاوتر بخوێنمەوە بۆئەوەی بتوانم دەرك بە گەمەی واتاکانی نووسەر بکەم. بەهەمان شێوە، هەر ماددەیەك کە بەلامەوە قورس بێت بۆ وەرگرتن، ڕێك خاوم دەکاتەوە. من ڕۆژنامەکان، گۆڤارە باوەکان و هیتری هاوشێوە زۆر خێرا دەخوێنمەوە، دەمەوێ زانیارییەکە وەربگرم بەلام نیگەرانی هەموو وردەکارییەکە نیم.

ئایا دەبێ جۆرە کۆرسێکی خێرا خوێندنەوە وەربگریت، بەتایبەت ئەگەر ئاستی هەنوکەیی خێراییت نزم بێت؟

خوێندنەوە بە خێرایی شایستەییەکی هەیە- زۆرێك لەو خەلّکانەی کە خوێنەری خاون ئەوەندەی بکرێ کەم دەخوێننەوە، چونکە بەلایانەوە تاقەتبەر و بێزارکەرە. بەلام تەنیا خوێندنەوە بە شێوەیەکی خێراتر وەلام نییە بۆ بوون بە خوێنەرێکی باش.

پێم وانییە کۆرسێکی وەها زیانت لێبدات بەهیچ شێوەیەك. لەگەلّ ئەوەشدا، بەهەمان شێوە دەتوانم پێشنیاری ئەوە بکەم بەردەوام بیت لەسەر پراوە کردن، کە بە شێوەیەکی سروشتی خێراییت زیاد دەکات.

**بیرهاتنەوەی ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە**

لە جیهانێکدا کە توانای شارەزایەتی تێدا پەیداکردن و بیرهاتنەوەی بارستەیەکی زەبەلاحی روو لە گەشەی داتا گرنگە بۆ سەرکەوتنی تاکەکەسی، هۆشێکی کەم دەدرێتە داینامیکەکانی یادەوەری و سیستەمەکانی باشترکردنی. لەوانەیە پەرەپێدانی یادەوەریت کاریگەرترین ڕێگا بێت بەرەو زیادکردنی لەباردابوونت لە خوێندنەوە و تەقریبەن لە هەر شتێکی تردا.

هەندێ فاکتەری سەرەکی هەن کە یارمەتیت دەدەن بڕێکی زیاتری ئەوەی کە دەیخوێنیتەوە لەبیر بێت:

–تێگەیشتن. تۆ تەنیا ئەوەت بیرت دێتەوە کە تێیدەگەیت. کاتێك تۆ شتێك دەخوێنیتـەوە و پەیامەکـە وەردەگریـت، ئـەوا دەسـتت کـردووە بـە پرۆسـەی هێـشتنەوە و پاراسـتن. ڕێگـای تاقیکردنەوەی ئەمە بریتییە لە دارشتنەوەی پەیامەکە بە وشەکانی خـۆت. دەتوانیـت بیرۆکـەی سەرەکی پوخت بکەیتەوە؟ ئەگەر لەوە تێنەگەیت چـی دەوتـرێ، ئـەوا ناتوانیـت بڕیـار بـدەیت ئاخۆ بیرت بێتەوە یان وێڵ بکەیت.

–ئارەزوو. تۆ ئەوەت بیر دێتەوە کە دەتەوێ بیرت بێتـەوە. ئەگـەر نەتـەوێ بـڕە زانیارییـەك بهێڵیتەوە یان بڕوا نەکـەیت کـە دەتوانیـت ئەمـە بکـەیت، ئـەوا نایهێڵێتـەوە! بـۆ بیرهاتنـەوەی ماددەکە، پێویستە تۆ بتەوێ بیرت بێتەوە و قەناعەتت وابێت کە لەبیرت دەبێ!

–سەرووفێربوون. بۆ دڵنیابوون لەوەی کە ماددەیەك لە یادەوەریتدا دەهێڵێتـەوە، پێویستە بڕۆیتە سەروو ئەنجامدانی واجبەکە. بۆ بە راستی بیرهاتنەوەی ئەوەی کە فێری دەبیت، دەبێت تۆ ماددەکە بە تەواوی فێر ببیت، یان سەروو فێر ببیت, ئەمەش بریتییە لە پـێش خوێندنـەوەی تێکستەکە، خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانە و شێوازێکی دڵنیـای چاوپێداخـشاندنەوەت هـەبێ کـە ئەوەی دەبێ فێری ببیت، پایەدار بکات.

–بە سیستەم بکـە. بیرهاتنـەوەی بیرۆکـە یـان ژمـارە ڕەمـەکی (عـشوائی)یـەکان قورسـترە لەوانەی کە لە هەندێ بنەما و ڕێسادا ڕێکخراون. بۆ نموونە، کام ژمـارە تەلەفۆنـە بیرهاتنـەوەی ئاسانترە:

٦٢٨٤ ٥٣٨، یان ١٢٣٤ ٦٧٨؟ هەر کە ڕێساکەت لە ژمـارەی دووەمـدا ناسـییەوە، هـەوڵێکی کـەمتری پێویـست دەبـێ بـۆ بیرهاتنـەوە بـە بـەراورد بـەوەی یەکـەمیان. پێویـستە توانـای دەستنیشانکردنی ئەو بونیـادە پەیـدا بکـەیت کـە هەیـە و بـیر خـۆتی بهێنیتـەوە کاتێـك هـەوڵ ئەدەیت بیرت بێتەوە. سیـستەمێکت هـەبێت کـە یارمـەتیت بـدات بـیرت بێتـەوە زانیـاری چـۆن ڕێکخراوە و گرێدراوە بە یەکترییەوە.

–رایەڵ. شتێکی یارمەتیدەرە کە ئەوەی هەوڵ دەدەیـت بـیرت بێتـەوە رایـەڵ بکەیتـەوە بـە شتێکەوە کە هەنوکە لە یادەوەریتدا هەیە. لـە ئەقڵتـدا ماددەیـەکی نـوێ رایـەڵ بکـەرەوە بـەو زانیارییەی کە لاتە بۆئەوەی کۆنتێکست (سیاق)ێك بدەیت بەو بیرۆکە نوێیە لە مێشکتدا.

هێشتنەوە

هێشتنەوە یان گرتن، پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە ئێمە شوێنەواری ئەزموونەکانی رابردوو لە مێشکماندا دەپارێزین، "کۆگای هەڵگرتن". لەکاتێکدا کە دەکەوێتەبەر کردارەکانی تری ئەقڵ، ئەوەی کە دەهێڵرێتەوە دەشێ لەکاتی پێویستدا بیر بهێنرێتەوە. شتەکان بەهەمان سیستەمی فێربوونیان هەڵدەگیرێن. کەواتە دەبێ سەعیکردنت یەك فاکت، یەك بیرۆکە و یەك چەمك لەسەر یەکێکی تر بونیاد بنێت.

چەمکە بەرفراوانەکان دەشێ زۆر ئاسانتر لە وردەکارییەکان بهێڵرێنەوە. بەسەر گشتییەکاندا زاڵ بە، وردەکارییەکان شوێنی خۆیان دەگرن.

ئەگەر پێت وابێت شتێك گرنگە، ئەوا ئاسانتر لە مێشکتدا دەیهێڵیتەوە. کەواتە قەناعەت هێنان بە خۆت بەوەی کە ئەوەی سەعی لێدەکەیت شتێکە کە پێویستە بیهێڵیتەوە ( و بیرت بێتەوە) توانات زیاد دەکات بۆ هەڵگرتنی لە بانکی یادەوەریی درێژخایەنتدا.

هەڵگرتن بە شێوەیەکی سەرەکی بەرهەمی ئەوەیە کە لێی تێدەگەیت. پەیوەندییەکی کەمی هەیە بە چەندێتی خێرا خوێندنەوەت، چەندە جوان سەرەباسەکان دادەرێژیت، یان چەند ماجیکی فۆسفۆری رەنگاورەنگ بەکاردێنیت بۆ دیاریکردنی دێرەکانی کتێبی مەنهەجت. خوێندنەوەی تێکستێك، گرتنی پەیامەکە و بیرهێنانەوەیان ئەو بنچینەیەن کە ئاستێکی هێشتنەوەی بەرز فەراهەم دەکەن. خوێندنەوە بە خێرایی ۱۰۰۰ وشەی لە خولەکێکدا مەرج نییە بەو مانایە بێت کە تۆ لەوە تێدەگەیت کە خوێندووتەوە یان هیچیت بیر دێتەوە.

لەکاتێکدا کە بەرەو باشترکردنی خوێندنەوەت هەنگاو دەنێیت، درك بەوە بکە کە خێرایی شتێکی دووەمییە بۆ وەرگرتن (ئیستیعاب). ئەگەر تۆ بتوانیت واجبێك خێراتر لە هەرکەسێکی تری ناو پۆل بخوێنیتەوە، بەڵام نەتوانیت پوختەیەکی یەك پەرەگرافیی لەوە بدەیت بەدەستەوە کە هەر ئێستا خوێندتەوە، کاتی خۆتت بە فیڕۆ داوە. ئەگەر تۆ بە راستی پەیامی نووسەرەکە بەدەست بێنیت– تەنانەت ئەگەرچی سەعاتێك یان دووسەعات زیاتر لە هاورێکانت کاتت ببات– بەسەربردنی ئەو کاتەی کە پێویستتە بۆ بە راستی تێگەیشتن لەوەی کە دەیخوێنیتەوە، کەڵکێکی گەورەی دەبێت لەناو پۆل و لەکاتێکی دواتری ژیاندا.

### بیرهێنانەوە

ئەمە پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە ئێمە دەتوانین ئەو شتانە بهێنینە پێش کە پاراستوومانە یان هێشتوومانەتەوە. بیرهێنانـەوە قـابیلی بەهێزکردنـە لـە رێگـەی پرۆسـەی دووبارەکردنـەوەوە. بیرهێنانەوە راستەوخۆ دوای یەکەم خوێندنەوە کاریگەرییەکەی لە کەمترین ئاسـتدایە، هەربۆیـە چاوخشاندنەوەی ناوبـەناو زۆر گرنگـە. داینامیکـەکانی توانامـان بـۆ بیرهێنانـەوە دەکەونـە ژێـر کاریگەریی ژمارەیەك فاکتەرەوە:

–ئێمە بە ئاسانترین شێوە ئەو شتانە بیرمان دێنەوە کە جێ بایەخمانن

–ئاراسـتەیەکی هەڵبـژاردەییت هـەبێت لـە دیـاریکردنی ئـەوەی کـە چـەندەت پێویـستە بـیر بێتەوە. هەموو زانیاریی هەمان گرنگیی نییە– هۆشت بخەرە سـەر تـوانینی بیرهێنانـەوەی بـڕە هەرە گرنگەکانی زانیاری.

–رێگـە بـەخۆت بـدە کاردانـەوەت هـەبێ بەرانبـەر ئـەوەی کـە دەیخوێنیتـەوە. رایـەڵکردنی زانیاریی نوێ بەوەی کە هەنووکە دەیزانیت، بیرهێنانەوەت ئاسان دەکات.

–ئەوەی کە دەتەوێ بیرت بێتەوە، دووبارە بکـەرەوە، چ بـە دەنگـی بـەرز یـان لـە مێـشکی خۆتدا. رێگای نوێی وتنی ئەو شتانە بدۆزەرەوە کە دەتەوێ بیرت بێنەوە.

–هەوڵ بدە چەمکە فراوانەکانت بیر بکەوێتەوە نەك فاکتە دانە دانەکان.

–ئەو داتا نوێیە بە شێوازێکی پڕمانا بەکاربێنە کە بیرت هاتووەتەوە– جارێکی تر یارمـەتیت دەدات بیرت بێتەوە.

### ناسینەوە

ئەمـە بریتییـە لـە توانـای بینـینی مـاددەی نـوێ، ناسـینەوەی بـەو شـێوەیەی کـە هەیـە و تێگەیشتنی بەو مانایەی کە هەیـەتی. ئاشـنایەتی، کلیلـی ناسـینەوەیە– هەسـت دەکـەیت ئـەم زانیارییەت پێشتر "چاو پێ کەوتووە"، رایەڵی بکەرەوە بە باروداخ یان داتای تـر، پاشـان ئـەو چوارچێوەیە بیر خۆت بهێنەرەوە کە بە شێوەیەکی لۆژیکی تیایدا جێی دەبێتەوە.

ئەگەر جارێك لە جاران ئیرەییت برد بە توانای بە رواڵەت سەیری بۆ بیرهێنانەوەی فاکتەکان، بەروارەکان و ژمارە تەلەفۆنـەکان بـەو شـێوەیەی کـە حـەز دەکـات، هێـور بـەرەوە چـونکە لـە

زۆربەی حاڵەتەکاندا، ئەم شارەزایەتییە دەرەنجامی سەعیکردن و پراوە کردنە نەک شتێک کە لەگەڵیدا لەدایک بووبێت.

### تێبینی بنووسەرەوە

ئایا ئەو کتێبە هی خۆتە کە دەیخوێنیتەوە؟ ئایا مشوری ئەوە ناخۆیت سپاردەی نەوەی ئایندەی بکەیت؟ کەواتە پەراوێزەکانی بەکاربێنە بۆ نووسینەوەی تێبینییەکان. لەوە تێپەڕە کە تەنیا بە فۆسفۆر رەنگ بکەیت بۆ دیاریکردنی دێڕ و پەرەگرافەکان بە پێی گرنگییان.

من لەسەر ئەوە راهاتبووم کە شێوازێکی قەدبڕی بچوک بەکاربێنم بۆ یارمەتیدانم تا شتی نووسراوم بیر بێتەوە. هێڵی ستوونیم دەکێشان لە نزیك تێکستەکە بۆ دیاریکردنی ئاستەکانی گرنگی. یەك هێڵی ستوونی بەو مانایە بوو کە دەبێ ماددەکە چاوی پێدابخشێنرێتەوە، دوو هێڵ پیشاندەری ئەوە بوو کە فاکتەکان زۆر گرنگن، ئەستێرە ئەوەی پیشان دەدا کە ئەمە ماددەیەکی "یا فێری بە یان لێی راسب بە"یە. نیشانەی پرسیارم بۆ ئەو ماددەیە دادەنا کە دەمویست یەکێك لە هاوڕێ زیرەکەکانم یان مامۆستایەکم زیاتر بۆم روون بکاتەوە. بازنەم دەکێشا بۆ پیشاندانی ئەمەی کە زۆر دڵنیام زانیارییەکە لە تاقیکردنەوەی ئایندەدا دێتەوە.

جێی سەرنجیشە کە، بۆ دەردەکەوت کە خودی کرداری دەستنیشانکردنی گرنگییە رێژەییەکە بۆ تێکستەکە و هێشتنەوەی هۆشدارییەك بۆ ماددەی تاقیکردنەوە یارمەتیدام تا بیرم بێتەوە چونکە ئاستی تەرکیزمی بەرز دەکردەوە.

### ببە بە خوێنەرێکی چالاك

من داوات لێدەکەم کویزی خۆت بکەیت لەسەر ماددەی نووسراو بۆ دیاریکردنی ئەمەی کە تا چەنێك لە یادەوەریتدا ئەمێنێتەوە. ئەگەر ئەمە سوودی نەبوو، هەوڵ بدە پرسیارەکان بکەیت پێش ئەوەی ماددەکە بخوێنیتەوە.

بۆ نموونە، ئەگەرچی من لە بەشی هەرە زۆری ژیانی ئەکادیمیمدا خوێنەرێکی تامەزرۆ بووم، چەند جارێکی سەرەتا کە هەوڵمدا، هەندێ گرفتم هەبوو لەگەڵ بەشە پەیوەندیدارەکانی توانای خوێندنەوە (ریدینگ) لە تاقیکردنەوەکانی بەکالۆریدا. بۆچی؟ پێم وایە ئارەزوومەندییەکم هەبوو بۆ پرتاوکردن بەناو ئەو بەشانەدا.

پاشان کەسێك پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە پرسیارەکان بخوێنمەوە پێش ئەوەی پارچەکە بخوێنمەوە. بەڵێ! سەرنجام نمرەی بەرزم لە بەشی خوێندنەوەدا هێنا. لەکاتێکدا کە تۆ هەمیسە لیستێکی لەپێشدا ئامادەکراوی پرسیارەکانت لەبەردەمدا نابێ، سەرچاوەی تر هەن- پوختەکانی سەرەتای بەشەکان یان کورتکراوەکان لە خشتەی پێرستدا. گرنگی بەمانە بدە.

ئەم تەکنیکە راتدەهێنێت تا لەو وردەکارییە گرنگانەدا زیرەك ببیت کاتێك لەناو بابەتەکەدا پەیدا دەبن. بەهەمان شێوە بیرۆکەیەکی باش دەبێت کە ئەم پرسیارانە لە خۆت بکەیت راستەوخۆ پاش ئەوەی بەشەکە تەواو دەکەیت. ئەمە یارمەتیت دەدات تا بڕیار بدەیت ئاخۆ خاڵە گرنگەکانی بەشەکەت "وەرگرتووە" و یارمەتیت دەدات زانیارییەکە کاتێکی درێژتر لە یادەوەریتدا بمێنێتەوە.

### تێبگە، دەرخ مەکە

بە نیازی لێتێگەیشتنی نەك دەرخکردنی لە هەر تێکستێك نزیك بەرەوە. تێگەیشتن، لایەنی سەرەکیی دەرخکردنە. لە مەودای خوێندنەوەتدا شەپۆلی زانیاری مەوەستێنە (جگە لەو حاڵەتەی کە تیایدا هێڵ دەهێنیت بەژێردا یان تێبینی دەنووسیتەوە). دوایی بگەڕێرەوە و دەرخ بکە.

### ماددەکە رێك بخە

مێشکمان تامەزرۆی سیستەمە. فێڵە بینراو و هەست پێنەکراوەکان لەبەرئەوە سەرکەوتووانە ئەنجام دەدرێن چونکە مێشك پشت دەبەستێ بە سەپاندنی سیستەم بەسەر هەر بڕە زانیارییەکدا کە لە هەستەکانەوە دێتە ناوەوە. لەکاتێکدا کە دەخوێنیتەوە، بیر لە رێگاگەلێك بکەرەوە بۆ رێکخستنی ماددەکە بۆ یارمەتیدانت تا مێکشت هەڵیمژێت.

من هەمیشە حەزم لەو هێڵکارییانە بوو کە تاکە وشەیان لەگەڵدابوو یان ئەو دەستەواژانەی کە کە بە سەهمەکان رایەڵ کرابوونەوە بۆ پیشاندانی پەیوەندییە هۆکار و دەرەنجامەکان. یان من نیشانەیەکی تایبەت (سێگۆشە)م بەکاردەهێنا بۆ رۆشنایی خستنەسەر هۆکارەکانی شتەکان لە تێکستەکاندا.

خووی باشی خوێندنەوە بهێنەرەکایەوە

قورسە بۆ یەکێك کە بیری بێتەوە سەعات ٣ی بەیانی چی خوێندووەتەوە یان لەکاتێکدا کە چاوەڕوانیی گەورەترین ژوان دەکات لە ژیانیدا. کاتێکی هێمن بەلاوەنێ کاتێك لەوپەڕی توانا و وزەی خۆتدایت. ئایا تۆ لە جۆری بەیانیانیت؟ کەواتە زوو لە خەو هەڵسە بۆ ئەنجامدانی خوێندنەوەکەت. ئایا لە ٦ی ئێوارەدا چالاکیت؟ دە خوێندنەوەکەت بکە پێش ئەوەی بچیت نانی ئێوارە بخۆیت.

بیرت نەچێت قاموسەکەت بەکار بێنیت بۆ گەڕان بەدوای ئەو زاراوانەدا کە لێیان تێ ناگەیت.

بۆچی بیرمان دەچێتەوە

لەکاتێکدا کە بیر لە هێنانەکایەی یادەوەرییەکی باش دەکەیتەوە، دەتوانیت بەکاریان بێنیت بۆ موخاتەبەکردنی هۆکاری "بیرچوونەوە"ت. ڕەگی یادەوەرییەکی لاواز بەزۆری لە یەکێك لەو ڕووبەرانەدایە:

—شکست دێنین لە بەواتاکردنی ماددەکە

—ماددەی پێشمەرج فێر نەبووین

—شکست دێنین لە وەرگرتنی ئەوەی کە دەبێ بیر بێتەوە

—ئارەزووی بیرهاتنەوەمان نەبووە

—ڕێگە دەدەین نابەدڵی یان بێزاری زاڵ بێت بەسەر چۆنێتی فێربوونمان

—خووی جێگربوومان نییە بۆ فێربوون

—پەرپووتین و پڕاوپڕ نین لە بەکارهێنانی کاتی سەعیمان

—ئەو زانینەی بەدەستمان هێناوە بەکاری ناهێنین

هەموومان ڕۆژانە پڕ دەبین لە زانیاری، بە فاکتەکان، چەمکەکان و ڕاوبۆچوونەکان بۆمباران دەکرێین. ئێمە دەتوانین برێك لە زانیاری هەڵمژین هەر لەبەرئەوەی کە میدیا سیخناخمان دەکات پێی. بۆئەوەی بەشی هەرە زۆری زانیاری بهێڵینەوە، دەبێ هەوڵێکی کۆنکریتی بدەیت بۆ ئەم مەبەستە. پێویستە ئێمە هەمان ئەو هەوڵەش بدەین بۆ ئەو ماددەیەی کە دەیخوێنینەوە.

لە حاڵەتێکدا کە بیرت چووەوە

١.ماددەکە هەڵسەنگێنە و مەبەستەکەت پێناسە بکە بۆ خوێندنەوە. ئاستی بایەخپێدانت دیاری بکە و بزانە ماددەکە تا چ ئاستێك قورسە.

٢.تەکنیکی خوێندنەوەی پەیوەندیدار هەڵبژێرە بۆ مەبەستی خوێندنەوەکەت.

٣.فاکتە گرنگەکان بناسەرەوە. ئەوەت بیر بێت کە پێویستە بیرت بێتەوە. ئەو پەیوەندییانە بناسەرەوە کە رایەڵ دەبن بەو وردەکارییەی پێویستە بیرت بێتەوە.

٤. تێبینی بنووسەرەوە. وشەکانی خۆت بەکاربێنە بۆ نووسینی کورتەیەك لە ئایدیا سەرەکییەکان. پوختە، دایاگرام یان درەختی روونکردنەوە بەکاربێنە بۆ پیشاندانی پەیوەندییەکان و رێساکان. تێبینییەکان پاڵپشتێکی گرنگ دابین دەکەن بۆ یادەوەریت. نووسینی خاڵە سەرەکییەکانیش توانات تۆکمەتر دەکەن بۆ بیرهاتنەوە.

٥.چاو پێدابخشێنەرەوە. لەو شتانەدا کویزی خۆت بکە کە پێویستە بیرت بێنەوە. سیستەمێك بهێنەرەکایەوە کە بەهۆیەوە لانی کەم سێ جار چاو بە تێبینییەکاندا بخشێنیتەوە بەر لەوەی کە پێویست بکات بیرت بێنەوە. دەبێ یەکەم چاوپێداخشاندنەوە ماوەیەکی کورت پاش خوێندنەوەی ماددەکە بێت، دوومیان چەند رۆژێك دواتر بێت و دوایینیان رێك پێش ئەو کاتە بێت کە چاوەڕوان دەکرێت بیرت بێنەوە. ئەم پرۆسەیە یارمەتیت دەدات تا خۆت لە سەعییەکانی دوایین خولەك بەدوور بگریت.

٦.پیادە بکە. دەرفەت بدۆزەرەوە بۆ بەکارهێنانی ئەو زانینەی بەدەستت هێناوە. گروپەکانی سەعی و مشتومڕەکانی ناو پۆل دەرفەتی بەنرخن بۆ پیادەکردنی ئەوەی کە فێری بوویت.

کتێبخانەی خۆت بونیاد بنێ

"خوێندنەوەی هەموو کتێبە باشەکان وەکو وتووێژکردنە لەگەڵ زەنگینترین پیاوانی سەدەکانی رابردوو". رینیە دیکارت

ئەگەر تۆ جارێك لە جاران دەبیتە خوێنەرێکی تامەزرۆی چالاك، خۆت بگەیەنەرە ئەو کتێبانەی کە شتێکی زۆر دەکەن بۆ دروستکردنی خوو. پێشنیار دەکەم کتێبخانەی خۆت "بونیاد بنێیت". پێویستە و دەشێ هەڵبژاردنەکانت وێنەدەرەوەی بایەخپێدانەکان و

حەزەکانی خۆت بن، بەڵام هەوڵ بدە فراوان و جۆراوجۆریان بکەیت. هەندێ لە کلاسیکەکان، ژیاننامە، شیعر و چیرۆکی هاوچەرخ دابنێ.

تێکستەکانی ئامادەیی و کۆلێژت هەڵگرە- سەرت سوڕ دەمێنێت لەوەی کە چۆن هەندێ لە ماددەکان پەیوەندیداریی خۆیان دەپارێزن. هەوڵیش بدە هەر ڕۆژە ڕۆژنامەیەکی باش بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی ئاگادار و بەئاگا بیت.

کارمەندی کتێبخانەکەی دەوروبەر دەتوانێ ئاماژەت بۆ بکات بە هەر ژمارەیەکی لیستەکانی "کتێبە مەزنەکان" کە زۆربەیان بە نرخێکی هەرزان دەست دەکەون. دەتوانیت هەندێ لەمانە لە لیستی کڕینتدا دابنێیت، بەتایبەت ئەگەر خەریکی پلاندانانیت بۆ بەرنامەی خوێندنەوەی هاوینە.

لەوانەیە خوێندنەوەی کلاسیکەکان- کۆن و هاوچەرخ- بتکاتە خوێنەرێکی باشتر. بە دڵنیاییەوە ئەمە خوێندەوارترت دەکات. ئەمەش پاداشتێکی زیادەیە بۆ بونیادنانی بەرنامەیەکی خوێندنەوەی وەها- دەرك کردن بە هەندێ لە نووسەران، کتێبە دیاریکراوەکان و ڕووداوە کەلتوورییە دیاریکراوەکان، کەسی ڕۆشنبیر لە کەسی تەنیا خوێندەوار و کەم نەخوێندەوار جیا دەکاتەوە.

### بەردەوام بە لە خوێندنەوە

تا ئەو شوێنەی کە کەسێك دەتوانێ لە بەشێکدا بیکات، هەوڵمداوە جەوهەرەکانی خوێندنەوە چڕ بکەمەوە. ئەمە زانستێکی سنووردار نییە، بەڵکو شارەزایەتی و دەرککردنێکە کە مرۆڤ دەتوانێ بەپێی تێپەڕینی کات پەیدای بکات. ڕاهێنانێکی باش لە قوتابخانەی بنەڕەتی، جەوهەرییە. بۆ ئەوانەش کە توانیوویانە ڕووبەرەکانی گرفت بناسنەوە، هەمیشە خول و دەوراتی چارەسەر هەن.

# بەشی چوارەم

## چۆن کاتەکەت ڕێکبخەیت

"ئەوانەی کە بە خراپترین شێوە کاتەکانیان بەکاردێنن، یەکەمین کەسن کە لەبارەی کەمییەکەیەوە بۆڵە بۆڵ دەکەن". ژان دو لا برویەر

ئێمە هەموومان کێشەمان لەگەڵ کاتدا هەیە. ناتوانین کۆنترۆڵی بکەیت- ناتوانین خوای بکەینەوە یان خێرای بکەین. ناتوانین هەڵیبگرین- هەموو ئەو شتەی کە دەتوانین بیکەین ئەوەیە کە بڕیار بدەین چۆن بەسەری ببەین. هەمیشە زۆرترمان لێی پێویستە...و نازانین لە کوێ بیدۆزینەوە. پاشان لەوە رادەمێنین ئاخۆ هەمووی بۆ کوێ ڕۆیشت.

من دڵنیام کە زۆرێك لە ئێوە کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە لە ململانێدان لەگەڵ بەرپرسیارێتی و پابەندێتیی هەندێ جار قورس. لەوانەیە هەندێك لە ئێوە لەوانەیە ئەوەندە پروکابن کە تازە تەسلیم بووبن. ئەوانەتان کە لەوانە نییە وەها بن، لەوانەیە وای بۆ بچن کە هەڵەی خۆتانە- ئەگەر تەنیا زیاتر خۆت ماندوو بکردایە، کاتێکی زیاترت لە تاقیکردنەوە و واجبەکاندا بەسەر بردایە، کاتێکی زیاتر لەسەر ئینتەرنێت سێرچت بکردایە ئەوا هەموو شتێك بە باشی بەڕێوە دەچوو.

کەواتە ئێوە خۆتان دەدەنە بەر شەونخونیی قانگدراو بە کافین، کات دەچننەوە بۆ تاقیکردنەوەکان و چالاکییە کاتبەرەکانی وەکو خواردن و خەو لەبیر دەکەن. هەوڵدان بۆ کردنی هەموو شتێك- تەنانەت کاتێك کە شتی زۆر هەیە بۆ کردن - بەبێ بەدەستهێنانی شارەزاییەتییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی کاتەکەت، سەودایەکە کە بە دڵنیاییەوە سەردەکێشێت بۆ نائومێدی و شکست.

چ ئـەوەی کـە نووسـەرێکی کتێـب بیـت کـە چـەندەی بتـوانیٚ خێـرا تایـپ دەکـات بۆئـەوەی دوامۆڵـەتی دەزگـای بڵاوکردنەوەکـە تێنەپـەڕێنێت، خوێنـدکارێکیت ئەمـسەر ئەوسـەری چـەند کلاسێك دەکەیت و ئیشێکی نیوەکاتیشت هەیە، یـان دایـك یـان باوکێکیـت کـە ئـیش دەکـەیت، دەخوێنیت و خێزانێکیش بەخێو دەکەیت، سیستەمێکی کات بەڕێوەبردنی ئاسان بـۆ پـەیڕەوی کردن گرنگە بۆ سەرکەوتنت. وێڕای ئارەزووومەندیی سروشتیشت جاڕدانی ئەمەی کە کاتت نییـە بۆ خشتە دانان، لیست کردن و تۆمـارکردن، لـە راسـتیدا ئەمـە باشـترین ڕێگەیـە بـۆ بەخـشینی کاتێکی "زیاتر" بە خۆت.

بۆچی هەموو ئەم شتانە بکەیت؟

سیستەمێکی ڕێکخستن یان کات بەڕێوەبردن کە گونجاوە لەگەڵ پێداویستییەکانت، دەتـوانیٚ یارمەتیت بدات لە کاتی کەمتردا کـاری زیـاتر بکـەیت. چ ئـەوەی ئەولەویەتەکـەت کـاتی بـەتاڵی زیاترە، نمرەی باشترە، ژیـانێکی بێنـە و بـەردەی کـەمترە- یـان هـەموو ئەمانەیـە- فێربـوونی چۆنێتی ڕێکخستنی ژیانت و سەعیکردنت دەتوانیٚ یارمەتیت بدات بە ئامانجـت بگـەیت، چـونکە سیستەمێکی کات بەڕێوەبردنی کاریگەر:

١.یارمـەتیت دەدات کـە یەکـەم جـار یەکـەم شـتەکان دابنێیـت. ئایـا قـەت ئێوارەیـەکت بـە واجبێکی کاتبەر بەسەر بردووە بۆ وانەیەکی سوك، هـەر ئەوەنـدە بـۆت دەرکـەوتووە کـە کـاتی پێویستت بۆ سەعیکردن لە تاقیکردنەوەیەکی گرنگ لە وانەیەکی قورستر بەسەر نەبردووە؟

٢.یارمەتیت دەدات فێر بیت کـە هـەر شـتێك بـە راسـتی چـەندی دەویٚ. یـەکێك لـە پێکهاتـە گرنگـەکانی ئـەم سیـستەمە مەزەنـدەکردنی ئەوەیـە کـە هـەر واجبێـك چـەند دەخایـەنیٚ و سۆراخکردنی ئەوەیە کە بە راستی بە چەند تەواوی دەکەیت. هەر کە ئەم چەمکەت لـە ژیانتـدا بونیاد نا، دواجار تۆ دەزانی هەموو ئەو کاتەی کە "لەدەستتداوە" بۆ کویٚ ڕۆیشتووە.

٣.ئامادەبیت بۆ تەمبەڵیکردن کەم دەکاتەوە. هەر کە بۆچوونێکی واقعبینانەت هەبوو بۆ ئەو شتە دیاریکراوانەی کە پێویستە بەجێیان بگەیـەنیت و زانیـت کـە تـۆ کـاتی پێویـستت تـەرخان کردووە بۆ ئەم مەبەستە، ئەگەری کەمترە کە نائومێد ببیت و دوایان بخەیت.

٤.یارمـەتیت دەدات دوور بکەویتـەوە لـە تەڵـەکانی کـات. تەڵـەکانی کـات ئـەو ئاگرانـەن کـە پێویستە بیانکوژێنیتەوە پـێش ئـەوەی بـشیٚ روو بکەیتـە ئەرکـەکانی وەکـو سـەعیکردن. کـات

بەڕێوەبردن وەکو شێوازێکی پێشگرتن لە ئاگرە نەك ئاگر کوژاندنەوە: ڕێگەت بۆ خۆش دەکات بەشێوەیەکی سیستەماتیکی لە کارەکەت نزیك کەویتەوە لەبری ئەوەی کە لە قەیرانێکەوە بچیتە سەر قەیرانێکی تر یان لە ئاوات خواستنێکەوە ئاواتێکی تر بخوازیت.

٥.یارمەتیت دەدات چاوەڕوانیی دەرفەت بکەیت. سەرباری یارمەتیدانت تا کاتی سەعی لەگەڵ پێویستییەکانی تری کاتدا هاوسەنگ بکەیت، کات بەڕێوەبردنێکی کاریگەر دەتوانێ یارمەتیت بدات تا ئەو کاتەی بە سەعیکردن بەسەری دەبەیت، بەرهەمهێنتر بکەیت.

٦.سەربەستی و کۆنترۆڵت پێ دەدات. بە پێچەوانەی زۆر ترسی خوێندکاران، کات بەڕێوەبردن ئازادیبەخشە، نەك سنووردارکەر. کۆنترۆڵێکی دیاریکراو بەسەر بەشێك لە ڕۆژەکەتدا ڕێگەت بۆ خۆش دەکات تا بەشەکەی تر بە ئارەزوومەندانە بەڕێ بکەیت.

٧.یارمەتیت دەدات لە ململانێکانی کات دوور کەویتەوە. تەنیا بە نووسینی هەموو چالاکییەکانت، واجبەکانت، مەوعیدەکانت، ئەرکە پێسپێردراوەکانت و بیرهێنەرەوەکانت لە شوێنێکدا یارمەتیت دەدات تا زامنی ئەوە بکەیت دوو یان سێ شت بە یەك جار بەرنامەیان بۆ دانانرێت. ئەگەر ململانێی کات سەر هەڵبدات، تۆ لە پێشدا بە باشی بەدییان دەکەیت و دەتوانیت بەو پێیە شتەکان ڕێك بخەیتەوە.

٨.یارمەتیت دەدات لە خۆ گوناهبار کردن دوور بکەویتەوە. لەبیرچوونەوەی سەعی زۆر ئاسانترە ئەگەر تۆ هەنوکە کاتەکەت بۆ جیا کردبێتەوە. بەبێ پلانێك بۆ تەواوکردنی ئەو کارەی کە دەیکەیت، لەوانەیە وا هەست بکەیت کە "بە سەرتەوە هەڵواسراوە"– تەنانەت ئەو کاتەش کە ئیشی لەسەر ناکەیت.

٩.یارمەتیت دەدات بەرەوپێشچوونت هەڵسەنگێنیت. ئەگەر دەزانیت کە پێویستە تێکڕای ٧٥ لاپەڕە لە هەفتەیەکدا بخوێنیتەوە بۆئەوەی لە کلاسی ئیدارەی ئەعاملەکەتدا دوانەکەویت و ئەم هەفتەیە تەنیا ٦٠ لاپەڕەت خوێندبێتەوە، پێویستت بە ژمێرەر (حاسیبە)یەك نییە تا بزانیت ئاخۆ کەمێك لە دواوەیت. واش ئاسانە کە کاتێکی کەمێك زیاتر بخەیتە خشتەوە بۆ خوێندنەوە لە هەفتەی داهاتوودا بۆئەوەی بگەیتەوە سەر سکە.

١٠.یارمەتیت دەدات وێنە گەورەکە ببینیت. کات بەڕێوەبردنێکی کاریگەر دیدێکی چاوی باڵندەت بۆ فەراهەم دەکات بۆ وەرزی خوێندنەکە. لەبری ئەوەی کە لە قافدا بگیرێیت کاتێك

کاتە سەرقاڵکەرەکان دێن، تۆ دەتوانیت لە پێشدا پلان دابنێیت- چەند هەفتەیەك پێشتر- کاتێك تۆ واجب و تاقیکردنەوەی گەورەت هەن لە زیاتر لە وانەیەکدا.

١١.یارمەتیت دەدات تا وێنە گەورەترەکە ببینیت. لە پێشەوە پلان دانان و زوو رێکخستنی کۆرسەکەت، رێگەت بۆ خۆش دەکات ئەوە ببینیت چۆن وانەکان لەگەڵ سەراپای ژیانی قوتابخانەت فیت دەبن.

١٢.یارمەتیت دەدات چۆن زیرەکانەتر سەعی بکەیت، نەك سەرسەختتر. دەشێ ئاسان بێ کە ئەوەندە بەپلان بیت، ئەوەندە لەگەڵ ئەولەویەتدا بیت، ئەوەندە لە کۆنترۆڵی کاتەکەتدا بیت کە بتوانیت کاتی کەمتر بە سەعییەوە سەرف بکەیت، نمرەی باشتر بێنیت و کاتی زیاترت بۆ شتەکانی تر هەبێ- چالاکییەکانی دەرەوەی مەنهەج، هیوایەتەکان، هەرچییەکی تر.

کات بەڕێوەبردن جادوو نییە، هەرچەندە وەکو شتێکی جادوویی دیارە.

لەوانەیە کاتی پێویست نەبێ بۆ هەموو شتێك

کاتێك پرسیارم لە کچە خوێندکارێکی سەرقاڵ کرد ئاخۆ هیوا دەخوازێت کاتی زیاتری هەبووایە، بە گاڵتەوە وتی، "خۆشحاڵم بەوەی ٢٤ سەعات لە رۆژێکدا هەیە. گەر لەوە زیاتر بووایە بەهانەم نەدەبوو بۆ ئەوەی بۆچی هەموو شتەکان ئەنجام نادەم!"

با هەواڵێکی خۆشت بدەمێ: رێگایەك هەیە بۆئەوەی کە بتوانیت لە کاتێکی کەمتردا دەستکەوتی زیاتر هەبێت. هەوڵی زۆریشی ناوێت. تۆ دەتوانیت لە پێشەوە پلان دابنێیت و ئیختیاری هۆشیارانە بکەیت لەبارەی چۆنێتی بەسەربردنی کاتەکەت و ئەمەی کە چەنێك کات بۆ هەر واجبێك بەسەر دەبەیت. تۆ دەتوانیت کۆنترۆڵی زیاترت بەسەر کاتەکەتەوە هەبێ نەك ئەوەی هەمیشە لێت ببرێت.

ئێستاش هەواڵی ناخۆش: دەبێ یەکەم هەنگاو بەرەو بەڕێوەبردنی کاتەکەت بڕیاردان بێت لەوەی چ گرنگە...و چی گرنگ نییە. هەرچەندە لەوانەیە قورس بێت، هەندێ جار پێویستە بزانین ئێمە بە راستی ناتوانین هەمووی بکەین، دەبێ ئەو چالاکییانەی کە ئەوەندە پڕمانا نین بۆمان لە خشتە قەرەباڵغەکەمان ببڕین بۆئەوەی بتوانین وزەیەکی زیاتر تەرخان بکەین بۆ ئەوانەی کە پڕمانان.

بەڵام کاتی پێویست هەیە بۆ پلاندانان

تەنانەت پاش دابەشکردنی پابەندییەکانمان، زۆربەمان کێشەمان هەیە لە بەجێگەیاندنی هەموو ئەو شتانەی پێویستمانە. ئاسان نییە وانەکان، کاتی سەعی، واجبەکانی کار، چالاکییەکانی دەرەوەی مەنهەج و ژیانی کۆمەڵایەتی بگونجێنیت.

ئەو پلانە رێکخراوەییەی کە من دەیخەمەڕوو بە شێوەیەکی تایبەت بۆ خوێندکاران دیزاین کراوە. چ ئەوەی کە لە قوتابخانەی ئامادەیی بیت، لە کۆلێژ بیت یان خوێندنی باڵا، یان خوێندکارێکی "تەقلیدی" بیت یان کەسێك بیت کە بڕیاری داوە پاش دابڕان بۆ ماوەیەك لە "جیهانی واقیعی" بگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە، بۆت دەردەکەوێ کە ئەمە بەرنامەیەکی بەڕێوەبراوە کە کاریگەرە بۆت.

ئەم پرۆگرامە رێگە بە نەرم و نیانی دەدات. لە راستیدا، من هانتان دەدەم تا هەر کام لە پێشنیارەکانم بە پێی پێداویستییە تایبەتییەکانی خۆتان بگونجێنن. ئەمە بەو مانایەیە کە چ ئەوەی لە بەشی ناوخۆییدا بژیت، لەگەڵ هاوڕێیەکت شوقەیەکت گرتبێت یان لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانتدا بژیت، کاریگەری هەیە بۆت.

ئامانجی ئەم بەشە یارمەتیدانتە بۆ هەڵبژاردنی ئەوەی کە بەلاتەوە گرنگە، دانانی ئامانج بۆ خۆت، رێکخستن و بە خشتەکردنی کاتەکەت و پەیداکردنی ئەنگێزە و خۆدیسپلینکردن بۆ پەیڕەویکردن لە خشتەکەت و گەیشتن بە ئامانجەکانت.

ئایا خۆشتر نییە کە بە راستی کاتێکی زیاترت هەبێ...لەبری ئەوەی کە هەمیشە لەوە رابمێنیت ئاخۆ هەمووی بۆ کوێ چوو؟ بۆئەوەی هەست بکەیت کەمێك کۆنترۆڵت بەسەر خشتەکەت، واجبی قوتابخانەت، ژیانتدا هەیە...لەبری ئەوەی کە لە مەوعیدێکەوە بۆ مەوعیدێکی تر، لە وانەیەکی بۆ وانەیەکی تر، لە واجبێکەوە بۆ واجبێکی تر هەڵبەزیتەوە، وەکو تۆپێکی سەرشێتی بلیارد؟

دەشێ رووبدات.

### هێڵی دەستپێکردن بناسەرەوە

تۆ ناتوانیت دەست بکەیت بە راکردن بەرەو ئامانجی سەرەنجامت تا ئەو کاتەی کە نەزانیت هێڵی دەستپێکردنت لە کوێیە. بۆیە یەکەم هەنگاوی پێویست بۆ بەزاندنی رۆتینی هەنووکەییت

ناسینەوەی ئەو رۆتینەیە بە چڕوپڕی. دوو رێگا هەن بۆ کردنی ئەمە و پێشنیار دەکەم هەردووکی بکەن.

یەکەمیان بەکارهێنانی ئەو خشتەیەیە کە لە خوارەوە هاتووە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەمەی کە بە راستی چەندێك کاتت لەبەردەستدایە بۆ سەعیکردن. ئەگەر بە روونی دیار بێت کە بەس نییە، کەواتە باشترە ئەوە هەڵسەنگێنیتەوە چەنێك کات لە هەر بوارێکدا بەسەر دەبەیت. لەوانەیە پێویست بکات لە سەعاتەکانی ئیشە نیوەکاتەکەت کەم بکەیتەوە، واز لە یانەیەك یان رێکخراوێك بێنیت، تەنانەت خشتەکەت بگۆڕیت بۆ کورتکردنەوەی رێگای بەرەو سەر کارت. بێگومان، ئەگەر تۆ لە رۆژێکدا دوو سەعات بەسەر دەبەیت بۆ "خۆ پۆشتەکردن" یان شەش سەعات بە خواردنەوە بەسەر دەبەیت، لەوانەیە چارەسەرەکە روونتر بێ.

دەبێ تۆ خۆت خشتەیەکی دووەم دروست بکەیت. لە ماوەی ١٥ خولەکدا، بنووسە کە رێك لە ئێستادا چەنێك کات بەسەر دەبەیت. لەکاتێکدا کە دەشێ سۆراخکردنی چالاکییەکانتان لە رۆژێك یان دوواندا بۆ هەندێ لە ئێوە بەس بێت، پێشنیار دەکەم بۆ ماوەی هەفتەیەکی تەواوە بیانخەنە خشتەوە، بە کۆتایی هەفتەشەوە.

ئەمە بەتایبەت گرنگە ئەگەر، وەکو زۆرێك لە خەڵکی، برە کاتێکی زۆرت هەبن کە لە رواڵەتدا بزر دەبن، بەڵام لە واقیعدا تەرخان کراون بۆ شتی وەکو "پشوودان" پاش ئەوەی لە خەو بێدار دەبیت، مەکیاج کردن یان تراش کردن، خوێندنەوەی رۆژنامە، چاوەڕوان بوون بۆ پاس، یان لێخوڕین بۆ قوتابخانە یان سەر کار یان گەڕانەوە لێیانەوە. ئایا دەتوانیت سەعاتێکی زیاتر یان دووان لە رۆژێکدا بەکاربێنیت، چ بۆ سەعیکردن یان بۆ چالاکییەکانی سەرگەرمی؟ بەکارهێنانێکی باشتر بکە لەو کاتە "مردوو"وە و تۆ هەموو ئەو کاتە دەدۆزیتەوە کە پێویستتە.

**کاتەکەت بۆ کوێ دەچێ؟**

| | سەعات/ ڕۆژ | ڕۆژ/ هەفتە | سەعات/ هەفتە |
|---|---|---|---|
| ژەمەکان | ________ | ٧ | ________ |
| (بە خۆئامادەکردن و خاوێنکردنەوەوە) | | | |
| خەوتن | ________ | ٧ | ________ |
| (بە سەرخەویشەوە) | | | |
| خۆپۆشتەکردن | ________ | ٧ | ________ |
| بە ڕێگاوە بۆ سەر کار یان لەوێوە | ________ | ٥؟ | ________ |
| ئیشە پێسپێردراوەکان | ________ | ٧ | ________ |
| چالاکییەکانی دەرەوەی مەنهەج | ________ | ________ | ________ |
| ئیشی تەواوکات یان نیوەکات | ________ | ________ | ________ |
| لەناو پۆلدا | ________ | ________ | ________ |
| چالاکییەکانی سەرگەرمی | ________ | ________ | ________ |

(کات بەسەربردن لەگەڵ هاوڕێیان، چوونەدەرەوە، تەماشای تەلەڤزیۆن، خوێندنەوەی بۆ خۆشی و هتد).

ستوونی یەکەم پڕ بکەرەوە، جارانی ستوونی دووەمی بکە، پاشان ئەنجامەکان لە ستوونی سێیەمدا کۆ بکەرەوە. لە هەفتەیەکدا ١٦٨ سەعات هەیە (٢٤×٧). تۆ هەنووکە چەنێکت جێ هێشتووە بۆ سەعی؟ تێبینی: هەر وەڵامێك کە ناقص بگرێتەخۆ، نیشانەیەکی خراپە.

فێربە چۆن فرەئەرکەکان لە هەمان کاتدا بەجێ بگەیەنیت: گوێ لە کتێبێك بگرە بە ئێم پی سری لەکاتێکدا کە ماڵ پاك دەیکەیتەوە، وشەکانی قاموس پراوە بکە یان کردە ماتماتیکییەکان بڵێرەوە لەکاتێدا کە ئۆتۆمبێل لێدەخوڕیت، یان با منداڵەکانت، دایك و باوکت، یان هاوژوورەکانت کویزت بکەن بۆ تاقیکردنەوەیەکی داهاتوو لەکاتێکدا کە خەریکی شتنی قاپەکانیت، گسکی کارەباییت یان سڕینەوەیت. هەمیشەش با ڕۆژژمێرەکەت، دەفتەری یادداشتە(کانت)، قەڵەمەکانت و کتێبێکی مەنهەجت پێ بێت– تۆ دەتوانیت بڕێکی یەکجار زۆر

خوێندنــەوە یــان ســەعی جێبــەجێ بکــەیت لەکاتێکــدا کــە لــە ریــزی بانکــدا وەســتاویت، لــە کتێبخانەیت، لە سوپەرمارکێتیت یان لە پاس یان تاکسیدایت.

ڕێنمایی سیتراتیژی: ئەو برگانە لە رۆژژمێـری رۆژانەتـدا بناسـەرەوە، ئەولەویەتەکـەیان هـەر پلەیەك بێت، کە دەتوانرێ لە ١٥ خولەك یان کەمتردا تەواو بکرێن. ئەمانە ئەرکە نموونەییەکانن کە دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکەیت لەو کاتە "مردوو"ەدا.

### ئەوەی کە پێویستتە کۆی بکەرەوە

لەکاتێکدا کە جەلەسەی پلاندانانەکەت دەست پێدەکەیت، دڵنیا بـەرەوە لـەوەی کـە هـەموو ئەو زانیاری و ماددانەت لایە کە پێویستتن بۆ دانانی پلانێکی کوالیتی. مەنهەجەکانی خوێندنت، خشتەی کارکردنت، بەروارەکانی بۆنە خێزانییە گرنگەکان، سەفەرەکان، گەشتەکان و پابەندییە کەسییەکانی تر (مەوعیدی دکتۆر، ئاهەنگەکانی لەدایکبوون و هیتر) و رۆژمێری هەر رووداوێکـی دەرەوەی مەنهەج کە تیایادا پلان بۆ بەشداری دادەنێیت کۆ بکەرەوە.

تەنیا دوو برگـە هـەن کـە تـۆ پێویـستتن بۆئـەوەی ببیتـە بـەپلانترین کەسـێك کـە تـا ئێـستا ناسیبێتت: رۆژمێرێکی پلاندانانی دوور مەودا کە بکرێ لە دیوار بـدرێ و رۆژمێرێکـی رۆژانـە کـە بتوانیت لەگەڵ خۆت هەڵیبگریت.

رۆیـشتن لەگـەڵ چـالاکییە رۆژانەییـەکانت- وانـەکان، مەوعیـدەکان، واجبـە رۆژانەییـەکانی ماڵەوە و کویزە رۆژانە یان هەفتەییـەکان- لـە بەشـێکی دواتـردا قـسەیان لەسـەر دەکرێـت. لـە ئێستادا، دەمەوێ قسە لەسەر ئەو پرۆژانە بکەم- راپۆرت یان بابـەت نووسـین، توێژینـەوەکان، سەعیکردن بۆ تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ و کۆتایی ساڵ و هیتر- کە پێ بـەپێی کـاتێکی درێـژ پێویستیان بە تەواوکردنە- چەند هەفتەیەك، لەوانەشە چەند مانگێك.

### رۆژمێری پلاندانانی دوورمەودات

پێویـست ناکـات رۆژمێـری تایبـەت بـە خـۆت دابنێیـت، هەرچـەندە بـە دڵنیاییـەوە ئەمـە هەرزانترین جێگرەوەیە. رۆژمێری حازربەدەستی دیوار یان سەر مێز هـەن لـە جۆرەهـا دیزاینـدا کە گونجاون بۆت. من پێشنیاری لانی کەم رۆژمێرێکـی سـێ مانگـە دەکـەم. بـە دڵنیاییـەوە تـۆ دەتوانیت رۆژمێری شەش مانگە و تەنانەت یەك ساڵی بەکاربێنیت.

تۆ ئەم ڕۆژمێرە بە بڕێکی زۆری وردەکاری پڕ ناکەیتەوە، ئەو بۆشاییانەی کە تۆ تیایاندا دەنووسیت پێویست ناکات گەورە بن. ئەم ڕۆژمێرە باسێکی گشتیی خشتەکەکە، جۆرێکە لە پوختەی "ژیان لە نیگایەکدا"ی ئەو بڕگە و مەوعیدانەی کە لە زیاتر لەهەفتەیەك ڕوودەدەن لە ئایندەدا. (ئەگەر لەم هەفتەیەدا ڕووبدەن، ئەوا لە ڕۆژمێری ڕۆژانەتدا دەبن).

بۆیە بە چوونەناو بەرواری هەر تاقیکردنەوەیەکی سەرەکی دەست پێبکە، کاتێك پرۆژەکان و توێژینەوە یان ڕاپۆرتەکان دێنە پێش، مەوعیدەکانی ئایندە (بەڵێ ئەمە تەنیا بۆ ئیشی قوتابخانە نییە)، و هەر شتێکی تر کە پێویستە بیرت بێتەوە. من لە یەکێك لە ڕۆژمێرەکان تاکە مانگێکم بەرهەم هێناوەتەوە کە دواتر دەیبینن. تێبینی ئەوە بکەن کە وردەکارییەکی کەم هەیە. ئەمە دیمەنێکە، بیرتە؟

رۆژمێری ڕۆژانەت

ئەمە جەوهەریترین ئامرازە کە بتوانیت بەکاری بێنیت و یەکێکە لەوانەی کە بەشێوەیەکی ڕەها پێویستە بەکاری بێنیت. دیزانێك بدۆزەرەوە کە بۆتۆ دەست دەدات. من ئەو یەك دوو دانەیەکی ئەخیرم بەلاوە باشە کە دوایی بەرچاوتان دەکەوێ. چ ئەوەی لە دەفتەرێکی یادداشتدا بێت یان دەفتەری پێکەوەلکاو بەهۆی تێلە بازنەییەکانەوە، ئەم دیزاینە تەواوی هەفتەکەت بە نیگایەك پیشان دەدات و زیاد لە پێویست بوارت پێدەدات بە چڕوپڕی بنووسیت. من ئەم هۆکارە بە بەس دەزانم بۆ خۆ دوورگرتن لەو دەفتەرانەی مەواعید کە بۆ هەر لاپەڕەیەك ڕۆژێکت دەدەنێ. لەوانەیە بوارێکی زۆر زیاترت بۆ بڕەخسێ بۆ نووسین، بەلام لەوانەیە زۆر خۆت بە پەڕە هەڵدانەوەوە سەرقاڵ بکەیت بۆئەوەی بزانیت بەیانی یان ڕۆژی دواتر چی ڕوودەدات.

لە ڕۆژمێرە پڕکراوەکەدا کە دواتر ئەیبینن، خوێندکارەکەمان– با بڵێین ناوی سوزانە– کارێکی زۆر باشی ئەنجام داوە. ئەو تەنیا واجبەکانی ماڵەوەی ڕیز نەکردووە. یەکەم، ئەو بە ئەولەویەتی کردوون– ئەلف، با، و جیمەکان لەلای ڕاستی خشتەکەوە.

پاشان ئەو، ئەو بڕە کاتەی خەمڵاندووە کە هەر یەکێکیان پێی دەچێت (لە ستوونی "کات"دا) و ئەمەیش کە لە واقیعدا چەندی خایاندووە (لە ستوونی "واقیع"دا). ئەو خولەکەکانی بەکارهێناوە بەلام تۆ دەتوانیت بەشێکی سەعاتێك بەکاربێنیت گەر بۆت ئاسانتر

بێت. هەر بڕێکی تێکڕای کات کە تۆ تەرخانی بکەیت، دەبێ نزیکی ئەو کاتە بێت کە تۆ بە ڕاستی لە بەردەستایە. ئەگەر تۆ بۆت دەرکەوت کە وەکو خوویەك کاتێکی زیاتر لە واجبەکاندا سەرف دەکەیت لەوەی کە دیاریت کردووە، "پەراوێزی یەدەك" بەکاربێنە بۆ خەملاندنەکانت. پاشان هەموو خەملاندنەکان کۆ بکەرەوە و دڵنیا بەرەوە لەوەی کە خشتەکەت تاوەکو ئەی سەر لە بەیانی دانەناوە!

دواجار سوزان، لە واجبی ماڵەوەی زیاتر خستووەتەناو خشتەکەوە– ئەو بیرهێنەرەوەی نووسیووە لەبارەی کڕینی میوە و سەوزە، ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییانەی کە دەبێ ئەنجامی بدات، پرۆڤەی باندەی مۆسیقییەکەی و کۆمەڵێك شتی تر.

بەهەمان شێوە پرۆژەی سپێردراو هەن کە بۆ ئەم هەفتەیە نین– نووسینی بابەتێکی ئینگلیزی، کویزێك لە ئەندازە، تاقیکردنەوەیەك لە مێژوو. سوزان کاتی داناوە بۆ هەڵبژاردنی ناونیشانێك بۆ ئەو بابەتە ئینگلیزییەی کە دەبێ بینووسێت، ڕەزامەندی مامۆستا بەدەست بێنێت و تەنانەت دەست بکات بە نووسینی توێژینەوە سەرەتاییەکەی. ئەو بەهەمان شێوە پلانی داناوە بۆ سەعیکردنی بۆ ئەندازە و مێژوو.

ئەو بەروارانەی کاتێك پرۆژەکانی ئایندە دێنە پێش و تاقیکردنەوەکانی داهاتوو لە ڕاستیدا دووجار تۆمار کراون– جارێکیان لە ڕۆژمێری ڕۆژانەیدا و جارێکی تر لە ڕۆژمێری دوورمەودایدا. بەڵام ئەو هەنگاوانەی کە پێویستن بۆ نووسینی بابەتەکەی و ئەو کاتەی کە پێویستیەتی بۆ دانانی بۆ سەعیکردن تەنیا لە ڕۆژمێری ڕۆژانەیدا هەن. (ئەمە یاسایەکی سەرسەختانە و خێرا نییە. بە دڵنیاییەوە دەتوانیت ئەو هەنگاوانەش بخەیتەناو ڕۆژمێری پلانی دوورمەوداش کە پێویستن بۆ پرۆژەکانی ئایندە. من پێم باشە لەگەڵ وردەکاریی زۆردا تێکەڵی نەکەیت).

بەداخەوە، سوزان لەوەدا کارێکی باشترینی نەکردووە بۆ بەرجەستەکردنی ئەمەی کە واجبی ماڵەوەی بە واقیعی چەندێك دەخایەنێت. ئەندازە هەمیشە کاتێکی زیاتری لێدەبات لەوەی کە بیری لێدەکاتەوە و ڕاپۆرتی تاقیگەی زیندەوەرزانییەکەی بە ڕوونی زۆر لەوە ئاڵۆزتر بوو کە چاوەڕێی دەکرد. ئەو پێنج سەعاتی تەواوی خستووەتەناو خشتەوە بۆ پرۆڤەی باندە مۆسیقییەکەی...بەڵام هەشت سەعاتی پێچوو، کە لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت نەیتوانیووە هیچ توێژینەوەیەکی سەرەتایی ئەنجام بدات بۆ بابەتی ئینگلیزییەکەی. ڕوونیش نییە کە ئاخۆ بەرنامەی "کاتی مەکیاجکردن"ی داناوە لەماوەی هەفتەی ئایندەدا.

ئەگەر تۆ بەم شێوەیە ڕۆژمێری ڕۆژانەت دابنێیت و بەکار بێنیت، ئەوا بە خێرایی درك بەوە دەکەیت کە ژیانتە. تۆ هەمیشە لەگەڵ خۆتا هەڵیدەگریت و بە مەرگێکی کارەساتبار دەمریت ئەگەر جێگۆڕکێی پێ بکەیت، یان خوانەخواستە، بزری بکەیت.

ڕۆژمێرە دوورمەوداکەت لەسەر دیوار یان مێزی ماڵەوەت بەجێ بهێڵە و ڕۆژمێری ڕۆژانەت بە خۆت بێت– بۆ هەموو شوێنێك. هەر کاتێك پرۆژەی نوێ، مەوعیدەکان، کۆبوونەوەکان و هیتر بوون بە بەرنامە، دەستبەجێ بیانخەرە ناو ڕۆژمێری ڕۆژانەتەوە. پاشان بەرواره سەرەکییەکان بگوازەرەوە بۆ ناو ڕۆژمێری پلاندانانی دوورمەودات.

بیرت بێت: ئەگەر ئەوە ئەرکێکی سادەیە کە بە دڵنیاییەوە لە ماوەی هەفتەیەکدا جێبەجێ دەبێت یان بۆنەیەك یان مەوعیدێکە کە لەو هەفتەیەدا ڕوودەدات ئەوا پەیوەندی هەیە بە ڕۆژمێری ڕۆژانەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر ئەرکێك کە ئاڵۆزە– پێویستی بەوەیە زیاتر دابەش بکرێت بۆ هەنگاوە دیاریکراوەکان– و/یان ئەوەیانە کە پێویستی یە زیاتر لە هەفتەیەك هەیە بۆ تەواوبوون– بەرواری چاوەڕوانکراو دەبێ بخرێتە ناو ڕۆژمێری دوورمەودات، پاشان دەبێ تاکە هەنگاوەکان بخرێنەسەر ڕۆژمێری ڕۆژانەت.

یەکەمین مەوعید لەگەڵ...خۆت دابنێ

بۆئەوەی هەر سیستەمێکی کات بەڕێوەبردن کار بکات، دەبێ بە بەردەوامی بەکار بهێنرێت. پێش ئەوەی بەرەوپێش بچیت، مەوعیدێك لەگەڵ خۆتدا دابنێ بۆ کۆتایی هەفتە بۆئەوەی دانیشیت و پلان دابنێیت بۆ هەفتەی دواتر. پێویست ناکات کاتێکی زۆر بەسەر ببەیت– لەوانەیە نیوسەعات هەموو کاتەیە کە پێویستە بۆ چاوپێداخشاندنەوەی پابەندییەکانت بۆ هەفتەکە و خشتەی کاتی پێویستی سەعیکردن ڕێکبخە.

سەرباری کورتییەکەی، لەوانەیە ئەمە باشترین کات بێت لە هەموو هەفتەکەدا بەسەری دەبەیت، چونکە بە درێژایی هەفتەکە و دوورتریش، سوودەکانی دەچنیتەوە!

یەکەم، هەر شتێك بناسەرەوە کە پێویستە ئەم هەفتەیە بیکەیت کە هێشتا لە ڕۆژمێری ڕۆژانەتدا نەنووسراوە. سەیری ڕۆژمێری دوورمەودات بکە بۆ دیاریکردنی ئەمەی چ ئەرکێك پێویستە ئەم هەفتەیە تەواو بکرێت بۆ هەموو پرۆژە گەورەکانی قوتابخانەت. هەر ئەرکێکی

زیادە بخەرەناو کە پێویستە ئەنجام بدرێن- هەر لەناردنی دیاریی یادی لەدایکبوون تا سەردانی خوشکەکەت بۆ ماڵتان و تا تەواوکردنی ئەو واجبەی کە لەوانەیە تازە پێت سپێردرابێت.

بیرت بێت کە هەر پرۆژەیەکی دوورمەودا یان قورس بەش بەش بکەیت بۆ ئەرکی بچوک کە بتوانرێ بخرێنە ناو خشتەکەتەوە. هەروەکو هێنری فۆرد وتی "هیچ شتێك بەشێوەیەکی دیاریکراو قورس نییە ئەگەر دابەشی بکەیت بۆ ئیشە بچوکەکان". بۆیە بەرهەمێکی سەرەنجام دەبێ.

هەر کە لیستەکەتت دروست کرد، دەتوانیت بچیتە سەر هەنگاوی دواتر- دانانی ئەرکەکان بە ریزبەندیی گرنگی.

ئەرکەکانت بە ئەولەویەت بکە

کاتێك تۆ دادەنیشیت بە بێ پلان سەعی بکەیت، تەنیا خۆت دەخەیتە ناو ئەو یەکەم پرۆژەیەی کە بە مێشکدا دێت. گرفتی ئەم مامەڵەکردنە پێشتر قسەی لەسەر کراوە: گرەنتییەکی کەم هەیە لەمەڕ ئەوەی یەکەم شت کە بە مێشکتدا دێ گرنگترینیان بێ.

ئەگەر تۆ بۆت دەرکەوت بیرت دەچێ داتا لە رۆژمێری دوورمەوداوە بۆ رۆژمێری رۆژانە بێنیت و ببەیت (یان بە پێچەوانەوە)، یان پێویستت بە یارمەتی زیاتر بێت بۆ لەبەرچاوگرتنی ئەرکە هەرە گرنگەکان، (پەڕەی ئەولەویەتی ئەرك) ئامرازێکی ترە کە دەتوانی بەکاری بێنیت. تاکە ئامانجی بریتییە لە یارمەتیدانت تا ئەرکەکانت بە گوێرەی گرنگی رێك بخەیت (نەك رێکیان بخەیت- ئەمە کاری رۆژمێرەکەتە). بەم شێوەیە، تەنانەت ئەگەر بۆت دەربکەوێ کاتی پێویستت نییە بۆ هەموو شتێك، دەتوانیت لانی کە واجبە هەرە گرنگەکان تەواو بکەیت. تۆ ناتوانیت بەشێوەیەکی کاریگەر لەگەڵ ئەولەویەتەکانی ئەمڕۆدا مامەڵە بکەیت ئەگەر مێشتا لەگەڵ ئەوانەی دوێنێدا ...یان ئەوانەی هەفتەی رابردوودا! لە ململانێدا بیت.

یەکەم، ئەم پرسیارە لە خۆت بکە: "ئەگەر لەم هەفتەیەدا تەنیا بتوانم هەندێ شت بکەم، دەمەوێ ئەو شتانە چی بن؟" ئەم ئەرکە ئەولەویەت بەرزانە بە "ئەلف" نیشانە بکە. پاش ئەوەی برگە "زەرووری"یەکانت ناسییەوە، ئەو ئەرکانە دابنێ کە کەمترین گرنگییان هەیە — ئەو برگانەی کە دەتوانن چاوەڕێ بن تاوەکو هەفتەی دواتر، ئەگەر پێویست بکات. (لەوانەیە

ئەمە ئەو ئەركانە بگریتەوە كە زۆر گرنگن بەلام پێویست ناكات لەم هەفتەیەدا تەواو ببن).
ئەمانە برگەی ئەولەویەتی نزمن، لانی كەم بۆ ئەم هەفتەیە- ئەمانە بە "جیم" نیشانە بكە.
هەموو برگەكانی تر دەكەونە شوێنێك لەنێوان ئەركە گرنگەكان و ئەوانەی كە ئەولەویەتی نزمیان هەیە. ئەو برگانەی كە دەمێننەوە چاو پێدا بخشێنەرەوە. ئەگەر دلنیایت كە هیچ كامیان بەشێوەی دیاریكراو ئەولەویەتی نزم یان بەرزن، وەكو ئەولەویەتی ناوەند "ب" ریزبەندییان بكە.
رێنمایی ستراتیژی: ئەگەر تۆ هەمان برگەی ئەولەویەت نزم رۆژ لەدوای رۆژ، هەفتە دوای هەفتە بەلاوە بنێیت، دەبێت لە ساتێك لە ساتەكاندا تەنیا بوەستیت و بریار بدەیت ئاخۆ ئەم ئەركە لە بنەرەتدا پێویستە بە ئەنجامدانە! ئەمە رێگەیەكی ستراتیژییە بۆئەوەی وابكەیت ئەرك یان كێشەیەك "بزر ببێت". لە جیهانی بزنسدا، هەندێ لە بەرێوەبەران بە مەبەست خۆیان لە رووبەرووبوونەوە لەگەل ژمارەیەك كێشەدا بەدوور دەگرن، چاوەرێ دەكەن ببینن ئاخۆ خۆیان خۆیان چارەسەر دەكەن لە رێگەی فەرامۆشكردنێكی بێ زیانەوە. ئەگەر ئەمە لە بزنسدا كرداری بێت، دەكرێ لە قوتابخانەشدا كاریگەر بێت. (بەلام ئەگەر بۆت دەركەوت بە بەردەوامی "جیم" یان تەنانەت "ئەلف" لە رۆژێكەوە بۆ رۆژێكی تر دەگوازیتەوە، سیستەمەكەت هەلسەنگێنەوە. شتێك شكێنراوە).
لە لاپەرەكانی دواییدا، پەرەیەكی ئەولەویەتی ئەرك بە پركراوەیی وەكو نموونە هاتووە.
ئایا كاتی ئەوەت بەسەر بردووە ئەوە بخەملێنیت هەر ئەركێك چەنێكی دەوێت و بۆچوونەكانت دەستكاری بكەیت كاتێك روونە هەندێ لە ئەركەكان هەمیشە كاتێكی زیاتریان دەوێ لەوەی كە بیری لێ دەكەیتەوە؟ زۆرباشە! سەیری ئەم رێگایە بكە بۆ بەكارهێنانی ئەم خەملاندنە وەكو پالنەرێكی گەورە: لەبری نووسینی ئەمەی كە هەر ئەركێك چەنێكی دەوێت، ئەو كاتە بنووسە كە نیازتە تەواوی بكەیت. جیاوازییەكە چییە؟ ئێستا ئەمە بووە بە ئامانجێك. لەوانەیە ئەمە تەنیا سوكترین فشارت بخاتەسەر، وات لێبكات كەمێك سەختتر كۆشش بكەیت بۆ تەواوكردنی لە كاتی خۆیدا.
تۆ دەتوانیت ئەم تەكنیكی ئامانج دانانە قولتر بكەیتەوە. ئەو كاتانە بنووسە كە تۆ پێشبینی دەكەیت هەر لاپەرەیەكی ١٠ لاپەرەی واجب تەواو دەكەیت، یان هەریەك لە ٢٠ پرسیاری

ماتماتیك كە دەبێ تەواویان بكەیت. دانانی ئەو ئامانجە بچوكانەی كات پاڵنەرێكی گەورەیە و ڕێگایەكی نایابە بۆ زیادكردنی تەركیزت و كەمكردنەوەی هۆش پەرتبوون.

...و بیریشت نەچێت

سەرباری گرنگیی ئەو ئەركە و ئەو كاتەی كە لەبەردەستتدایە بۆ تەواوكردنی، فاكتەری تر رۆڵیان هەیە لە چۆنێتی جێكردنەوەی هەر شتێك لە كاتی بەردەستدا. هەندێ لە فاكتەرەكان لە دەرەوەی كۆنترۆڵی ئێمەدان- خشتەی كارت، مەوعیدەكانت لەگەڵ مامۆستاكاندا، یان دكتۆرەكاندا. بەڵام برێكی زۆر فاكتەر هەن كە تۆ بەسەریان زاڵیت و دەبێ لەبەرچاویان بگریت كاتێك هەر هەفتەیەك رۆژمێرەكەت دادەنێیت.

بەرنامەی كاتی پێویست دابنێ بۆ هەر ئەركێك- كاتی "گەرمداهاتن" و بەجێگەیاندنی ئەركەكە، بەڵام، بەتایبەت كاتێك كە ئیش لەسەر پرۆژە دوورمەوداكان دەكەیت، ئەوەندە كاتە نا كە "برستت لێببڕێت". هەر تاكەكەسێك جیاوازە، بەڵام زۆربەی خوێندكاران لە مەودای ٣٠- ٤٥ خولەكدا بە باشترین شێوە سەعی دەكەن.

زۆر ئیشی لەسەر مەكە. بە پێی برەكانی كات پلانی سەعی دابنێ، كاتەكانی كاركردن لەگەڵ چالاكیە سەرگەرمییە كورتەكاندا دابەش بكە. (پارمەتیدەرە كە ئەمانەش بخەیتە ناو خشتەكەتەوە). بۆ نموونە، تۆ سێ سەعاتت بۆ پاش نیوەڕۆی چوارشەممە بۆ ئەو واجبەی توێژینەوە داناوە. بەرنامەی پیاسەیەكی ١٥ خولەكی دابنێ بۆ كڕینی ئایس كریم لە دوكانیكی ئەو دەوروبەرە لە نێوەندی ئەو برەكاتەی سەعیكردندا. بۆت دەردەكەوێت كە ئەم ناوبڕانە یارمەتیت دەدەن روونتر و ئەفرێنەرانەتر بیر بكەیتەوە كاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ سەر سەعی.

تەنانەت ئەگەرچی تۆ حەزت لە برەكاتی زیاتری سەعی بێت، وریابە لەبارەی بەرنامەدانانی "ماراسۆنەكان"ی سەعی- شەش یان هەشت سەعات پشوو نەك زنجیرەیەك لە یەك یان دوو سەعات سەعیكردن. چەندەی بەرنامەی ماوە درێژ دابنێیت، ئەوەندەش ئەگەری زیاترە پێویست بكات شەڕ لەگەڵ دێوەزمەكانی تەمبەڵی و هۆش پەرتبووندا بكەیت. ئەگەر قەناعەت بێنیت بە خۆت بەوەی كە تۆ بە راستی لە ناخی دڵتەوە سەعی دەكەیت، بەلاتەوە ئاسانتر دەبێ هۆش پەرتكەرە كات بەفیڕۆدەرەكان، بەرنامەدانانی ناوبڕی درێژتر و دەستبەرداربوون زۆر پێش ئەوەی پێویست بكات، پاساو بدەیت.

دواجار، یاسای (پارکینسن)ت لەبیر بێت: "کار فراوان دەبێت بۆئەوەی کاتی بەردەست بۆ تەواوکردنی پڕ بکاتەوە". بە دەربڕینێکی تر، ئەگەر تۆ نەتونایت بەرنامەی بڕە کاتێکی یەك سەعاتی دابنێیت بۆ پرۆژەیەك کە دەبێ یەك سەعات بخایەنێت، لەوانەیە سەرت بسوڕمێت لەوەی بۆت دەرکەوێ (ئەرەوەڵا!) بە جۆرێك لە جۆرەکان دوو یان سێ سەعاتی پێدەچێ!

ڕێنمایی ستراتیژی: خووی ئەوە پەیدا بکە کە بۆ ڕۆژی دواتر خۆت ئامادە بکەیت بەر لەوەی شەوی پێشتر بچیتە ناو پێخەف. بڕوام پێبکە، هەستێکی یەکجار بێ وێنەیە کە ڕۆژەکە بەشێوەیەکی تەواو پلان بۆدانراو دەست پێبکەیت...بەتایبەت ئەگەر زیاد لە سنوور خەوتبیت!

بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە بەشێوەیەکی کاریگەر

بیرکەرەوە هەن، ئەنجامدەریش هەن. ئەوانەش هەن کە بیرێکی زۆر لە ئەنجامدان دەکەنەوە. هەرکە پەیت برد بەو خوو و ڕێسایانەی کە بۆ تۆ گونجاون، بەردەوام بە لە بەکارهێنان و گەشەپێدانیان. بایی پێویست نەرم بە بۆ زیادکردنی ئەو تەکنیکانەی کە تۆ لەوانیتر فێریان دەبیت و ئەو خشتە و بەرنامانە بگۆڕە کە بارودۆخ لە کەڵکی خستوون.

بەپێی خشتەکەت، ئامانجەکانت و لێهاتووییت پلان دابنێ، نەك "ستاندارد"ێکی تەمەن کورت. ئەو کاتە تەرخان بکە کە پێت وایە پرۆژەیەك بۆ تۆ دەیخایەنێ، نەك ئەو کاتەی کە لەوانەیە کەسێکی تر بیخایەنێ یان ئەوەی کە مامۆستاکەت دەڵێ دەیخایەنێ. هەوڵ بدە واقیعی و ڕاستگۆ بیت لەگەڵ خۆتدا کاتێك ئەو شتانە دیاری دەکەیت کە پێویستیان بە هەوڵی زیاترە یان ئەوانەی کە ئاسانترن بۆت.

هەرکاتێك گونجا، بەرنامەی چالاکییە خۆشەکان بخەرە پاش کاتی سەعیکردن، نەك پێش. ئەمانە ئەو کاتە دەبنە هاندەر، نەك هۆش پەرتکەر.

لە ماوە مەعقولەکاندا چاودێری بەرەوپێشچوونت بکە و لە هەرکوێیەك پێویستە گۆڕانکاری بکە. ئەمە ڕەچەتەی سەعیی تۆیە– تۆ بەرهەمت هێناوە، تۆش دەتوانی بیگۆڕیت. ئەگەر بۆت دەرکەوت کە تۆ بە بەردەوامیی کاتی زیاتر لەوە دادەنێیت کە پێویستە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکێك، بەو پێیەش خشتەی ئایندەش بگۆڕە.

کاتێك واجبەکان هاتنە ناو ڕۆژمێرەکەتەوە، دڵنیا بەرەوە لەوەی تۆش ئەو بڕگانە زیاد دەکەیت کە پێویستن– تێکستەکان، کتێبی تر کە دەبێ بیانکڕیت، وەریانبگریت، یان لە کتێبخانە بیانهێنیت و کەرەستەی وەکو کاغەزی هێڵکاری، ماجیکی فۆسفۆر و هیتر.

دەشێ تۆ بڕیار بدەی کە ڕۆژمێرەکەت بۆ ئامادەکردن ڕەنگ دەکەیت- بۆ نموونە، سوور بۆ ئەو واجبانەی کە پێویستە لەو هەفتەیەدا تەواو بکرێن، شین بۆ هەنگاوەکانی ڕووەو واجبە دوورمەوداکان، زەرد بۆ مەواعید و کاتی کەسی، سەوز بۆ وانەکان- ئەمە بۆتی ئاسانتر دەکات تا بە سەرنجێك بزانیت پێویستە چ بکەیت و چ کاتێك بیکەیت.

ئەم ئامرازانە بۆ بەکارهێنانی خۆت بگونجێنە. هەر شتێك تاقی بکەرەوە کە پێت وایە دەشێ کاریگەر بێت- بەکاری بێنە ئەگەر وایە، وێڵی بکە ئەگەر وانییە.

یەکەم جار ئەو ئەرکانە ئەنجام بدە کە بە کەمترین شێوە دڵپەسەندن (سەعی لە واجبەکان، پرۆژەکان یان هەر شتێکی تر)- هەستێکی خۆشت لادروست دەبێت کە لەسەر ڕێگاکەت لاتبردوون! و پلانی ئەوە دابنێ کە چۆن ئەوەندەی بکرێ بە وردی تەواویان بکەیت. بەم شێوەیە خێراتریش لێیان دەرباز دەبیت.

ئەرکێك تەواو بکە پێش ئەوەی بچیتە سەر دانەیەکی تر- شت بەجێ مەهێڵە.

ئەگەر بۆت دەرکەوت کە لە زنجیرە پرۆژە یان ئەرکێکدا لەوە خێراتر کە چاوەڕوانت دەکرد دەجوڵێیت، بێگومان هیچ عەیبێك تیا نییە کە بەرەو بەشی دواتری واجبەکە بڕۆیت یان بچیتە هەنگاوی دواتری پرۆژەکەوە.

ئەگەر دواکەوتوویت، مەترسە. تەنیا خشتەکەت ڕێك بخەرەوە و کاتی پێویست بدۆزەرەوە بۆ قەرەبووکردنەوە.

شتەکان بنووسە. پێویست نەکردنی بیرهاتنەوەی هەموو ئەو بڕگانە، بۆشایی دەهێڵێتەوە لە مێشکتدا بۆ ئەو شتانەی کە پێویستە تەرکیزیان بخەیەسەر یان پێویستە بیرت بێنەوە.

فێربە هۆش پەرتکەرەکان بەڕێوە ببەیت. هەروەکو وتەیەکی پەیوەست بە کات بەڕێوەبردن دەڵێت "کاردانەوەت نەبێ بەرانبەر شتی زەروور و شتی گرنگ لەبیر بکەیت". دەشێ هەندێ لەو شتانەی کە دەیانکەیت هەرکاتێك بێ تاو بدرێن و دابنرێن. وریابە لەو ئەرکە کات بەر و ئاڵۆزانەی کە هەر دەستیان پێکرد، داوای تەواو بوون دەکەن. پچڕان لە هەر ساتێکدا دەشێ بە مانای ئەوە بێت هەمووی سەرلەبەر دەست پێبکەیتەوە. دەبێ ئەمە چ کات بەفێرۆدانێك بێت!

ئەگەر تۆ خەریکی نووسینیت و لەکاتێکدا کە زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەدات مێشکت دەوەستێ (و تۆ دەزانیت کە لەو کەسەوەیە کە تەواوی ئەو هەفتەیە چاوەڕێی دەکەیت)، خولەکێك وەربگرە بۆئەوەی لانی کەم ئایدیاکانت بنووسیتەوە.

هیچ شتێك ناشێ ئەوەندەی لەدەستدانی تەركیزت دژەئەنجامی هەبێت، بەتایبەت لە ساتە هەستیارەكاندا. فێربە خۆت بپارێزیت لەو دوژمنانەی كە ڕەوگەكەت دەگۆڕن و بەم شێوەیە گەشتەكەت ڕێك و پێكتر دەبێ.

ڕێگایەك بۆ خۆپاراستن لە بەرانبەر ئەو پچڕینەرە ئەقڵییانەدا زانینی كاتی سەعیكردنت و پلاندانانە بەم پێیە. هەریەكێك لە ئێمە لە كاتی دیاریكراوی ڕۆژ (یان شەو) پڕاوپڕتر ئیش دەكەین. بزانە تۆ لەسەر چ جۆرە كاتێكی سەعیكردنیت و لەو ماوەیەدا بەرنامەی سەعییەكەت ڕێك بخە.

وریا بە لە میوانە بانگهێشت نەكراوەكان و هەموو پەیوەندییە تەلەفۆنییەكان: ئەگەر ئامادە نەبیت بۆ ناوبڕێك، ئەوان تەنیا لە خشتەكە پەرتت دەكەن. دوژمنی تەموموژاویتر بریتین لە ئارەزووی لەپڕ بۆ تیژكردنی نوكی هەر قەڵەمێك كە لە ماڵەكەدا هەیە، زەنگێكی نەبیستراو بۆ پاك كردنەوەی ناو ژوورەكەت، ئۆفەرێك بۆ ئەنجامدانی واجبی ماڵەوەی خوشكەكەت– هەر شتێكی تر كە لە ئیشەكەت دوورت خاتەوە. ئەگەر تۆ پێت وابوو خەریكی كردنی هەر شتێكیت جگە لە ئیشی خۆت، یان دەستبەجێ ناوبڕێك وەربگرە یان خۆت بگرە و بگەڕێرەوە سەر ئیش. خۆدیسپلین كردنیش خوویەكی فێربوونە كە پێ بەپێی پرۆڤە ئاسانتر دەبێ.

كرداری سادەی وتنی نا ( بۆ ئەوانیتر یان بۆ خۆت) یارمەتیدەرە بۆ پارێزگاریت لەم پچڕانە ناپێویست (و قابیلی دواخستن)انە. بیرت بێت، ئەوەی كە تۆ سۆراخی بەدەستهێنانی دەكەیت تەنیا كات نییە– بەڵكو كاتی كوالیتییە. نیشانەی "ئیزعاج مەكە" هەڵواسە و پێیەوە پابەند بە، گرنگ نییە چ شتێك سەر دەكاتە سەرت.

ئەگەریش خشتەكەت كاركردن لەگەڵ ئەوانیتر دەگرێتەخۆ، پێویستە ئاراستەگیرییان بۆ كات لەبەرچاو بگریت– لەوانەیە بۆت دەركەوێ كە بەرنامەی "كاتی چاوەڕوانی" بۆ هاوڕێیەكت دابنێیت كە بە دواكەوتن درەنگ ئامادەبوون ڕاهاتووە...و هەمیشە با كتێبێكت پێ بێت.

### تێبینییەكی تایبەت بۆ هاتوچۆكەرانی شوێنی كار

ئەگەر تۆ لە ماڵەوە دەژیت (وەكو پێچەوانەیەكی ژیان لە بەشی ناوخۆیی)، هەندێ فشاری تایبەت هەن كە دەبێ ڕووبەڕوویان بیتەوە.

لەوانەیە بڕینی ڕێگات بەرەو قوتابخانە درێژتر بێت لەو كاتەی كە لە پێخەف دێیتە دەر و بەرەو پۆل دەكەویتە ڕێ. بە دڵنیاییەوە ئەمە پێویستی بە كەمخەویی زیاترە، تەنانەت

ئەگەرچی تەنیا پێویست بکات خۆت بکەیت بە پاسەکەدا (بەڵام بەتایبەت ئەگەر تۆ خۆت شۆفێر بیت!). بەتایبەت گرنگە کە کاتی گەشتەکەت کەم بکەیتەوە، بایی پێویست پلان دابنێیت بۆ زیادکردنی بەکارهێنانت بۆ بەشەکانی حەرەمی زانکۆ بەبێ بەرنامەدانان بۆ گەڕانەوەیەك بۆ ماڵەوە لەو نێوانەدا.

لەکاتێکدا کە کەس حەزی لەوە نییە بە باران، باوبۆران یان بەفر بچێتە کلاس- لەوانەیە جگە لەوانەی لە ئایندەدا دەبنە پۆستەچی- هەمیشە ئاسانترە کە چەندسەد مەترێك بە درێژایی شۆستەیەکی درەختاوی بڕۆیت نەك ئەوەی کە چەند کیلۆمەترێك لە کەش و هەوای ناخۆشدا بە ئۆتۆمبێل تەی بکەیت. کاتێك بەرنامەی هاتوچۆی شوێنی کارەکەت دادەنێیت، گرفتەکانی کەش و هەوا لەبەرچاو بگرە.

خودی کرداری ژیان لە ماڵەوە- چ ئەوەی کە منالێت یان "هاوسەرگیریت کردووە و منالت هەیە"- بەرپرسیارێتی بۆ ئەوانیتر لەگەڵدایە کە دەتوانیت لە بەشی ناوخۆییدا کەمی بکەیتەوە. ئامادە بە بۆ تەرخانکردنی کات بۆ ئەم بەرپرسیارێتییانە و بیانخەرەناو خشتەکەتەوە. ئەگەر لە ماڵ بژیت ئەم شتانە حەتمین.

## گرنگترین ١٥ خولەکی ڕۆژەکەت

١٥ خولەکی ڕۆژانە بەلاوەنێ بۆ چوونەوە بەسەر ئەولەویاتی ڕۆژانە و هەفتانەت. لەکاتێکدا کە زۆرێك لە بزنسمانەکان حەز دەکەن ئەمە بکەنە یەکەم ١٥ خولەکی ڕۆژەکەیان، من پێشنیار دەکەم بیکەنە دوایین ١٥ خولەکی ڕۆژەکەتان. بۆچی؟ سێ هۆکاری گەورە هەیە:

١.ئایدیاکانت تازەتر دەبن. وا ئاسانترە کە ئەوەی بە دەستت هێناوە...و بەدەستت نەهێناوە، لە کۆتایی ڕۆژەکەدا شی بکەیتەوە.

٢.ئەمە ڕێگایەکی بێ وێنەیە بۆ کۆتایی هێنان بە ڕۆژەکە. تەنانەت ئەگەرچی "ڕۆژی سەعیکردن"ەکەت لە ١١ی شەودا کۆتایی بێت، هەست دەکەیت بە تەواوی ئامادەیت بۆ ڕۆژی دواتر و ئامادەیت پشوو بدەیت و ئارامیت.

٣.بەیانیی دواتر بە سەرەتایەکی مەزن دەست پێدەکەیت. ئەگەر تۆ بەیانییەکە بەکاربێنیت بۆ پلاندانان، ئاسانە کە دانیشتنی پلاندانانی ١٥ خولەکی بکەیتە سەعاتێکی بێ ئامانجی

"بیرکردنەوە". لەکاتێکدا کە ئەوانیتر لە هاتن و چووندان بۆ کوپێک قاوە، تۆ دەستت پێکردووە و لە ئیشدایت!

**رۆژمێری دوورمەودا (نموونەی پڕکراوە)**

**مانگ: کانوونی دووەم**

| شەممە | یەکشەممە | دووشەممە | سێشەممە | چوارشەممە | پێنجشەممە | هەینی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
| | وەرگرتنەوەی بابەتی رەشنووس لەبارەی جەنگی سارد | | | کویزی وشەکاریی ئینگلیزی | سەردان | درێژەی سەردان |
| ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ |
| | تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵی عەرەبی | تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵی ئەندازە | تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵی مێژوو | | | |
| ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ | ١٩ | ٢٠ | ٢١ |
| | | | | | چوون بۆ تەماشاکردنی پاڵەوانێتییەکە | درێژەی دەبێ |
| ٢٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ | ٢٧ | ٢٨ |
| | | دوو بەشی یەکەمی پرۆژەی ئینگلیزییەکە | | کویزی وشەکاریی عەرەبی | چوون بۆ تەماشاکردنی پاڵەوانێتییەکە | درێژە |
| ٢٩ | ٣٠ | ٣١ | | | | |
| | | | | | | |

## پەڕەی ئەولەویەتی ئەرك (نموونەی پڕكراوە)

| پلەبەنـــدیی ئەولەویەت | خشتە | ئەركە ئەولەویەتەكان لەم هەفتەیەدا هەفتەی ٢٨\١٣ تاوەكو ٣\١٤ |
|---|---|---|
| نووســـــینی بابەتەكـــــــەی كۆمەڵناسی | | |
| گـــەڕان لـــە كتێبخانەدا | ئەلف | |
| نووســــــینی پوختە | ب | |
| ڕەشنووس | جیم | |
| | | |
| واجبـــەكاتی ماتماتیك | | |
| بەشی چوارەم | ئەلف | |
| بەشی پێنجەم | ب | |
| سەعیكردن بۆ تاقیكردنەوە | ب | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |

## ڕۆژمێری ڕۆژانە (نموونەی پڕکراوە)

**کانوونی دووەم**

| ٢٠ی مانگ | شەممە | کات | واقیع | ئامانجەکان |
|---|---|---|---|---|
| ئەلف ئەندازە پرسیارەکانی ٢٤–٤٢ ئامۆن | | ٤٠ | ٦٠ | شیر و هێلکە بکڕە |
| ئەلف مێژوو بەشی سێیەم بخوێنەرەوە | | ٣٠ | ٤٠ | واجبی ماڵەوەت بیر نەچێ! |
| ئەلف زیندەوەرزانی راپۆرتی تاقیگەکە تەواو بکە | | ٦٠ | ٢٥ | |
| بەشی ٨ بخوێنەرەوە ٣٠ | | ٢٥ | | |
| جیم ناونیشانی ئینگلیزی هەڵبژێرە | | ٢٠ | ١٥ | |
| سەرێکی مامۆستا بدە | | ١٠ | ١٠ | |
| | | | | |
| ئەلف بەیانی جلی وەرزشی لەگەڵ خۆت بێنە | | | | |
| ب ڕێك پاش وانەکە تەلەفۆن بۆ سۆزان بکە | | | | |
| ئەلف ٧ی ئێوارە پرۆڤەی مۆسیقات هەیە | | ١٢٠ | ١٨٠ | |

## بەشی پێنجەم

# چۆن لە ناو پۆلدا لێهاتوویی پەیدا بکەیت

نمرەکانت هەرچەندێك بن، لە هەر پۆل و ئاستێکی خوێندندا بیت، ئامانجی پیشەی سەرەنجامت هەرچییەك بێ، هەموومان شتێکی هاوبەشمان هەیە: ئەزموونی ناو پۆل.

زۆربەی مامۆستایان زەمینەی ناو پۆل وەکو دەرفەتێك بەکاردێنن بۆ باق و بریفکردن و لێکدانەوەی ئەو ماددەیەی کە لە تێکستەکە و واجبەکانی تردا هاتووە. ئەگەر تۆ هەمیشە پێش وانەکە واجبەکانی خوێندنەوەت تەواو بکەیت، دەەتوانیت کاتی پۆلت تەرخان بکەیت بۆ ئەو ماددە نوێیەی مامۆستا دێتە سەری.

### پێویستە کلاسێکت هەبێت

کتومت چۆن ئەو شارەزاییەتییانە بەکاردێنیت کە ئێمە لەم بەشەدا قسەیان لەسەر دەکەین، دوو فاکتەر کاریگەرییان لەسەری هەیە: جۆری رێکخستنی ناو پۆل و ئەو شێوازە دیاریکراوانەی لەلایەن هەریەکێك لە مامۆستاکانتانەوە پیادە دەکرێن.

هەریەك لەم رێکخستنە گشتییانەی ناو پۆل ئەوە دەخوازن کە تۆ گۆڕانکاری بکەیت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانت.

### محازەرەکان: مجامەلەکانی سەر مینبەر

محازەرە بێگەردەکان لە ئاستی کۆلێژدا زۆر باون، بەڵام بە دەگمەن لە ئاستی قوتابخانەی ئامادەییدا هەن. لەوانەیە هۆڵەکانی محازەرە لە کۆلێژە گەورەترەکاندا پڕ ببن لە سەدان

خوێندکار بۆ بۆ هەندێ لە کۆرسە زۆر باوەکان ( یان وانەکانی ناساندن، بەتایبەت لە رشتەکانی زانستدا).

جەختکردنەوەی سەرەکی: گوێگرتن، نووسینەوەی تێبینی.

مشتومڕەکان: کاتی ئەوە هاتووە بدوێیت

بەهەمان شێوە وانە مشتومڕئامێزەکان (تیوتۆریاڵ) و سیمیناریشی پێ دەوترێ، گروپەکانی مشتومڕ جارێکی تر لە ئاستی کۆلێژدا باون، زۆرجار وەکو پاشکۆی کۆرسەکان فەخر بە بەشداریی بەرفراوانەوە دەکەن. خشتەیەکی هەفتانە بۆ کۆرسێکی وەها دەشێ پێکبێت لە دوو محازەرە و گروپێکی مشتومڕ یان زیاتر. ئەم گروپانەی مشتومڕ کە بەزۆری لەلایەن یاریدەدەرانی وانەبێژی خریج سەرپەرشتی دەکرێن، خوێندکاری کەمتر دەگرنە خۆ- زۆرجار لە بیست کەس زیاتر نییە- و زۆرجار دەرفەتی ئەوەت پێدەدەن تا قسە لەسەر ئەو خاڵانە بکەیت کە لە محازەرەیەکدا خراونەتەڕوو و ئەو ماددەیەش کە واجبی خوێندنەوەیە.

ئەو گروپانە بە دەگمەن پەیڕەوی لە تێکستێکی دیاریکراو یان شێوازێك دەکەن و لەوانەیە بەشێوەیەکی ڕەمەکی لە بابەتێکەوە بچنە سەر بابەتێکی تر، جارێکی تر ئاماژە دەکەن بە پێویستیی لێهاتوویی گشتی لە ماددەی کۆرس، خاڵی "یەکلاییکەرەوە" بۆ مشتومڕ.

جەختکردنەوەی سەرەکی: پرسیارکردن/وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، شیکردنەوە چەمکەکان و ئایدیاکان، بەشداریکردن لە مشتومڕەکان.

ئاوێتە: باشترین (یان خراپترین)ی هەردووکیان

هەندێ لە کۆرسەکانی پاش ئامادەیی، وانەی ئاوێتەن- محازەرە و شێوازەکانی مشتومڕ لێکدەدەن (جۆرێکی نموونەیی کلاسی پێش کۆلێژ کە لەوانەیە لەگەڵی ڕاهاتبیت). مامۆستا پلانێکی وانەی ئەو ماددەیە ئامادە دەکات کە دەیەوێ لە پۆلێکی دیاریکراودا قسەی لەسەر بکات. لەرێگەی محازەرە، مشتومڕ، پرسیار و وەڵام، گەیاندنی بینایی و بیستن، یان ئاوێتەیەك لە یەکێك یان زیاتر لەمانە، ماددەکە پێشکەش دەکرێت.

خۆئامادەکردنی تۆ بۆ ئەم جۆرە کلاسە بە رادەیەکی بەرچاو پشت ئەستوورە بە شێوازی هەر تاکە وانەبێژێك. ئەم جۆرە کلاسانە بەهەمان شێوە لەسەر ئاستی پاش خوێندنی

ئامادەیی–کۆلێژ، خوێندنی باڵا، قوتابخانە پیشەییەکان– ڕوودەدەن کاتێك قەبارەی پۆل زۆر بچوکە بۆ شێوازی محازەرەیەکی ڕەسمی.

جەختکردنەوەی سەرەکی: نووسینەوەی تێبینی، گوێگرتن، بەشداریکردن، پرسیارکردن و وڵامدانەوە.

هاندسن: پیسکردنی دەستەکانت

وانەکانی وەکو تاقیگە زانستییەکان و کۆرسە پیشەییە جیاجیاکان (هونەرەکانی پیشەسازی، گرافیك و هیتر) لە ئامادەییەوە بەرەو سەر لە ئاستی جیاجیادا ڕوودەدەن. ئەمانە تەقریبەن بەشێوەیەکی ناوازە پەیوەندییان هەیە بە کردنی شتێك– تەواوکردنی تاقیکردنەوەیەکی زانستیی دیاریکراو، ئیشکردن لەسەر پرۆژەیەك، یان هەر شتێکی تر. لەوانەیە مامۆستاکە شتی دیاریکراو پیشان بدات بەر لەوەی ڕێگە بدات خوێندکاران ئیش لەسەر ئەوانەی خۆیان بکەن، بەڵام جەختکردنەوەی سەرەکی لەسەر ئەوەیە خوێندکار پرۆژەکانی خۆی تەواو بکات لەکاتێکدا کە لە پۆلدایە.

لەسەر ئاستی کۆلێژ، تاقیگەکانی زانست بەزۆری لەلایەن یاریدەدەرانی خریجەوە سەرپەرشتی دەکرێت. دەشێ قوتابخانە پیشەییەکان ئاوێتەیەك لە محازەرەی کورت، پیشاندان و خستنەڕوو و وۆرکشۆپەکان بەکاربێنن، تۆ ناتوانیت تەنیا بە خوێندنەوەی کتێبێك لەسەر پاککردنەوەی نێرەری کارەبایی مەکینە ببیتە میکانیکێکی باشی ئۆتۆمبێل.

جەختکردنەوەی سەرەکی: پەیداکردن و پیادەکردنی شارەزاییتییە دەستی و تەکنیکییە دیاریکراوەکان.

حاڵەتی بەدەر لە بنەماکە

بە دەگمەن تاکە کلاسێك بە ڕێك و پێکی دەچێتە ناو یەکێك لەو ڕێکخستنانەوە، هەرچەندە تەقریبەن هەموویان بەشێوەیەکی سەرەکی یەکێك لەوانە دەبن. پێدەچێت کە قەبارە فاکتەری بنچینەیی بێت لە هەڵبژاردنی ڕێکخستنێکدا، بەڵام تۆ ناتوانیت هەمیشە گریمانەی ئەوە بکەیت کە، بۆ نموونە، کۆرسێکی محازەرەی گەورە، کە پڕکراوە لە ٢٠٠ خوێندکار یان زیاتر،

مامۆستایەك دەگرێتەخۆ كە لە پشت مینبەرەكە وەستاوە و لە تێكستەكە ئامادەكراوەكەی دەخوێنێتەوە. یان ئەمەی كە كلاسێكی بچوكی دە دوانزە كەسی هەمووی دەبێتە مشتومڕ.

لە ساڵانی كۆلێژمدا، مامۆستایەكی ئایینم هەبوو كە، هەرچەندە وانەكەی یەكێك بوو لە هەرە باوەكان لە زانكۆدا و بەزۆری لە هەر جەلەسەیەكدا ٣٠٠ خوێندكار یان زیاتری بەكێش دەكرد، بە دەگمەن محازەرەی دەوتەوە. قەت نەمدەزانی چاوەڕێی چی بكەم كاتێك دەچوومە ناو پۆلەوە. هەفتەیەكیان زنجیرەیەك لە پارچەی وەرگیراوی باندێكی جازی ناوچەیی بوو شانبەشانی چەندەها یاریدەدەری خریج كە قسەیان لەسەر ئەزموونەكانی دەرەوەی جەستە دەكرد. جەلەسەیەكی تر بە تەواوەتی لەوە پێكدەهات كە مامۆستا لەگەڵ تاكە خوێندكارێك لەسەر بابەتێكی سەرەكی مشتومڕی دەكرد...كە هیچ پەیوەندی نەبوو بە واجبی ئەو هەفتەیە (یان هیچ هەفتەیەكی تر).

لە كلاسێكی تری تەنیا و تەنیا ٢٠ خوێندكاریدا كە مامۆستاكە كیمیای فیزیكی پێ دەوتین، لەگەڵ دەنگی زەنگەكە دەهاتە ژوورەوە، بەبێ زانینی ئەوەی كە كێ هاتووە یان وتنی وشەیەك، دەچووە لای تەختەڕەشەكە و دەستی دەكرد بە نووسینی پرسیار. ئەو بەبێ دركاندنی وشەیەك لەمسەر بۆ ئەوسەری تەختە گەورەكە بەردەوام دەبوو لە ئیشەكەی، تاوەكو، ٢٠ بۆ ٣ خولەك دواتر، دەردەپەڕییە لای راست. بە هێواشی، دەگەڕایەوە لای چەپ...و سەرلەنوێ دەستی دەكردەوە بە نووسین. ئەو هەرگیز پرسیاری نەدەكرد. قەتیش داوای پرسیاری نەدەكرد. لە راستیدا، بیرم نایە لە ماوەی سێ مانگی رێكدا هیچ شتێكی وتبێت!

#### مامۆستاكەت بناسە

پێویستە تۆ ئەو مامۆستایەی كە هەتە و ئەو شتانەی كە حەزی لێیەتی، رقی لێیەتی، ئەفزەڵیەتەكانی، ستایڵەكەی و ئەوەی كە لێت چاوەڕێ دەكات لە وانەكە وەریگری، بناسیت و لێ تێبگەیت. بەپێی شیكردنەوەت لە خووەكان، ئامانجەكان و مەیلەكانی مامۆستاكەت، دەشێ خۆئامادەكردن زۆر جیاواز بێت، جا رێكخستنی كلاسەكە یان بابەتەكە هەرچییەك بێت.

شتێكی سادەی وەكو پرسیاركردن لەماوەی وانەكەدا لەبەرچاو بگرە، كە من هانتان دەدەم بیكەن هەركاتێك لە خاڵێكی سەرەكی تێناگەن. هەندێ لە مامۆستایان زۆر ئاسوودەن بە

خستنەڕووی پرسیار لە هەر کاتێکی وانەکەدا، ئەوانیتر پێیان باشە پرسیارەکان هەڵبگیرێن بۆ کۆتایی وانەکە، هێشتاش هیتر هەن کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ پرسیارکردن (یان هیچ جۆرە کارلێك و ئاڵوگۆڕێکی لەو جۆرە) نین. بزانە چ کاتێك و چۆن هەر کام لە مامۆستاکانت کەیفیان لە وروژاندنی پرسیارە، پاشان بەو پێیە پرسیاریان لێ بکە.

گرنگ نییە کە کلاسێك چەندە ئامادەیە بچێتە ناو مشتومڕێکی سەربەستەوە، هەندێ لە مامۆستاکان ترسیان لە لەدەستدانی کۆنترۆڵە و لە خودی پلانی وانە دیاریکراوەکەیان دوور دەکەونەوە. لەوانەیە ئەو مامۆستایانە بەباشی هانی مشتومڕ بدەن بەڵام هەمیشە هەوڵ دەدەن ئاراستەی بکەنە ڕێچکەیەکی لەپێشدا دیاریکراو (پلانی وانەکەیان). مامۆستاکانی تر لەسەر فەوزا دەژین، حاڵەتێك کە تیایدا قەت ناتوانیت دڵنیا بیت خەریکە چی ڕوودات.

دەبێ نزیکبوونەوە لە وانەیەك بەو جۆرە مامۆستایەی یەکەم ببێتەهۆی بەشداریکردنت لە مشتومڕەکانی ناو پۆلدا ئەوەندەی بکرێ، بەڵام هۆشداریت دەداتێ کە لەناو ئەو سنوورانەدا بمێنیتەوە کە ئەو بەڕوونی دایناون.

ئامادەبوون بۆ کلاسێك کە لەلایەن جۆرەکەی تری مامۆستا دەوترێتەوە، پێویستی بە لە خوێندنەوەی تێکست زیاتر هەیە– جەختکردنەوەیەکی زۆر دەبێ لەسەر تێگەیشتنت لە چەمکە سەرەکییەکان، لێکدانەوە، شیکردنەوە و توانات بۆ پیادەکردنی ئەو وانانە بەسەر ئەو کەیسانەی کە قەت لە تێکستەکەتدا دەرنەبڕدراون!

هەندێ لە پلانەکانی وانە یان محازەرەکانی مامۆستایان، لە خراپترین حاڵەتدا، چاوپێداخشاندنەوەیەکە بۆ ئەوەی کە لەناو تێکستەکەدایە و لە باشترین حاڵەتدا چاوپێداخشاندنەوەیە لەگەڵ هەندێ مشتومڕی ئەو خاڵە قورسانە یان ڕووبەرانەی کە پێی وایە لەوانەیە کێشەتان لادروست بکات. ئەوانیتر تێکست یان واجبی تر وەکو خاڵی یەکلاییکەرەوە بەکاردێنن– لەوانەیە محازەرەکانیان یان پلانی وانەکانیان چەندەها خاڵی بگرێتەوە کە هیچ لە تێکستەکەتدا نین. خۆئامادەکردن بۆ ئەو جۆرە وانەیەی دوایی پێویستی بە شتێکی زۆر زیاتر لە دەرخی کوێرانەی فاکتەکان و فیگەرەکان هەیە– دەبێ تۆ ئامادە بیت بۆ پێدانی نموونە، ڕوونکردنەوەی چەمکەکان لە کۆنتێکست (سیاق)دا و هیتر.

لەوانەیە زۆربەی مامۆستا و پرۆفیسۆرەکانتان هەمان ئامانجیان هەبێ: پێت بڵێن چۆن بیر بکەیتەوە، فێری فاکتە گرنگەکان و قاعیدەی ئەو ماددە دیاریکراوە بیت کە دەیڵێنەوە و لەوانەشە چۆن بە شێوازی خۆت پیادەیان بکەیت.

لە کڵاسەکانی ماتماتیك یان زانستدا، توانات بۆ پیادەکردنی ئەوەی کە فێری بوویت بەسەر پرسیارە دیاریکراوەکاندا، زۆر گرنگە.

کڵاسەکانی تر، وەکو ئینگلیزی، پێویستیان بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئیشە جیاجیاکان هەیە، بەڵام لەوانەیە جەختیش بخەنەسەر لێکدانەوەی "دروست".

هەر بارودۆخێك کە خۆتی تێدا دەبینیتەوە– و لەوانەیە تۆ یەکێك یان زیاتر لەم "جۆر"انەت هەبێت– پێویستە لەسەرت کە ئەو شارەزایەتییانە بۆ هەر یەکێکیان بگونجێنیت کە ئێمە لەم بەشەدا باسیان دەکەین.

## خۆت لەگەڵ ستایلی مامۆستاکەتدا بگونجێنە

هەموو وانەبێژەکان (دەشێ بڵێم هەموو وانەبێژە کاریگەرەکان) پلانێکی جێبەجێکردن بۆ هەر وانەیەك ئامادە دەکەن. ئەوان بریار دەدەن کام خاڵانە دەخەنەڕوو، چەندێك کات بەسەر دەبەن بە چاوخشاندنەوە بە واجبەکان و وانەکانی پێشوودا، ئاماژە بە کام تێکستانە دەکەن، چ بەسەرهاتێك بەکاردێنن بۆ دابینکردنی پشوویەکی کۆمیدی یان بایەخدانێکی مرۆیی و چەندێك کات دەرەخسێنن بۆ پرسیارەکان.

بونیادنانی ستراتیژییەکی تێبینی نووسینەوە لە دەوری هەر "پلانێکی جێبەجێکردن"ی مامۆستایەك بۆ محازەرەکان، کلیلێکی تری سەرکەوتنی ئەکادیمییە. بۆچی هەندێ لە خوێندکاران تەنیا وادەردەکەوێ کە دەزانن چ گرنگە و چ گرنگ نییە؟ چۆن ئەوان کتومت ئەو زانیارییە دەدۆزنەوە کە "شایستەی تاقیکردنەوە"یە لەکاتێکدا کە تەنانەت نیگایەکی ئەو ماددەیە ناکەن کە وەها نییە؟

ئەوەی کە ئەم خوێندکارانە بە شێوەیەکی سروشتی دەیزانن ئەوەیە کە ئەو برگانەی لە ماوەی هەر وانەیەکدا قسەیان لەسەر کراوە دەشێ بۆ چەند پۆلێك گروپبەندی بکرێت:

–ئەو زانیارییەی کە لە تێکستەکانی وانەکاندا یان خوێندنەوەی واجبی تردا نەهاتووە.

– پیشاندان یان نموونەهێنانەوە بۆ زیاتر روونکردنەوەی چەمکێك، پرۆسەیەك یان بابەتێك.

-زانیاریی باکگراوند (پێشینه) بۆ دانانی ماددەی کۆرس لەناو کۆنتێکستدا.

لەکاتێکدا کە تۆ گوێ لە مامۆستاکەت دەگریت، هەوڵ بدە بزانیت قسەکانی دەچنە ناو کام پۆلێنبەندییەوە. ئەمە یارمەتیت دەدات تا ئەوە دەستنیشان بکەیت کە تێبینییەکانت دەبێ چەندێك چڕوپڕ بن لەو بەشەی محازەرەکەدا.

### چۆن بۆ هەر وانەیەك خۆت ئامادە بکەیت

بە شێوەیەکی گشتی، بزانە چۆن دەبێ پلان دابنێیت بۆ خۆئامادەکردن بۆ هەر وانەیەك پێش ئەوەی لە دەرگاکەوە بچیتە ژوورەوە و لە سەر ریحلەکەت دانیشیت.

### هەموو واجبەکان تەواو بکە

بە چاوپۆشی لە ستایڵی دیاریکراوی مامۆستایەك یان ئەو رێکخستنەی ناو پۆل کە بەکاریدێنێت، تەقریبەن هەر کۆرسێك کە داخڵی دەبیت، تێکستێکی رەسمی (یان دووان یان سییان)ی هەیە کە بۆی دیاریکراوە. هەرچەندە شێوازی تێکستەکە بۆ روونکردنەوە یان رووماڵکردنی بابەتێك بەشێوەیەکی بەرچاو جیاوازە لە شێوازی مامۆستاکەت بەرانبەر هەمان ماددە، تێکستی تۆ هێشتا بنچینەی کۆرسەکەیە و پێکهاتەیەکی سەرەکییە لە سەعیکردنندا. پێویستە تۆ بیخوێنیتەوە، هەروەها هەر کتێبێکی تری دەستنیشانکراو بخوێنیتەوە پێش ئەوەی بچیتە ناو پۆلەوە.

دەشێ تۆ هەندێ جار هەست بکەیت کە دەتوانیت بەبێ خوێندنەوەی لەپێشدای ئەو کتێبانەی دەستنیشانکراون، تێپەڕیت، بەتایبەت لە جۆرە محازەرەیەك کە تیایدا دەزانیت هەلی لێپرسینەوە لاوازە یان نییە. بەڵام بە دڵنیاییەوە ترسان لەوەی پرسیارت لەبارەی ماددەکەوە لێبکرێت تاکە هۆکار نییە کە من پێداگری دەکەم لە خوێندنەوەی ماددەی پێسپێردراو. تۆ گومڕا دەبیت گەر مامۆستا بڕیار بدات- بۆ یەکەمین جار!- کە تەواوی ماوەکە بە پرسیارکردن لە خوێندکاران بەسەر ببات. من ئەمەم بەسەر هاتووە. ئەمەش ئەزموونێکی خۆش نییە بۆ کەسێك کە خۆی ئامادە نەکردبێت.

تۆ بەهەمان شێوە بەلاتەوە قورستر دەبێ کە تێبینی روون و دەقیق بنووسیتەوە لە ناو پۆلدا کاتێك نازانیت چی لە تێکستەکەدا هەیە- حاڵەتێك کە تیایدا تۆ بەشێوەیەکی عشوائی

تێبینی لەسەر ئەو ماددەیە دەنووسیتەوە کە دەتتووانی شەوی پێشتر هێڵی بەژێر دێڕەکانیدا بێنیت لە کتێبەکانتدا. تۆ بەهەمان شێوە بەلاتەوە قورس دەبێت کە گرنگیی ڕێژەیی قسەکانی مامۆستا هەڵسەنگێنیت.

ئەگەر تۆ بەرەو گروپێکی مشتومڕ ڕێ دەکەیت، چۆن دەتوانیت بەشداری بکەیت بەبێ ئەوەی خوێندنەوەکەت بکەیت بە بنچینەیەك؟ پێم وایە کارەساتبارترین هەست لە جیهاندا دانیشتنە لە پۆلدا و بزانیت، زوو یان درەنگ، پرسیارت لێدەکرێت و تۆ ماددەکە نازانیت.

بیرت بێت: تەواوکردنی واجبی خوێندنەوەت نەك تەنیا خوێندنەوەی تێکستی سەرەکی بەڵکو هەر کتێبێك یان بابەتێکی تر دەگرێتەوە کە دەستنیشانکراوە، سەرباری ئەو مەلزەمە و پەڕانەش کە لەوانەیە پێشتر دابەش کرابن. ئەمە بەهەمان شێوە واتە تەواوکردنی هەر واجبێکی دەرەوەی خوێندنەوە– رادەستکردنی راپۆرتی تاقیگە، ئامادەکردنی لیستێك ناونیشان، یان ئامادەبوون بۆ پێشکەشکردنی راپۆرتە زارەکییەکەت.

گومانی تیا نییە، لەکاتێکدا کە ئەنجامدانی واجبی ماڵەوەت گرنگە، "دانەوەی" هەنگاوێکی جەوهەریی دووەمە! کچەکەم، لیندسەی، رەتی کردەوە هیچ سیستەمێکی دامەزراوەیی یان بونیادی بۆ ماوەیەکی کورت بەکاربێنێت. سەرەنجام، سەرباری کۆمەڵێك مەواعیدی لەدەستچوو و واجبی لەبیرچووەوە، زۆرجار لەبیری دەچوو ئەو واجبەی لەگەڵ خۆی ببات کە ئەنجامی دابوو، یان دەیبرد بۆ قوتابخانە و لەبیری دەچوو رادەستی بکات.

یەکێك لەو گۆڕانکارییانەی کە من لە رۆتینەکەیدا ئەنجاممدا، جیهانێك لە جیاوازی دروست کردووە: ئەو ئێستا فۆڵدەرێکی کاغەزیی سووری هەیە، لێی نووسراوە "واجبی ماڵەوە"، کە هەر واجبێکی تەواوکراوی ماڵەوەی دەستبەجێ دەخاتە ناو. کاتێك دەگاتە پۆل، دەستبەجێ فۆڵدەرەکەی دەردەهێنێت بۆئەوەی بزانێت ئاخۆ شتێك هەیە پێشکەش یان رادەستی بکات. (ئەو بەهەمان شێوە وازی لە سیستەمە "نابونیادییەکە"ی هێناوە، بەڵام ئەمە چیرۆکێکی ترە).

## چاو بە تێبینییەکانتدا بخشێنەرەوە

لەوانەیە مامۆستاکەت لەو خاڵەوە کە دوایین جار جێی هێشت دەست بکات بە محازەرە یان مشتومڕ. لەوانەشە تۆ بیرت نەیەتەوە ئەو خاڵە لە کوێ بوو تا ئەو کاتەی سەیرێکی تێبینییەکانت نەکەیتەوە.

### با پرسیارەکانت بەردەست بێ

ئەمە هەلی تۆیە بۆ زانینی وەڵامەکان بۆ ئەو پرسیارانەی هێشتا واقیان وڕماندوویت. پێش وانەکە چاو بە پرسیارەکانتدا بخشێنەرەوە. بەم شێوەیە، تۆ دەتوانیت هێڵ بەسەر ئەوانەدا بێنیت مامۆستاکە پەیتا پەیتا وەڵامیان دەداتەوە و تەنیا پێویستت بەوەیە پرسیاری ئەوانە بکەیت کە وەڵام نەدراونەتەوە.

### تێڕوانینی خۆت ئامادە بکە

لە گرنگیی ئەو بۆچوونە کەم مەکەرەوە کە تۆ لە رووی ئەقڵییەوە بۆ هەر وانەیەك هەتە. دەستکەوتنی زۆرترین شت لە قوتابخانە بە شێوەیەکی گشتی و هەر وانەیەك بەشێوەیەکی دیاریکراو تا رادەیەکی زۆر بەندە بەوەی کە تۆ چەندە ئامادەیت بە راستی بەشداری بکەیت لە پرۆسەکەدا. ئەمە بەس نییە، تەنانەت ئەگەرچی بە پێچەوانەوە باش خۆت ئامادەکردبێت، کە لەدواوە دانیشیت و زانیاری هەڵمژیت. فێربوون پێویستی بە بەشداریی چالاکی تۆ هەیە لە هەر هەنگاوێکی رێگاکەدا.

### لە پۆلدا چی بکەیت؟

ئەفزەڵیەتەکانی خۆت و ئەمەی کە لە چ باروذۆخێکدا باشترین ئەدائت هەیە لەبیر بێت– ئاماژە بکە بە یەکەم دوو بەش و چاو بە لیستەکانی شارەزایەتییەکانتدا بخشێنەرەوە. تۆ پێویستت بەوە دەبێت کە تەرکیزی هەرە زۆرت بخەیتە سەر ئەو کۆرسانەی کە تیایاندا تۆ ئەدائت لاوازە.

### لە نزیك پێشەوە دانیشە

بە دانیشتن ئەوەندەی بکرێ لە نزیك وانەبێژ، هۆش پەرتکەرەکان کەم بکەرەوە.

چەندەی دوور لە مامۆستا دانیشیت، ئەوەندەش گوێگرتن قورس دەبێت. دانیشتن لەلای دواوەی هۆڵەکە بەو مانایەیە کە سەرێکی زۆر لە بەردەمت هەڵبەز و دابەز دەکەن و ژمارەیەکی زیاتری خوێندکاران سەرنج دەدەنە دەرەوە– هانت دەدەن هەمان شت بکەیت.

دانیشتن لە پێشەوە ژمارەیەك سوودی هەیە. دیدێکی پێشینەیی ناوازە لەبارەی خۆتەوە لەلای مامۆستا دروست دەکەیت- لەوانەیە تۆ بە راستی تاکە خوێندکارێك بیت لە ریزی پێشەوە دادەنیشیت. ئەو دەستبەجێ دەزانێ کە تۆ بۆ گوێگرتن و فێر بوون هاتوویتە پۆل، نەك تەنیا بۆئەوەی بۆشاییەك بگریت.

تۆ دەتوانیت دەنگی مامۆستا ببیسیت و مامۆستا دەتوانێ تۆ ببیستێت کاتێك تۆ پرسیار دەکەیت و وەڵامی پرسیار دەدەیتەوە.

دواجار، توانینی بینینی مامۆستابە روونی، پارمەتیت دەدات تا دڵنیا بیت لەوەی چاوەکانت بە دەوری ژوورەکە و بەرەو پەنجەرەکان ناخولێنەوە کە مێشکیشت لەگەڵ خۆیان دەبەن.

کەواتە، ئەگەر تۆ ئیختیاری ئەوەت هەبوو ریحلەکەت لە پۆلدا هەڵبگریت، رێك لە پێشەوە دانیشە.

## خۆت بەدوور بگرە لە پەرتکردنی هۆشی هاوپۆلەکانت

هێڵ کێش، مشاغیب ، چپەچپکەر. تەنانەت بۆن پژێن. دەشێ هاوپۆلەکانت دۆستی بێ وێنە، هاورێ سەرگەرمکەری نانی نیوەڕۆ و گیانلەبەری بێ هاوتای ئاهەنگی کۆتایی هەفتە بن، بەڵام سەیرییەکەیان، نامۆییەکەیان، خووەکانی خۆ خاوێن راگرتنیان دەشێ هۆش پەرتکەر بێت کاتێك تۆ لە پۆلدا لە تەنیشتیانەوە دادەنیشیت.

ترەقاندنی جومگەکان، قخخم قخخخم پێکەنین، چپە چپ کردن و پارچە کاغەز بە دزییەوە رادەستکردن، تەنیا هەندێ لەو کردارە شەیتانییانەن کە دەشێ لە ناوەراستی گووتاری ماتماتیکی پرۆفیسۆر لەسەر ژمارەی نادیاری هاوکێشەیەك، هۆشت پەرت بکات. خۆتیان لێ دوور بگرە.

## گوێ بۆ ئاماژە زارەکییەکان هەڵخە

ناسینەوەی ماددەی شایستە بەو مانایەیە کە رێگایەکت دۆزیووەتەوە بۆ جیاکردنەوەی گەنم- کە ئەوەیە دەبێ بینووسیت- لە توێژاڵ- کە ئەوەیە دەبێ فەرامۆشی بکەیت. تۆ چۆن ئەمە دەکەیت؟ بە گوێگرتن بۆ ئاماژە زارەکییەکان و تەماشاکردنی نازارەکییەکان.

زۆرێك لە مامۆستایان هەمیشە لە شێوازی پێشکەشکردنیاندا ئاماژە بە ماددەی گرنگ دەکەن– هەڵوەستەکردن (چاوەڕوانبوونی بەرزبوونەوەی هەموو دەستەکان)، دووبارەکردنەوەی هەمان خاڵ (لەوانەیە تەنانەت هەمان ئەوەشیان کە لە کتێبی مەنهەجەکەتدا دووبارە بووەتەوە)، خاوبوونەوەی محازەرە خێراکەیان، قسەکردنی بە دەنگێکی بەرزتر (یان نەرمتر)، یان تەنانەت تەنیا وتنی "بە ڕەئی من ئەمەیان گرنگە".

هەروەها چەندەها ژمارە و دەستەواژە هەن کە دەبێ ئاماژە بن بە گرنگیی ماددە (و لە هەمان کاتدا، ئەو ئاماژانەت پێ بدەن کە تۆ پێویستتن بۆ ڕێکخستنی لۆژیکییانەی تێبینییەکانت): "پێش هەموو شتێك"، "لە هەمووی گرنگتر"، "بۆیە"، "سەرەنجام"، "بە کورتی"، "لەلایەکی ترەوە"، "بە پێچەوانەوە"، "ئەو (ژمارە) هۆکارانەی خوارەوە (هۆکار، ئەنجام، بڕیار، فاکت و هیتر)".

ئەو جۆرە وشە و دەستەواژانە ئەو ئاماژانە دەگرنەخۆ بۆئەوەی تەنیا ئەو ماددەیە نەنووسیت کە دواتر دێت، بەڵکو بەهەمان شێوە بیشیخەیتە ناو کۆنتێکستەوە– لیستێك دروست بکەیت ("یەکەم"، "ئەم هۆکارانەی خوارەوە")، پەیوەندییەکی هۆکار و دەرەنجام دروست بکەیت ("بۆیە"، "سەرەنجام")، بۆ بونیادنانی دژەکان یان جێگرەوەکان ("لەلایەکی ترەوە"، "بە پێچەوانەوە")، بۆ دەلالەتکردن لە ئەنجامگیرییەك ("بە کورتی"، "بۆیە")، یان خستنەڕووی ڕوونکردنەوە یان پێناسەیەك.

ئاگاداری ئاماژە نازارەکییەکان بە

توێژینەوەکان دەریانخستووە کە تەنیا بەشێك لە اتصال بە وشەکانْ دەگەیەنرێ. بڕێکی زۆری ئەو پەیامەی کە ئێمە وەریدەگرین کاتێك کەسێك قسەمان لەگەڵ دەکات لە زمانی جەستە، گوزارشتی ڕوخساری و تۆنی دەنگەوە دێت.

زۆربەی وانەبێژەکان لەسەر پەیوەندیدارێتیی جیاجیای ماددەی وانەکە پەت پەتێن دەکەن. هەندێ لەمانە گرنگ دەبێن بەڵام لانی کەم لەماوەی یەکەم وانەکانتدا لەگەڵ ئەو مامۆستا دیاریکراوەدا، نازانی کامیان.

دەشێ زمانی جەستە ئاماژەی تۆ بێت. ئەگەر مامۆستاکە دەستی کرد بە ڕوانینە دەرەوە یان چاوەکانی لە بێتاقەتیدا کەوتن، ئەوا ئاماژەیەکی ڕوون دەنێرێ: "ئەمە لە هیچ تاقیکردنەوەیەکدا نایەتەوە".

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر رووبکردە تەختەکە بۆ نووسینی شتێك، پەیوەندیی بینایی لەگەڵ ژمارەیەك لە خوێندکاراندا دروست بکات و/یان بەشێوەیەکی دراماتیکی جوڵە بکات، ئاماژەیەکی روون ئاراستە دەکات لەبارەی گرنگیی ئەو خاڵەی کە دەیخاتەروو.

مامۆستاکان حەز دەکەن ببینن خوێندکار تێبینی دەنووسێتەوە. ئەمە پیشانی دەدات کە تۆ بایەخ ئەدەیت بە بابەتەکە و ئەمەی کە تۆ بایی پێویست بیر دەکەیتەوە لەوەی کە دەوترێ بینووسیتەوە. (و ئەگەر جارێك لە جاران لەبەردەمی ژوورەکەدا وەستابیت، دەتوانیت زۆر جار بزانیت کە کێ تێبینی دەنووسێتەوە و کێ خەریکی مێسج نووسینە بۆ هاورێیەکی).

پرسیار بکە

نا، دەست بەرز مەکەوە بۆ پرسیار کردن یان وەڵامدانەوەی پرسیارێك لە هەر ٩٠ چرکەیەکدا. گوێگرێکی چالاك بوون بەو مانایەیە کە پرسیار لە خۆت بکەیت ئاخۆ لە هەر شتێك تێدەگەیت کە قسەی لەسەر کراوە. ئەگەر وەڵامەکە (نا)یە، لەکاتێکی گونجاودا پرسیار لە مامۆستا بکە یان ئەو پرسیارانە بنووسەرەوە کە پێویست بوو وەڵامیان بدەیتەوە بۆئەوەی بە تەواوی لە بابەتەکە تێبگەیت.

تەحەدای خۆت بکە بۆئەوەی ئەنجامگیری بکەیت لەو شتانەی کە مامۆستا دەیانڵێت. تەنیا دامەنیشە دەستەکانت لە تێبینی نووسیندا قفڵ بکەیت. با مێشکیشت شتێك بکات. بیر لە ماددەکە بکەرەوە– چ پەیوەندییەکی هەیە بەوەی کە بووە بە واجب بۆت بۆ خوێندنەوە و فاکتی تر کە تۆ خراونەتەرووت.

بزانە چۆن بژاردەیی بیت

من دڵنیام کە ئەوەتان بەدی کردووە کە لە پۆلەکانتاندا هەندێ کەس بە بەردەوامی خەریکی نووسینی تێبینین. ئەوانیتر بە دوو دێڕ لە لاپەڕەیەکدا کۆتایی پێدێنن. زۆربەشمان لەنێوان ئەو دووانەداین.

ئەو کەسەی کە قەت لە نووسینەوەی تێبینی ناوەستێ، یان خەریکی نامەنووسینە بۆ هاورێیەکی لە شوێنێکی تر یان ئەسڵەن نازانێ چ گرنگە و چ گرنگ نییە.

نووسینەوەی تێبینیی دەقیق و روون، پێش هەموو شتێك پراوەی جیاکارییە– گەشەپێدانی توانات بۆ جیاکردنەوە جەوهەری لە ناپێویست، ناسینەوە و لە یادەوەریدا هێشتنەوەی چەمکە

سەرەکییەکان، فاکتە سەرەکییەکان و ئایدیا سەرەکییەکان و فەرامۆشکردنی ئەوەیتر. لە بەرانبەردا، ئەمە پێویستی بە توانای گوێگرتنە لەوەی کە مامۆستاکەت دەیڵێت و کۆپیکردنی تەنیا ئەوەیە کە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە چەمکەکە. بەلای هەندێ کەسەوە، دەشێ ئەمە بەو مانای تاکە رستەیەك بێت. بە لای ئەوانیترەوە، نموونەیەکی چڕوپڕ کلیلەکەیە.

تەنیا بیرت بێت: کوالیتیی تێبینییەکانت بەزۆری پەیوەندییەکی کەمیان هەیە بە درێژییەوە— سێ دێڕی سەرەکی کە کرۆکی چەمکەکانی تەواوی محازەرەکە دەردەخەن یەکجار زۆر بەنرخترە لەو پەرەگرافانەی کە داتای کەمتر گرنگیان تێدایە.

کەواتە بۆچی هەندێ لە خەڵکی بەردەوامن لە هەوڵی نووسینەوەی تێبینییەکان وشە بە وشە بەو قەناعەتەی کە چەندەی زۆر لاپەڕەکانیان پڕ کەنەوە بە نووسینی پەڕپووت، ئەوەندەش خوێندکاری باشتر دەبن؟ لەوانەیە ئەمە نیشانەیەکی هەست کردن بە نائارامی بێت— لەوانەیە ماددەکەیان نەخوێندبێتەوە یان ئامازەکیان لابێت لەمەڕ ئەوەی قسە لەسەر چی دەکرێت بەلام لانی کەم تەواوی تێبینییەکانیان لا دەبێت!

تەنانەت ئەگەرچی بۆت دەرکەوت دوابەدوای محازەرەیەك دەستەوستانانە بیر دەکەیتەوە، ئەوەندە نادڵنیایت لەوەی کە ئەو چی وتووە کە ناتوانیت دەست بکەیت بە جیاکردنەوە ماددەی گرنگ لە درێژدادڕیی ناپێویست، هەرچۆنێك بێت ئەو تەکنیکانە بەکاربێنە کە لەم بەشەدا قسەیان لەسەر کراوە بۆ رێکخستن و چڕکردنەوەی تێبینییەکانت.

ئەگەر تۆ بە راستی پێت وایە ئەوەندە گومڕا بوویت کە تەنیا خەریکی بە فیڕۆدانی کاتەکەتی، دانانی دانیشتنێکی چاوپێداخشاندنەوە لە خشتەکەتدا لەبەرچاو بگرە (بۆ خوێندنەوە یان جارێکی تر خوێندنەوەی تێکستە پەیوەندیدارەکان)و ئەگەر محازەرەکە یان کلاسەکە دووبارە بێتەوە، تیایدا ئامادە بەرەوە. بەڵێ وایە، کتومت بەفیڕۆدانی کاتە گرانبەهاکەتە، بەلام وەها نییە ئەگەر تاکە رێگە بێت بۆ فێربوون و تێگەیشتنی ماددەی گرنگ.

تێبینی بنووسەرەوە لەسەر ئەو شتانەی کە نایانزانیت

تۆ پایتەختی ولاتی ئەڵمانیا دەناسیت. هاوکێشەی کیمیایی بۆ خوێ دەزانیت. تۆ دەزانیت وەزیری دەرەوەی ئێستای ئەمریکا کێیە. کەواتە بۆچی کات بە فیڕۆ بدەیت و بۆشایی سەر کاغەز بگریت بە نووسینیان؟

زووزوو مامۆستاکەت ئەو ماددەیە پێشکەش دەکات کە هەنوکە دەیزانیت بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ باسی قووڵتر بۆ ناساندنی ماددەی قورستر. ئەوەندە پەیوەست مەبە بەوەی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو بەروار، وشە، زاراوە، هاوکێشانە بنووسیتەوە و تێبینییان لەسەر بنووسیت کە هەنووکە زانیاریت لەسەریان هەیە. لەم بارەدا تۆ تەنیا کاتت بەفیڕۆ دەدەیت- هەم لەناو پۆل و هەم دواتر، کاتێك چاو بە تێبینییە لە رادەبەدەر درێژەکاندا دەخشێنیتەوە.

هەربۆیە هەندێ لە شارەزایان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە تێبینییەکان یان سەرەباسە نووسراوەکانی بابەتی کتێبەکەت بهێنیت بۆ پۆل و تێبینییەکانی ناو پۆلیان ئیزافە بکەیتەسەر. پێم وایە ئەم رێگایەکی کاریگەرە بۆ رێکخستنی هەموو تێبینییەکان بۆ ئەو وانەیە بە ئاسانی.

بیرت بێت، نووسینەوەیەکی کاریگەری تێبینییەکان پێویستی بە پێنج کرداری جیاجیا هەیە لەلایەن تۆوە:

١.گوێگرتن بەشێوەیەکی چالاك.

٢.گوڵبژێرکردنی زانیاریی پەیوەندیدار.

٣.چڕکردنەوەیان.

٤.لێکدانەوەیان (دواتر).

گەشە بدە بە شارەزاییەکانی کورتبڕیت

ئەمەش پێنج رێگا بۆ رێکخستنی نووسینەوەی تێبینییەکانت:

١.دەنگە بزوێن مەنووسەرەوە. هەروەکو چۆن لە تابلۆیەکی بەربڵاوی میترۆیەکی ناو شاری نیویۆرکدا هاتبوو، "گر بتنی ئم بخنتو، دتنیت ئشکی بشت دست بکت". (گەر بتوانیت ئەمە بخوێنیتەوە، دەتوانیت ئیشێکی باشت دەست بکەوێت). و ئێمەش دەتوانین ئەمەی بۆ زیاد بکەین، "ت دتنی خندکرك بشتر بت".

٢.سەرەتاکانی وشەکان بەکاربێنە ("KRG" بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان، "نو" بۆ نوێنەر) و کورتکراوەی تری ئاسان بۆ بیرهاتنەوە.

٣.چیتر نوقتە لەدوای هەموو کورتکراوەکانەوە دامەنێ (هەر زیاد ئەکەن!)

٤.سیمبۆلی ستاندارد له شوێنی وشەکان دابنێ. لەوانەیە ئەو لیستەی خوارەوە یارمەتیدەر بێ، که بەشێکی بچوکن له ماتماتیك یان کۆرسەکانی لۆژیك:

به نزیکەیی ≃

لەگەڵ یان هەروەها +
له هەمووی گرنگتر *
کەمتر له ›
زۆرتر له ‹

کەواته ∴

٥.به گوێرەی پێویستییەکان ئاسودەبیت سیمبۆل و کورتکراوەکانی خۆت بەکاربێنه.
سێ سیمبۆلی دیاریکراو هەن که من پێم وایه تۆ پێویستت به دروستکردنیان دەبێ– زووزوو پێویستت به بەکارهێنانیان دەبێ:
(چ) ئەمه سیمبۆلی منه بۆ "چی؟" هەروەکو له "ئەوه یەعنی چی؟"، "چی وت؟"، یان "چی روویدا؟ به تەواوی بێ ئاگام!" ئەمه ئاماژەیه به شتێك که دیار نییه– بۆشایی لەنێوان تێبینییەکانتدا بەجێ بێڵه و پاش وانەکه ئەو بەشەی که نادیاره پڕ بکەرەوە.
(م) ئەمه سیمبۆلی منه بۆ "بۆچوونی من". من دەمەوێ لەماوەی محازەرەیەکدا بۆچوونەکانی خۆم له هی مامۆستا جیا بکەمەوە – ئەگەر بیروبۆچوونێکی زۆری خۆت ئیزافه بکه (بەبێ ئاماژەدان بەوەی که ئەمانه هی تۆن) ئەوا تێبینییەکانت بەهای جددی لەدەست دەدەن!

(ت) بۆ "تاقیکردنەوە!" هەروەکو لە "گرەو دەکەم کە ئەم خاڵە لە تاقیکردنەوە دێتەوە بۆیە بیرت بێ چاوی پێدابخشێنیەوە!!!"

سەربەست بە لەوەی کە رەمزی خۆت بۆ نموونە گرنگەکان بەکاربێنیت، بە دڵنیاییەوە پێویست ناکات ئەوانەی من بەکار بێنیت.

چۆن هەموو شتێك بە رێك و پێکی دەهێڵیتەوە؟ لە یەکەم لاپەڕەی دەفتەری یادداشتی هەر وانەیەکدا لیستێك دروست بکە بۆ ئەو کورتکراوە و سیمبۆلانەی تۆ نیازتە لە تەواوی وەرزی خوێندنەکەتدا بەکاریان بێنیت.

تەنیا وریابە- لە ئارەزوومەندیتدا بۆ پەیڕەوکردنی سیستەمی کورتبڕی، ئەوەندە کورت مەکەرەوە کە هەرکە نوسیتن، تێبینییەکانت شیاوی لێتێگەیشتن نەبن بەلاتەوە!

دەشێ تۆ کەمتر کورت بکەیتەوە و کەمێك زیاتر بنووسیت. هەر سیستەمێك کە تۆ بەکاری دەهێنیت، تەنیا دڵنیا بەرەوە لەوەی کە خزمەت بە مەبەستێکی راست دەکات: پێدانی کات بە تۆ بۆئەوەی بە راستی گوێ لە مامۆستاکانت بگریت، نەك ئەمەی کە بە هەڵچوونییەوە بە پرتاو ئەوە بنووسیتەوە کە دەیڵێن.

سیستەمی کۆنێل

سیستەمێکی تێبینی نووسینەوەی ناسراو هەیە کە زۆرێك لە خوێندکارانی کۆلێژ پێیان دەوترێت. ئەگەر بۆت گونجاوە بەکاری بێنە.

لەلای چەپی دەفتەرەکەت دەست بکە بە کێشانی هێڵێکی ستوونی کە دوو تا سێ ئینچ درێژ بێت. لەلای راستی ئەم هێڵەوە تێبینی بنووسەرەوە.

لە مەودای محازەرەکەدا: هەر وەکو پێشوو تێبینی بنووسەرەوە- لە شێوەی پەرەگراف، سەرەقەڵەم، یان بەکارهێنانی شێوازی کورتبڕیی خۆت.

پاش محازەرەکە: جارێکی تر تێبینییەکانت بخوێنەرەوە و بچوکیان بکەرەوە بۆ ئەو وشە سەرەکییانەی کە یارمەتیت دەدەن خاڵە گرنگەکانی محازەرەکەت بیر بێتەوە. ئەو دەستەواژە و وشە سەرەکییانە لە ستوونی لای چەپ بنووسەرەوە. لەکاتێکدا کە زیاتر و زیاتر لەمەدا باش ئەبیت، بۆت دەردەکەوێت کە چاوپێداخشاندنەوە بۆ تاقیکردنەوە تەنیا پێویستی بە سەعیکردنە لە ستوونی لای چەپ- کورت و پوخت- نەك لای راست.

ڕێگای خۆت بەرەو نمرە باشەکان داڕێژە

یەك کێشەی تەواوی ئەم سیستەمی تێبینی نووسینەوەیە کە من قسەم لەسەر کردووە ئەوەیە کە زۆرێك لە خەڵکی بەلایانەوە سەختە وشەکان بیر خۆیان بێننەوە بە بەراورد بە وێنەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە، لە بەشی دووەمدا لە خشتەی "ژینگەی سەعیکردنی نموونەیی من"، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە ڕێگەی بیناییەوە بەباشترین شێوە زانیارییان وەرگرتووە نەك بە زارەکی.

نەخشەکردن ڕێگایەکی تری نووسینەوەی تێبینییە کە زیاتر بەلای ستایلی بیناییدایە- کەوانەکردن و هێڵکێش یان دایاگرام کردنی تێبینییەکانت نەك ئەوەی کە بیاننووسیتەوە.

با پێت بڵێم چۆن یەکەم چەند لاپەڕەی ئەم بەشە وەك نموونە نەخشە دەکەیت. بە لاپەڕەکی سپی دەست پێبکە، کە لە ناوەڕاست یان سەنتەردا چوارگۆشە کرا بێت، ناونیشانە سەرەکییەکە بنووسە.

پاش بڕیاردان لەسەر یەکەم ناونیشانی سەرەکی و دانانی لەسەر نەخشەکەت، وردەکارییەکە زیاد بکە:

محازەرەکان (ئاراستەی گرنگیدان: گوێگرتن، نووسینەوەی تێبینی)

مشتومڕەکان (ئاراستەی گرنگیدان: پرسیارکردن/وەڵامدانەوە، شیکردنەوە، مشتومڕ)

ئاوێتە (ئاراستەی گرنگیدان: وەکو ئەوەی سەرەوە)

کاردەستی (ئاراستەی گرنگیدان: گەشەپێدان/پیادەکردنی شارەزایەتییە پەیوەندیدارەکان)

دووەم ناونیشانی سەرەکی ("مامۆستاکەت بناسە") و ئەوەی دواتر، لەو هێڵ یان بازنەیەدا دێت کە هەڵتبژاردووە لەو ئاراستەیەشدا کە هەڵتبژاردووە. من لە لاپەڕەکانی دواییدا نەخشەیەکم تەواو کردووە کە چوار ناونیشانی سەرەکی دەگرێتەخۆ.

بەشدارییەکی چالاك: شێوازی نمرەی "A"

لە زۆرێك لە وانانەدا کە لە شێوەی محازەرەدا نین، بۆت دەردەکەوێ کە مشتومڕ، بەزۆریش لە شێوەی پرسیار و وەڵام، بەشێوەیەکی چالاك هان دەدرێت. ئەم دایەلۆگە بۆ تۆکمەکردنی

زانینـت و ئیـستیعابته بـۆ ماددەیـەکی دیـاریکراو و بـۆ ناسـینەوەی ئـەو بوارانەیـە کـە تیایانـدا پێویستت بە ئیشکردنە.

هەر ڕێکخستنێك کـە تـۆ خـۆتی تیـا دەبینیتـەوە، لـە هـەر مـشتومڕێکدا بەشداری بەوپـەڕی تواناتەوە بکە. زۆربـەی مامۆسـتایان بەشـداری پـۆل بـە لایـەنێکی سـەرەکی نمرەکـانی وەرزی خوێندنت هەژمار دەکەن. گرنگ نییە لـە چـەند بابـەت و تاقیکردنـەوەدا نمـرەی "A" دێنیـت، ئەگەر لەناو پۆلدا قەت دەمت نەکەیتەوە، نـابێ سـەرت بـسوڕمێت لـەوەی کـە کـەمتر لـە "A" بێنیت.

ئەگەر تۆ گرفتت هەبێت لە ڕۆیشتن لەگەڵ مشتومڕێك یان هێڵێکـی دیـاریکراوی بیرکردنـەوە، داوای دووبارەکردنــەوە یــان ڕوونکردنــەوە بکــە. بــە گــوێرەی ئەفزەڵییەتــەکانی مامۆســتا و ڕێکخستنی وانەکە، ئەو پرسیارانە بکە کە پێت وایە پێویستت بە وەڵامەکانیانە.




وریا بە بەشێوەیەکی بەرینانە خۆت لە پڕاوەکردنی شارەزایەتییە نایابەکانی ئێستای تێبینی نووسینەوەت پەرت مەکە لە ڕێگەی دەستکردن بە شیکردنەوەی شتێك کە لێی تێناگـەیت یـان، خـراپتر، دروسـتکردنی بەڵگاندنـە ئەقڵییـەکان لەبەرئـەوەی تـۆ ناکۆکیـت لەگـەڵ شـتێك کـە مامۆسـتاکەت یـان هاوپۆلەکـەت وتوویـەتی. تـەرخانکردنی کـات بـۆ ئەقڵییانـە لـە قاڵبـدانی

پرسیارێکی چڕوپڕ بەهەمان شێوە هۆش پەرتکەرە. هەرسێ هۆکارەکە هەمان گرفت دروست دەکەن: تۆ ئاگات لێرە نییە!

دواجار، بە وریاییەوە گوێ لە وشەکانی هاوپۆلەکانت بگرە- زۆرجار قسەکانیان، سەرنجەکانیان و بۆچوونەکانیان وەکو ئەوانەی مامۆستا یارمەتیدەر و بەرچاوڕوونکەر دەبێت.

ئەی ئەگەر تۆ شەرمن بیت یان هەرکاتێك پرسیارت لێکرا گێژ و وێژ ببیت؟ پرسیارێك بکە لەبری ئەوە کە لە مشتومڕەکەدا بەشداری بکەیت- ئەمە ئاسانترە و پێ بە پێی کات، لەوانەیە یارمەتیت بدات بەستەڵەکەکە بشکێنیت و باز بدەیتە ناو مشتومڕەکە. ئەگەر تۆ بە راستی ناتوانیت دەمت بکەیتەوە بەبێ ئەوەی تات لێ بێت، هەوڵ بدە لە کۆرسێکی وتاردان لەبەردەم خەڵکدا بەشداری بکەیت.

لەهەمووشی گرنگتر، خۆت ئامادە بکە و پرۆڤە بکە. ترسی وەستان لەبەردەم پۆلدا یان تەنانەت لە ناتەواوی ریحلەکە، بۆ زۆرێك لە ئێوە، بە راستی نیشانەیەکی نەبوونی بڕوابەخۆبوونە.

نەبوونی بڕوابەخۆبوونیش لەنەبوونی بەشداریکردنەوە سەرچاوە دەگرێت. چەندەی خۆت ئامادەکردبێت- ئەگەر ماددەکە لە پێشەوەڕا و لەدواوەڕا بزانیت- ئەوەندە ئەگەری زیاترە بتوانیت، تەنانەت بشتەوێ، دەستت بەرز بکەیتەوە و "توانای خۆت بسەلمێنیت". لەوانەیە پرۆڤەکردن لەگەڵ هاوڕێیان، دایك و باوك، یان کەس و کاریش یارمەتیدەر بێت.

ئەگەر تۆ کێشەکەت هەیە لەگەڵ لێدوانە زارەکییەکاندا، بە جیا لە بەشی حەوتەمدا باس کراون. پێم وایە بۆت دەردەکەوێت کە ئەو سەرەداوانەی لەوێدا خستوومنەتەڕوو ترسێکی زۆری ئەو لێدوان و قسەکردنانە لاببەن کە پێدەچێ بیگرنەخۆ.

## پاش وانە چی بکەیت

پاش وانەکە هەرچی زووە بە تێبینییەکانتدا بچۆرەوە، "بۆشاییەکان" پڕ بکەرەوە، ئەو پرسیارانە نیشانە بکە کە پێویستە تاووتوێیان بکەیت لە تێکستەکەتدا یان لە وانەی دواتردا بیانخەیتەڕوو و بیرت بێت کە هەر واجبێکی نوێ لە رۆژمێری هەفتانەتدا نیشانە بکەیت.

دەمەوێ ساردتان بکەمەوە لە کۆپیکردنەوەی تێبینییەکان وەکو کردارێکی گشتی، چونکە بڕوام وایە کە گرنگترە ئێش لەسەر نووسینەوەی تێبینیی باش بکەن هەر لە یەکەم جاردا و

کات بە فیڕۆ نەدەن بە کۆپی کردنەوەیان. بەڵام ئەگەر خێرا و نەخوێنراوە دەنووسن، لەوانەیە کاتێکی باشیش بێت بۆ جارێکی تر نووسینەوەی تێبینییەکانتان بۆئەوەی قابیلی خوێندنەوە بن، بەمە دەرفەتی ئەوەتان بۆ دەرەخسێ پوخت بکەنەوە لەکاتێکدا کە لەگەڵیدا دەڕۆن. چەندەی تێبینییەکانتان باشتر بن، ئەوەندەش چانستان باشتر دەبێت بۆ گرتن و بیرهاتنەوەی ماددەی پەیوەندیدار.

بۆ زۆربەی خوێندکارانی ئامادەیی ئاسان نییە ئەمە بکەن، بەڵام لە کۆلێژ، کە لەوێ زیاترت لە دەست دێ بۆ ڕێکخستنی وانەکانت، پێشنیاری ئەوە دەکەم کە پاش هەر وانەیەك ماوەیەکی کراوەتان هەبێت، ئەگەرچی نیوسەعاتیش بێت، بۆ پێداچوونەوەی ئەو تێبینییانەی وانەکە و خۆئامادەکردن بۆ وانەی دواتر.

ئەگەر بۆت دەرکەوت کە ناتوانیت کەڵکی تەواو وەربگریت لەم کاتە نێوانییە، ئەوەندەی بکرێت کاتی کەم دابنێ لەنێوان وانەکاندا.

"مانەوە لەناو جێگە" بژارەیەك نییە

ئەگەرچی هەموو ڕێنماییەکانی ناو ئەم بەشە پیادە بکەیت، ئەگەر زوو زوو خۆت لە وانە بدزیتەوە یان محازەرە لێبدەیت، هەمووی بێ ئەنجام دەبێ. بۆیە وامەکە! بەتایبەت گرنگە کە لە نزیکی کۆتایی وەرزی خوێندن ئامادەی هەموو وانەکان بیت. هەندێ جار مامۆستایان دوایین هەفتە بەکاردێنن بۆ پێداچوونەوەی تەواوی بەرهەمی وەرزی خوێندنەکە (چ ڕێگایەکی نایابە بۆ بچوککردنەوەی کاتی پێداچوونەوەی خۆت!)، ئەو بابەتە دیاریکراوانە ڕوون دەکەنەوە کە هێشتا هەست دەکەن تەمومژاوین، و/یان وەڵامی هەندێ پرسیار دەدەنەوە. لە ماوەیەدا خوێندکاران هەمیشە لەبارەی تاقیکردنەوەی کۆتایی پرسیار دەکەن و هەندێ لە مامۆستایان تەقریبەن ئەو سەرەقەڵەمانە دەخەنەڕوو کە لەوانەیە لە تاقیکردنەوە بێنەوە!

ئەگەر پێویستە لە وانەدا ئامادە نەبیت، ئەو تێبینی نووسەرەوە وشە بە وشەیە بدۆزەرەوە کە پەیڕەوی لە ئامۆژگارییەکانی من نەکردووە و تێبینییەکانی لێ وەربگرە. بەم شێوەیە، تۆ خۆت بڕیار دەدەیت چ بایی ئەوەندە گرنگە کە بینووسیتەوە. (لەوانەیە هەندێ لە مامۆستایان تەنانەت تێبینییەکانی خۆیانیانت پێ بدەن. ئەوە دێنێت داوا بکەیت!)

# بەشی شەشەم

## چۆن توێژینەوەکەت ئامادە بکەیت

هەر پرۆژەیەکی توێژینەوە بە ئیشکردن لەگەڵ بابەتەکان یان سەرەقەڵەمەکانی پەخشکردن (و سەرچاوەکانی پەخشکردن) دەست پێدەکات و لەسەرخۆ تەرکیزت بەرتەسک بکەرەوە، زیاتر و زیاتر دیاریکراو بە لە بابەت و سەرچاوەکاندا لەکاتێکدا کە بەردەوام دەبیت.

زانیارییە ئینسایکلۆپیدییەکان زۆرجار گشتگیرترین و دەقیقترینن. ئەمانە ئەوەندە رووبەری زۆر و دەگرنەخۆ و ئەوەندە تازەن کە سەرچاوەیەکی "وێنەی گەورە"ی نموونەیین.

ئەوەشت بیر نەچێت کە بەدوای ئینسایکلۆپیدیایەکدا بگەرێیت کە لەرووی بابەتەوە دیاریکراوە. پێدەچێ کتێبێکی ئەوەندە قەبە هەبێت لەسەر هەر شتێك کە بشی بە خەیاڵتدا بێت، بۆ نموونە: ئینسایکلۆپیدیای کریسمەس، ئینسایکلۆپیدیای رێنیسانس، قاموسی ئایناسی، مێژووی نووسینی ژنان لە فەرەنسا، ئینسایکلۆپیدیای بیابانەکان، ئینسایکلۆپیدیای سیستەمی سۆلار، ئینسایکلۆپیدیای تووتن و جگەرەکێشان، ئینسایکلۆپیدیای پەرستاری، رێبەری ئۆکسفۆرد بۆ خۆراك و هیتر.

ئەگەر تۆ بە نیازیت توێژینەوەیەك بنووسیت لەبارەی کەسایەتییەکی مێژوویی یان هاوچەرخ، بەهەمان شێوە چاوخشاندنێکیش لەبەرچاوبگرە بە قاموسی بیۆگرافی (ژیاننامەیی) یان تەنانەت باشتر، لەبارەی کەسایەتیێەکی دیاریکراو، بۆ نموونە زنجیرەی (کێ کێیە).

بێگومان، بەردەوام سی دی و وێبسایتەکانی سەرچاوە هەن. دەبێ ئەو سەرچاوە زۆر هەنووکەییانە پەیتا پەیتا زیاتر هەڵبژاردنی بابەتێکی باش، دیاریکردنی تێزێکی مەعقول و کۆکردنەوەی زانیاریی پێویست بۆ بونیادنانی سەرەباسە سەرەتاییەکان ئاسان بکەن، بەبێ پێویستبوونی ئەنجامدانی توێژینەوەی قووڵتر.

بەڵام تەواوکردنی توێژینەوەیەك کە "A+" بەدواوە بێت هێشتا پێویستی بەوەیە روو بکەیتە سەرچاوەکانی تر بۆ زانیاریی چڕوپڕتر. پێویستە تۆ ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە کە لەلایەن ئەو شارەزایانە نووسراون کە هی بواری توێژینەوەکەی تۆن، هەروەها وتارەکانی گۆڤار و رۆژنامەکان لەبارەی هەر لایەنێکی بابەتەکەت.

بۆچی لەوێ بوەستیت؟ نامیلکەکان، کۆبەندییەکان، برۆشورەکان، بەڵگەنامە حکومییەکان، فیلمەکان و ڤیدیۆکان تەنیا هەندێك لە سەرچاوەی ئیحتیمالیی زانیارین بۆ توێژینەوەکەت.

هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان

تۆ دەتووانی گەلێك سەرچاوەی بەهێز بدۆزیتەوە کە کاتی ئەوەت نابێت هەموویان بخوێنیتەوە. تەرکیز بخەرە سەر ئەوانەی کە لەهەموویان تازەترن یان لەلایەن سەرچاوە هەرە سەنگینەکانەوە نووسراون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەندە خۆت سنووردار مەکە– زانیاری لە سەرچاوەگەلێکی فراوانەوە کۆ بکەرەوە. بە پێچەوانەوە، لەوانەیە تۆ تەنیا لایەکی مەسەلەکە فێر ببیت.

دوو جۆر سەرچاوە هەن: سەرەکی و لاوەکی.

سەرچاوە سەرەکییەکان ئەوانەن لەلایەن ئەو خەڵکانەوە نووسراون کەبە راستی شایەتی رووداوێکن یان تیایدا بەشدار بوون. کاتێك تۆ راپۆرتی زانایەك دەخوێنیتەوە لەبارەی تاقیکردنەوەیەکی زانستی کە ئەنجامی داوە، ئەوا تۆ دەچیتەسەر سەرچاوەیەکی سەرەکی.

سەرچاوە لاوەکییەکان ئەوانەن لەلایەن ئەو خەڵکانەوە نووسراون کە بە راستی لە رووداوێکدا بەشدار نەبوون، بەڵام لە بابەتەکەیان کۆڵیووەتەوە. کاتێك تۆ کتێبێك لەبارەی ۱۹۵۰کان دەخوێنیتەوە کە لەلایەن کەسێکەوە نووسراوە لە ۱۹٦۰ لەدایك بووە، ئەوا تۆ لە سەرچاوەی لاوەکییەوە فێر دەبیت.

ئەگەری ئەوە هەیە کە سەرچاوە سەرەکییەکان زیاتر سەرچاوەی جێ متمانەی زانیاری بن. بەڵام پەیوەست بە بابەتەکەت، لەوانەیە هیچ سەرچاوەیەکی سەرەکیت لەبەردەستدا نەبن.

### له کویێ بۆ مادده‌کان بگه‌ڕێیت

چۆن ده‌زانیت ئاخۆ که‌سێك وتارێکی ڕۆژنامه یان گۆڤاری له‌باره‌ی بابه‌ته‌که‌ی تۆوه نووسیووه؟ چۆن ده‌زانیت ئاخۆ هیچ به‌ڵگه‌نامه‌یه‌کی حکومی یان نامیلکه هه‌یه که یارمه‌تیده‌ر بێ؟ چۆن شوێنی ئه‌و کتێبه سه‌رچاوه نووسراوانه‌ی شاره‌زاکان ده‌دۆزیته‌وه؟

بێگومان کتێبخانه‌کان و ئینته‌رنێت دوو شوێنی سه‌ره‌کین بۆ به‌رده‌ستخستنی ئه‌و سه‌رچاوانه. کاتێکی زۆر بۆ توێژینه‌وه‌که‌ت ته‌رخان بکه و بیریشت نه‌چێ: باشتره چه‌ند سه‌ردانێکی درێژ بۆ کتێبخانه ڕێکبخه‌یت له‌بری ١٥ بۆ ٢٠ کورته سه‌ردان، وباشتره چه‌ند سه‌عاتێکی ته‌واو له‌سه‌ر ئینته‌رنێت به‌سه‌ر ببه‌یت له‌بری ١٠ خوله‌ك لێره و ١٥ خوله‌ك له‌وێ.

### چۆن کتێبخانه‌کان ڕێك خراون

بۆ فه‌راهه‌مکردنی ڕێکخستن و ئاسانکردنی ده‌ستگه‌یشتن، زۆربه‌ی کتێبخانه بچوك و ئه‌کادیمییه‌کان سیسته‌می پۆلێنبه‌ندیی ده‌یی (دیۆی) به‌کاردێنن، که ژماره‌کان له ٠٠٠ ه‌وه تا ٩٩٩ به‌کاردێنێت بۆ پۆلێنکردنی هه‌موو مادده‌کان به گوێره‌ی بابه‌ت. ئه‌مه به ڕێکخستنی هه‌موو کتێبه‌کان بۆ ١٠ گروپی گه‌وره ده‌ست پێده‌کات.

به له‌به‌رچاوگرتنی ئه‌و ملیۆنه‌ها کتێبه‌ی له کتێبخانه گه‌وره‌کاندا هه‌یه، ته‌نیا دابه‌شکردنیان بۆ ١٠ گروپ هێشتا دۆزینه‌وه‌ی ناونیشانێکی دیاریکراو قورس ده‌کات. بۆیه هه‌ریه‌ك له ١٠ گروپه گه‌وره‌که زیاتر دابه‌ش ده‌بێت بۆ ١٠ و هه‌ریه‌ك له‌م ١٠٠ گروپه‌ی ئێستا بابه‌تی دیاریکراوتری بۆ داده‌نرێت له‌ناو هه‌ر گروپێکی گه‌وره‌دا. بۆ نموونه، له‌ناو پۆلێنبه‌ندیی فه‌لسه‌فه‌دا (١٠٠)، ١٥٠ ده‌روونناسییه و ١٧٠ ئه‌خلاقناسییه. له ناو پۆلێنبه‌ندیی مێژوودا (٩٠٠)، ٩١٠ گه‌شته و ٩٣٠ مێژووی کۆنه.

| | | | |
|---|---|---|---|
| بواری گشتی | ٠٠٠–٠٩٩ | ته‌کنۆلۆژیا | ٦٠٠–٦٩٩ |
| فه‌لسه‌فه | ١٠٠–١٩٩ | هونه‌ره جوانه‌کان | ٧٠٠ – ٧٩٩ |
| ئایین | ٢٠٠–٢٩٩ | ئه‌ده‌ب | ٨٠٠–٨٩٩ |
| زمان | ٤٠٠–٤٩٩ | مێژوو و جوگرافیای گشتی | ٩٠٠–٩٩٩ |
| زانستی سروشتی و ماتماتیك | ٥٠٠–٥٩٩ | | |

تەنانەت دابەشبوونی قووڵتریش هەیە. ماتماتیك ژمارەی خۆی پێدراوە لە زنجیرەی ٥٠٠دا- ٥١٠. بەڵام هەندێ لە بابەت دیاریکراوەکان لەناو ماتماتیکدا قووڵتر دابەشبوون: ٥١١ ئاریزماتیکە، ٥١٢ جەبرە و هیتر.

دواجار، بۆئەوەی ئەرکەکەت ئاسانتریش ببێت، دوایین دوو ژمارە لە رەمزی دێوی-دا دەلالەتە لە جۆری کتێبەکە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| فەلسەفەی... | ٠١ | مامەڵە و رێوشێنەکانی کۆمەڵگە | ٠٦ |
| کورتەکانی | ٠٢ | تاوتووتوێ یان وانەی | ٠٧ |
| قاموسی | ٠٣ | کۆبەندییەکان | ٠٨ |
| وتارگەلێك لەبارەی | ٠٤ | مێژووی | ٠٩ |
| بڵاوکراوەکان لەبارەی | ٠٥ | | |

ئەگەر کتێبخانەکەی ئێوە سیستەمی دێو بەکارناهێنێت، ئەوا لەوانەیە بەپێی کتێبخانەی سیستەمی کۆنگرێس رێکخرابێت کە پیت بەکاردێنێت لەبری ژمارە بۆ دیاریکردنی پۆلێنبەندییە گەورەکان:

A بواری گشتی (ئینسایکلۆپیدیا و سەرچاوەی تر)

B فەلسەفە، دەروونناسی و ئایین.

C مێژوو: زانستە یاریدەدەرەکان (ئارکیۆلۆژی، جینالۆجیا و هیتر)

D مێژووی گشتی

بەکارهێنانی سەرچاوەکانی ئۆنلاین

لەسەر ئینتەرنێت ماددەیەکی زۆر هەیە، ئاسانە کە سەرت سوڕبمێنێت. لەکاتێکدا کە دەشێت زۆر یارمەتیدەر بێ دەستت بکات بە هەندێ وێبسایتی گومانـاوی کە تەنیا ئەو ماددەیەیان هەیە کە تۆ پێویستتە، بەتایبەت کاتێك ئەو کتێب یان دووانەی دەتەوێ تێبینی لەسەر بنووسیتەوە لە کتێبخانەدا نەماون، هێشتا بڕوام وایە کە زۆربەتان کاتێکی زۆر بە فیڕۆ دەدەن ئەگەر زۆرینەی توێژینەوەکەتان لەسەر ئینتەرنێت بکرێت. دەتوانم لە ئەزموونی کەسیمەوە بیڵێم کە ئاسانە لە رێڕەوەکە لابدەیت کاتێك ئۆنلاین توێژینەوە ئەنجام دەدەیت.

"واو، نەمزانی لەسەر بازدان لە هەواوە ئەو هەموو سایتە باشە هەیە. وا باشە سەیریکیان بکەم...هەر ئێستا!"

لەو دوو شتانەی خوارەوە ئاگادار بە:

لەکاتێکدا کە بەشی هەرە زۆری زانیاریی "بنچینەیی" لەسەر وێبسایتە پەیوەندیدارەکانی توێژینەوە بەشێوەیەکی ریشەیی رۆژ بەرۆژ گۆڕانکارییان بەسەر نایەت، ئەمە بۆ هەموو وێبسایتەکان راست نییە. هەروەکو چۆن لەوانەیە وشە سەرەکییە هاوشێوەکە ئەنجامی تەواو جیاواز بخاتەوە ئەگەر دوو رۆژی جیاواز گەڕانی بۆ بکرێت (یان لە دوو ماکینەی گەڕانی جیاواز تاقی بکرێتەوە)، لەوانەیە ئەو ماددەیەی کە بۆی دەگەڕێیت جارێکی تر دیلیت کرابێت. کەواتە ئەگەر تۆ شتێکی بە راستی باشت دۆزییەوە، داونلۆدی بکە، بیخەرە سەر (هارد درایڤ)ەکەت یان پرینتی بکە. بێگومان کتێبی ئۆنلاینی زۆریش هەن بەتایبەت بە پی.دی.ئێف.

ئاراستەیەك بۆ توێژینەوەی ئۆنلاین

من قەرزاری (رۆبین رۆلاند)م، نووسەری (رێبەری ئەفرێنەر بۆ توێژینەوە، ٢٠٠١) بۆ دابینکردنی ئەو پێشنیارانەی خوارەوە لەبارەی چۆنێتیی زیادکردنی کاتی ئۆنلاین:

—ماوەیەکی درێژ پێش وادی رادەستکردنی توێژینەوەکە، چوار ماکینەی گەڕان هەڵبژێرن— یەکێکیان ماکینەیەکی مێتاسێرچ (کە سێرچی ماکینەکانی تری سێرچ دەکات)، سێیەکانی تر سێی ئاسایی بن. ئەمانە پێشنیاری رۆبین—ن: کۆپەرنیك (مێتا)، گووگڵ، هۆتبۆت، ئالتاڤیستا، نۆرزەرن لایت، دۆگپایڵ (مێتا).

—کاتێك دەست دەکەیت بە توێژینەوەکەت، یەکەم جار ماکینەی مێتاسێرچ بەکاربێنە.

—فێری ئەدڤانسد سێرچ (گەڕانی پێشکەوتوو)ی ماکینەکان بە— شتەکان خێراتر و ئاسانتر دەدۆزیتەوە.

— سێ ماکینەی گەڕان هەڵبژێرە بە توانای جیاوازەوە بۆ زیادکردنی تواناکانی گەڕانت.

—بەکارهێنانی ماکینەیەکی گەڕانی تایبەتمەند لەبەرچاو بگرە، وەکو (Beaucoup) ئەگەر نەتتوانیووە ئەوەی دەتەوێ بیدۆزیتەوە یان زانیارییەکی زۆرت دۆزیووەتەوە.

ئەم کتێبە بواری ئەوە نییە لیستێکی بچوکی سایتە سینتەرنێتییە پەیوەندیدارەکان ریز بکات. لە هەرکوێیەك کە دەچیتە سەر ئینتەرنێت، تەنیا بیرت بێت کە:

—هەندێ لەسایتەکان پڕزانیاری و جێ متمانەن، هەندێکیان پرتە و بۆڵەبۆڵی کەسێکی شێتن. تەنیا لەبەرئەوەی شتێك لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت هەیە بەو مانایە نییە کە راستە.

—هەندێکیان زانیاریی بێ لایەنانە دابین دەکەن بەبێ ئەوەی ئەنگێزەیەکی دەرەکییان لە پشتەوە بێت، هەندێکیشیان زانیارییەکانیان لەقاڵب دەدەن بۆئەوەی قەزیەکەی خۆیانیان بەسەرتدا ساغ بکەنەوە. هەندێکیان زانیاری تەنیا بۆئەوە دەخەنەڕوو کە قایلت بکەن شتێك بکڕیت.

—هەندێکیان بەکارهێنانیان ئاسانە، هەندێکیان داوات لێدەکەن بچیتە سەر لیستەکان بۆئەوەی ئەوە بدۆزیتەوە کە پێویستتە.

—هەندێکیان زانیاری دابین دەکەن، هەنێکیشیان رایەڵت دەکەنەوە بە سایتەکانی ترەوە، هەندێکیان تەنیا رزیبەندیی سایتەکانی ترن.

—لەوانەیە هەندێکیان کاتێك جارێکی تر گەڕانیان بۆ دەکەیت نەمابن.

—هەندێکیان بەلاشن، هەندێکیان پارەیەکی کەمیان دەوێ...هەندێکیشیان پارەیەکی زۆریان تێدەچێت. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە جەخت لە نرخەکە بکەیتەوە پێش ئەوەی سایتێك بەکاربێنیت کە پێویستی بە پارەدان بێت.

سەرباری قەبارەی گەورە و گرنگیی سەرچاوەکانی ئینتەرنێت، بە دڵنیاییەوە کتێبخانە لە بلۆك و چیمەنتۆکان داینەسۆر نین. تەنیا لەبەرئەوەی کە دەتوانی بەبێ جێهێشتنی شاشەی کۆمپیوتەرەکەت ت سەردانی تەقریبەن هەر کتێبخانەیەك بکەیت لە جیهاندا، ئەمە هۆکارێك نییە بۆئەوەی خۆت لابدەیت لە ئاشنایەتی لەگەڵ کتێبخانەی قوتابخانەکەت یان شارەکەت. بۆت دەردەکەوێت کە ئەنجامدانی هەندێ شت ئۆنلاین هەمیشە سەرنجڕاکێش، پڕاوپڕ یان خۆش نییە وەك ئەوەی بەشێوەیەکی "کەسی" دەیکەیت.

## بەشی حەوتەم

# چۆن بابەتی نایاب بنووسیت

خوێندنەوەی ئەم بەشە ناتکات بە نووسەرێکی باشی وەها کە بتوانیت واز لە قوتابخانە بێنیت و دەست بکەیت بە سەردانکردنی کتێبفرۆشەکان، لەبەردەم ئەو جامخانانەدا جوان و شیک خۆت دەربخەیت کە دوایین کتێبی پڕفرۆشی تۆی تیادا دانراوە.

بەڵام بەهیچ شێوەیەك هۆکارێك نییە بۆ ترس لە بابەتێکی نووسراو یان راپۆرتێکی زارەکی هەر کە زانیت هەنگاوە سادەکان بگریتە بەر بۆ تەواوکردنی بەشێوەیەکی قەناعەتهێن. هەرکە درك بەوە بکەیت کە ٩٠٪ی ئامادەکردنی بابەتێك هیچ پەیوەندی نییە بە نووسینەوە...یان تەنانەت توانای نووسینەوە و هەرکە دڵنیا بوویت لەوەی کە ئامادەکردنی بابەت لە رێگەی پەیڕەوکردنی ئەو پێشنیارانەی خوارەوەم دەشێ نمرەیەك یان دوو نمرەی بەرزترت لە نمرەکانی پێشووت بۆ دەستبەر بکەن...تەنانەت ئەگەرچی پێت وابێت بۆ نووسەربوون خراپترین نموونەیت.

ئەنجامدانی توێژینەوەی بابەتێك پێویستی بە کارێکی زۆر هەیە. بەڵام ئەنجامەکەشی مەزنە. بۆ نموونە، تۆ فێر دەبیت:

- چۆن زانیاری بدۆزیتەوە لەبارەی هەر بابەتێك.
- چۆن بۆ زانیاری بگەڕێیت و بگەیتە ئەنجامێك لەبارەی ماددەکەت.
- چۆن راپۆرتێکی قووڵی رێك و پێك ئامادە بکەیت.
- چۆن ئایدیاکانت بە روونی و کاریگەرانە بگەیەنیت.

بە راستی مامۆستاکەت پرسیاری ئەوەی لێنەکردوویت توێژینەوەیەك بنووسیت تەنیا بۆئەوەی ژیانت کارەساتبار بکەیت. لە هەموو ئەو شتانەی کە تۆ لە قوتابخانە فێری دەبیت، ئەو شارەزاییەتییانەی کە بەدەستیان دێنیت لەکاتێکدا کە توێژینەوەکەت بەرهەم دێنیت، لەناو شتە هەرە بەنرخەکان دەبێ.

پێنج یاسای بنەڕەتی

با بەو یاسایانە دەست پێبکەین کە پێویستە لە مێشکی تۆدا بدرەوشێنەوە:

١.هەمیشە ڕێنماییەکانی مامۆستا کتومت پەیڕەوی بکە.

٢. هەمیشە بابەت یان توێژینەوەکەت لەکاتی خۆیدا رادەست بکە.

٣. هەمیشە دانەیەکی خاوێن و ڕۆشنی بابەتەکەت رادەست بکە.

٤. هەمیشە لانی کەم دانەیەك لەو بابەتەی کە دەینووسیت لای خۆت بهێڵەرەوە.

٥.قەت مەهێڵە تاکە هەڵەیەکی ڕێزمانی لەو بابەتەدا کە دەینووسیت هەبێ.

دەبێ چەند درێژ بێت؟

دەشێ ڕێنماییەکانی مامۆستاکەت ئەمانەی خوارەوە بگرێتە خۆ:

رووبەرێکی گشتی کە دەبێ بابەتەکەی لێ هەڵبژێردرێت- "لایەنێکی سەرۆکایەتیی هێربێرت هوڤەر"، "ململانێیەکی شەڕی ناوخۆ"، "یەکێك لە یاساکانی نیوتن" یان " کورتەچیرۆکێك لەلایەن نووسەرێکی روسیی سەدەی بیستەمەوە".

-پێداویستیی دیاریکراو لەمەڕ ڕێکخستن

-درێژییەکی پێشنیارکراو

-شێوازی دڵخوازتر بۆ دانانی پەراوێز و دۆکیومێنتکردنی ئەو بەرهەمانەی سوودیان لێوەرگیراوە

-ڕێنمایی دیاریکراوی تر

ڕێنماییەکانی هەرچییەك بن، "وەکوخۆی پەیڕەوییان بکە". دەشێ هەندێ لە مامۆستایانی ئامادەیی لە سنووربەزاندنەکانت خۆش بن، بەڵام من ئەو مامۆستایانەی کۆلێژ دەناسم کە

تەنیا لەبەر ئەوە بابەتێکیان رەت کردووەتەوە کە بە گوێرەی رێنماییەکانیان ئامادە نەکراون– و خوێندکاری داماویان راسب کردووە (تەنانەت بەبێ ئەوەی بیشیخوێننەوە).

لەوانەیە جارێك لە جاران رووبەڕووی ئوستادێك یان مامۆستایەك ببێتەوە کە رێنماییەکی کەم یان رێنمایی هەر نەدات. تۆ پرسیار دەکەیت، "دەبێ نووسینی بابەتەکە چەند بخایەنێ؟" لە وەڵامدا دەڵێت "ئەوەندەی کە پێی دەچێت". ژیریی باوی خۆت بەکاربێنە. ئەگەر تۆ لە ئامادەییت ئەوا وای بۆدەچم کە چاوەڕێی تێزێکی ٥٠ لاپەڕەیی بکات. بەهەمان شێوە، ئەگەر لە کۆلێژیت، لەوانە نییە ئوستادەکەت پێی وابێت بابەتێکی سێ لاپەڕەیی بە مانای "ئەوەندەی کە پێی دەچێت" دێت. واجبەکانی پێشووت وەکو رێبەرێك بەکاربێنە.

ئەگەر تۆ لە پێداویستیی دیاریکراو دڵنیا نیت یان ئەگەر رووبەری پێشنیارکراوی بابەتەکە روون نییە، ئەوا بەرپرسیارێتیی تۆیە قسە لەگەڵ مامۆستاکەت بکەیت و هەر خاڵێك بخەیتەڕوو کە سەرت لێ دەشێوێنن.

بیرۆکەیەکی خراپ نییە کە دوو یان سێ ناونیشان هەڵبژێریت کە حەز دەکەیت لەبارەیانەوە بنووسیت و داوای پەسەندکردنێکی سەرەتایی بکەیت، بەتایبەت ئەگەر واجبەکە لێڵ دیار بێت.

بۆیە ئەو کاتە سەگەکەم کاغەزەکانی بابەتەکەی جووی

بە دڵنیاییەوە هۆکارێك نییە، جگە لە نەخۆشییەکی کارەساتبار یان ئیمێرجێنسییەکی مەترسیدار، کە تۆ جارێك لە جاران واجبەکەت دوابخەیت. جارێکی تر، هەندێ لە مامۆستایان بابەتێك رەت دەکەنەوە درەنگ کەوتبێت. لە باشترین حاڵەتدا، لەبەرانبەر درەنگ کەوتنەکەیدا نمرەت لێ دەشکێنن، لەوانەشە (A)یەك بکەن بە (B)...یان خراپتر. لە حاڵەتی هەبوونی پاساوی رەوا (بۆ نموونە، نەخۆشی درێژخایەن، مەرگ لەناو خێزاندا و هیتر) با مامۆستاکەت دەستبەجێ بزانێ و داوای درێژکردنەوەی ماوەکە بکە.

ئەو پەڵە مرەبایە نرخەکەی چییە؟

دەبێ مامۆستایان ژمارەیەکی زۆری بابەتەکان بخوێننەوە و نابێ لۆمە بکرێن ئەگەر، پاش سەدان لاپەڕە، بگەنەسەر راپۆرتە نوشتاوە، قاوە پێدا رژاوە، بەقەڵەم رەساس نووسراوەکەت و کەمێك سارد ببنەوە. نە دەشبێت تۆ سەرت بسوڕمێت لەوەی کە نمرەیەکی نزمتر بێنیت

لەوەی کە ناوەرۆکەکە شایستەیەتی تەنیا لەبەرئەوەی کە "پێشکەشکردنەکە"ی زۆر لاواز بووە.

ئەگەر، ناوەرۆك ئەوەبێ کە مامۆستایە دەیەوێ، دەبێ لەسەر ئەوەی کە دەینووسیت نمرەت بداتێ. بەڵام پێشکەش کردن گرنگە. مامۆستایان تەنیا مرۆڤن (بە راستمە!) و ناتوانی لە بەرانبەر هەوڵدان بۆ پێوتنت کە شانازی بە ئیشەکەی خۆتەوە بکەیت، لۆمەیان بکەیت. بۆیە ئەم پێشنیارانەی خوارەوە پەیرەو بکە:

–قەت بابەتەکەت بە دەست مەنووسەرەوە.

–ئەگەر کۆمپیوتەر بەکاردێنیت، پشکنینێکی مەرەکەبی کاتریجی پرینتەرەکە بکە بۆ دڵنیا بوونەوە لەوەی کە لاپەڕە پرینتکراوەکانت خاوێن و رۆشنن.

–مەگەر ئەوەی کە پێت وترابێت نەیکەیت، دەنا هەمیشە بابەتەکەت دەبڵ سپەیس بکە. بایی پێویست مەودای پێویستی لاکان (کەنارەکان) لە چوار دەور بەجێ بێڵە.

–فۆنتی سادەی وەها بەکاربێنە کە رۆشن و ئاسان بێت بۆ خوێندنەوە، خۆت دوور بگرە لەوانەی کە زۆر گەورەن– ٥ لاپەڕە بۆ ١٠ لاپەڕە درێژ دەکەنەوە– یان زۆر بچوك و خوێندنەوەیان زەحمەتە.

–هەرگیز فۆنتی جوانکاری و لار (ئیتالیك)، مۆدێرن یان هی ئەستەم بۆ خوێندنەوە بۆ تەواوی بابەتەکەت بەکار مەهێنە.

بابەتە کۆنەکانت وەکو نەخشە بەکاربێنە

دەبێ ژمارەیەك پەیامی یارمەتیدەر لەسەر بابەتەکە گەڕاوەکانت هەبن، هەربۆیە هێشتنەوەیان لای خۆت گرنگن. دەبووایە مامۆستاکەت چی بڵێت؟ ئایا قسەکانی دێنەوە لەگەڵ ئەو بابەتەی ئێستا دەینووسیت– رێزمانی لاواز، نەبوونی رێکخستن، نەبوونی توێژینەوە، گواستنەوەی خراپ لە پەرەگرافێکەوە بۆ پەرەگرافێکی تر، خراپ حینجە کردن؟ ئەم قسانە چەند زۆر بن– و دەشێ پێشبینی نمرەی نزمتریش بکرێ– ئەوەندەش ئەو "نەخشە"یە فراوانتر دەبێ کە مامۆستاکەت داویەتی پێت بۆ بابەتی دواترت، کە پیشانت دەدات A+ەکەت لە کوێیە.

ئەگەر تۆ لە بابەتی پێشوو نمرەیەکی نزمت هێنابێت بەڵام هیچ قسە یان کۆمێنتی لەسەر نەبوو، پرسیار لە مامۆستا بکە بۆچی نمرەیەکی وەها لاوازت هێناوە. لەوانەیە تۆ ئەو

کۆمێنتانــە وەربگریــت کــە پێویــستتن بــۆ ئــەوەی بابــەتی داهــاتووت باشــتر بکــەیت و بــە مامۆستاکەتی پیشان بدەیت کە تۆ بە راستی خەمخۆریت، کە دەشێ یارمەتیدەریش بێت بۆ نمرەکەت لە جارێکی تردا.

زۆرێك لە خاوەنکاران بێ باکانە تەنیا سیڤییەکانیان بەکاردێنن و نامە پڕ لە خەلەلی حینجە و رێزمانییەکان بۆ پرۆڤەی یاریی سەللەی خۆڵەکە دەهێڵنەوە. چاوەڕێ مەکە مامۆستاکەش لەوە بەخشندەتر بێت– بێگومان کەسانێکی کەم هەن کە راسب دەکەن تەنانەت بەبێ تێبینیکردنی ئەمەی کە پاشماوەی بابەتەکە نایابە. مەزەندەی ئەوە بکە کە تەنیا زۆر بە خراپی "قوستەنتنیە"ت خراپ حینجە کردووە یان لە زەمەنەکانت هەڵەت کردووە.

سیستەمی بابەت نووسینی فرای

چەندەی ئەرکێك قورستر بێت یان چەندەی زیاتر پێویستت بە کات بێت بۆ تەواوکردنی، ئەوەندەش رێکخستنەکەت گرنگتر دەبێت. بە دابەشکردنی هەر بابەتێك بۆ زنجیرەیەك لە هەنگاوی بەرێوەبراو، ئەوا تۆ پەیتا پەیتا کەمتر هەست بە سەرگەردانی، سەرقاڵی و ترس دەکەیت.

ئەمانەی خوارەوە ئەو هەنگاوانەن کە، بە دەستکاری بچوك بچوکەوە بەپێی پێویست، لە هەموو بابەت و راپۆرتێکدا تەقریبەن هاوبەشن:

١.ناونیشانە بەهێزەکانی توێژینەوە
٢.بە کۆتا گەیاندنی ناونیشان
٣.ئەنجامدانی توێژینەوەی بەرایی
٤.ئامادەکردنی چوارچێوە گشتییەکان
٥.ئەنجامدانی توێژینەوەی چڕوپڕ
٦.ئامادەکردنی چوارچێوەی چڕوپڕ
٧.نووسینی یەکەمین رەشنووس
٨.ئەنجامدانی توێژینەوەی زیادە (گەر پێویست بوو)
٩.نووسینی دووەمین رەشنووس
١٠.ئامادەکردنی بیبلۆگرافیای کۆتایی
١١.پشکنینی سپێل و هەڵەراستکردنەوە بە تەواوی
١٢.راسپاردنی کەسێکی تر بە پێداچوونەوەی
١٣.ئامادەکردنی دوایین رەشنووس
١٤.پێداچوونەوە بۆ دوایەمین جار
١٥. رادەستکردنی و وەرگرتنەوەی A+ەکەت

**دروستكردنی خشتەیەكی كار**

ئەنجامـدانی هـەموو ئـەو ئەركانـە بەشـێوەیەكی پڕاوپـڕ و كاریگـەر پێویـستی بـە تـەوقیت و پلاندانانێكی بەئاگایانە هەیە. لەوانەیە ئەمە تاكە واجب بێت- یان تەنانەت تاكـە بابـەت بێـت- كە دەبێ لە بڕەكاتێكی كورتدا تەواوی بكەیت.

لە هەر هەفتەیەكدا ماوە دانراوەكانی كات جیا بكـەرەوە بـۆ ئیشكردن لەسـەر بابەتەكـەت. هەوڵ بدە بڕی گەورە گەورەی كات بە خشتە بكەیت- لانی كـەم دوو بـۆ سـێ سـەعات، ئەگـەر دەكرێ- نەك كورتە ماوەی زۆر. دەنا، كاتێكی زۆر بە هەوڵدان بۆ بیرهاتنـەوەی ئـەوەی ئـەخیر جار لەسەر چ شتێك بوویت و بە دووبارەكردنەوەی هەنگاوە ناپێویستەكان بە فیڕۆ دەدەیت.

لەكاتێكدا كە تـۆ پلانـی هەفتەكـەت دادەنێیـت، دوا مۆڵـەت دابنـێ بـۆ تـەواوكردنی هـەنگاوە گشتییەكانی پرۆسەی بابەت نووسینەكەت. بۆ نموونە:

هەفتەی ١: لەسەر ناونیشانەكەت و "گۆشەنیگا"ی بابەتەكەت بڕیـار بـدە. لیـستێكی مـاددە سەرچاوەكان ئامادە بكە.

هەفتەی ٢-٤: ماددە سەرچاوەكان بخوێنەرەوە، تێبینی بنووسەرەوە

هەفتەی ٥: چوارچێوەی چڕوپڕ بنووسەرەوە، یەكەم رەشنووس بنووسە.

هەفتەی ٦-٧: بابەتەكەت چاك بكە، بیبلۆگرافیا ئامادەبكە.

هەفتەی ٨: بە بابەتەكەتدا بچۆرەوە، دوایین كۆپی پرینت بكە.

بێگومان من ناتوانم پێتان بڵێم چەنێك كات بـەلاوەنێن بـۆ هـەر هـەنگاوێك، چـونكە مـن هـیچ وردەكارییەكی بابەتەكانتان نازانم- دەبێ چەندە درێژ بێت، ناونیشانەكە چەندێك ئـاڵۆزە- یـان چەندێك خێرا ئیش دەكەن. دەتـوانم پێتـان بڵـێم كـە دەبـێ پـلان دابنـێن بـۆ پـرس و را و/یـان نووسینەوەی تێبینی لە لانی كەم شەش سەرچـاوەی جیـاوازەوە. (لەوانەیـە مامۆسـتاكەت یـان بابەتەكە داوای زیاتر بكات، پێم وایە كەمترتان پێویست دەبێ) و پلان دابـنێ بـۆ دوو یـان سـێ رەشنووسی بابەتەكەت پێش ئەوەی بە كۆتای لەقەڵەم بدەیت.

زوو زوو بگـەڕێرەوە سـەر خـشتەی كارەكـەت و خێراییەكـەت زیـاد بكـە ئەگـەر زانیـت لـە دواكەوتندایت.

چەندەی كاتت زیاتر بێـت بـۆ تـەواوكردنی پرۆژەیـەك، ئەوەنـدەش ئاسـانتر دەبـێ تەمبـەڵی بكەیت لەبەرانبەر ئیش تیاكردنیدا، تەنانەت ئەگەرچی جیاكردنـەوەی هـەنگاوەكان دوابخـەیت و

بیانخەیتە ناو خشتەی ئاساییەوە. ئەگەر بۆت دەرکەوت کە خەریکی جێهێشتنی ئەو پرۆژە دوورمەودایانەیت بۆ دوایین هەفتە، یەکەم جار پرۆژەکان بۆ کاتێکی دوورتر بە خشتە بکە.

پاشان فریوی خۆت بدە– لانی کەم حەوت ڕۆژ پێش بەرواری ڕاستەقینە، بەرواری تەواوکردن بە خشتە بکە. بەمەش مەودایەکی یەك هەفتەیی بە خۆت دەدەیت لەبەرانبەر سەرپرایزە حەتمییەکانی ژیاندا. (تەنیا هەوڵ بدە بیرت چێتەوە کە فێڵێکی وەهات بەکارهێناوە، ئەگینا وەکو ئەو درەنگ کەوتووە خووگرتووە دەبیت کە ١٥ خولەك سەعاتەکەی پێش دەخات وەکو هەوڵێك بۆ گەیشتنی هاوکات بۆ شوێنێك. بەڵام ئەو هەمیشە بیر خۆی دێنێتەوە کە ١٥ خولەك لە سەعاتەکەی پێش بخات، بەمەش تەواوی ئامانجەکەی شکست پێدێنێت).

**هەنگاوەکانی ١ و ٢: بژاردەکانی هەڵبژاردنی ناونیشان لەبەرچاو بگرە**

لە هەندێ حاڵەتدا، مامۆستاکەت ناونیشان دیاری دەکات. لەوانیتردا، ڕووبەرێکی گشتی دیاری دەکات، بەڵام سەربەستت دەکات لە هەڵبژاردنی ناونیشانێکی دیاریکراو.

هەندێ کۆسپ هەن کە پێویستە خۆتیان لێ بەدوور بگریت. با بڵێین تۆ پێویستت بەوەیە بابەتێکی ١٥ لاپەڕەیی بۆ وانەی مێژووت بنووسی و بڕیار بدەیت کە ناونیشانەکە بەم شێوەیە دەبێت "سەرۆکایەتیی فرانکلین دیلانۆ ڕۆزڤێلت".

ئایا دەتوانیت لە ١٥ لاپەڕەدا ناونیشانێکی وەها فراوان ڕوومالّ بکەیت؟ نەخێر ناتوانیت. تۆ دەتوانیت چەند بەشێك یان چەند ئەڵقەیەك لەسەر بابەتەکە بنووسیت و هێشتا زۆر مابێت بیڵێیت!

لەبری ئەمە، تۆ پێویستت بە تەرکیزخستنەسەر لایەنێکی سنووورداری دیاریکراوی بابەتێکی وەها فراوان هەیە یان لە گۆشەیەکی ترەوە بۆی بچوو. ئەمە چۆنە "بۆچی فرانکلین دیلانۆ ڕۆزڤێلت هەوڵیدا دادوەری نوێ بۆ دادگای باڵا دابنێ"؟

بیرت نەچێ، ئیشی تۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی قووڵە لەبارەی بابەتەکەت. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە دەتوانیت ئەمە لەوچەند ژمارە لاپەڕەیەدا جێبەجێ بکەیت کە مامۆستاکەت داوای کردووە.

ئەگەر بابەتێك هەڵبژێری کە زۆر سنووردارە لەوانەیە تۆ لە دووەمین لاپەڕەی بابەتەکەتدا شتت لێ ببڕێت بۆ وتن. لەوانەیە تۆ بتوانیت دوو سێ لاپەڕە لەسەر "چۆن فرانکلین دیلانۆ رۆزڤێلت تووشی ئیفلیجی بوو" بنووسیت، بەڵام ۱۰ بۆ ۱۵ لاپەڕە پڕ ناکەیتەوە...تەنانەت ئەگەرچی بوارێکی زۆریشت هەبێ.

ئەگەر ناتوانیت تاکە کتێبێك لەسەر ناونیشانە گریمانەییەکەت بدۆزیتەوە، جارێکی تر بیری لێبکەرەوە! لەکاتێکدا کە هەڵبژاردنی ناونیشانێك کە دەتوانرێ لە رێگەی وتارەکانی گۆڤار، رۆژنامە، ئینتەرنێت و هیتر توێژینەوەی لەسەر بکرێ، بۆچی توێژینەوەکەت ئەوەندە قورس دەکەیت کە پێویست ناکات؟

ئەگەر ناونیشانێك هەڵبژێریت کە زۆر تەماوییە ئەوا لەوانەیە بۆت دەرکەوێت کە زانیارییەکی کەم لەبارەیەوە هەیە. لەو حاڵەتەدا، دەبێت تۆ تاقیکردنەوەی زانستیی خۆت ئەنجام بدەیت، خۆت گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکە پەیوەندیدارەکانی ناو توێژینەوەکەت بکەیت و بە داتای بنچینەیی خۆتەوە بێیتە ناو گۆڕەپانەکەوە. من وای بۆ دەچم کە تۆ نە کات و ئارەزوو و نە ئەزموونی ئەوەت هەیە ئاراستەیەکی وەها دەستپێکردن لە هیچەوە بگریتەبەر.

لەوە زیاتر قەپ مەگرە کە ناتوانیت بجوویت، بەڵام دڵنیا بەرەوە لەوەی کە شتێك هەیە بیجوویت! و دڵنیا بەرەوە لەوەی کە بایی پێویست سەرچاوەی جیاوازی ماددەکە هەن– نووسەری جیاجیا، کتێبی جیاجیا، روانگەی جیاجیا– بۆئەوەی بتوانیت دیدێکی هەمەڕەنگت هەبێت لە بابەتەکەت (و ناچار نەبیت، بەهۆی نەبوونی ماددەی ترەوە، کە رێگاگەلێك بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی بیرۆکەکانی کەسێکی تر وا لێبکەیت وەکو هی خۆت دەربکەون).

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەوانەی سەرەوە، ئێستا کەمێك لەبارەی ناونیشانە شیاوەکان بیر بکەرەوە بۆ بابەتەکەت. بە یەکەمین بیرۆکە مەوەستە– بە ژمارەیەك شیمانەی جیاوازەوە وەرە پێش. جارێ ئەم کتێبە دابنێ تا ئەو کاتەی کە لیستێکی سێ یان چوار ناونیشانیت ئامادە کردووە.

ئەی لەبارەی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بابەت بۆ دوو وانە یان زیاتر لە هەمان توێژینەوە؟ لەوانەیە تۆ نەتوانیت هەروا بە سادەیی بابەتێك بۆ دوو وانە ئامادە بکەیت، بەڵام بە توێژینەوەیەکی زیاتر– نەك ئەوەی کە پێویستە بیکەیت بۆ بابەتێکی تەواو جیاواز– لەوانەیە

زۆر بە باشی بەشێکی یەکەم بابەت وەکو بنچینە بۆ دووەمیان بەکاربێنیت. چ ڕێگایەکی بێ وێنەیە کاتی کتێبخانەت زیاد بکەیت!

هەنگاوی ٣: توێژینەوەی سەرەتایی کتێبخانە دەست پێبکە

لیستەکەت ئامادە کرد؟ کەواتە بچوو بۆ کتێبخانە. پێویستت بە کەمێك توێژینەوەی پێشکەوتوو هەیە. بزانە چەند کتێب و وتاری پەیوەندیدار بە هەر ناونیشانێکی سەر لیستە گریمانەییەکەت نووسراون. پاشان، کورتەیەکیان لێ بخوێنەرەوە لەبارەی هەر ناونیشانێکەوە.

لەبەرانبەردا، کاتێکی کەم لەسەر ئینتەرنێت بەسەر ببە. ئایا وێبسایتی وا هەن کە تایبەت بن بە ناونیشانەکەی تۆ؟ چەند خۆشبەختیت! یان ئایا گەڕانێکی وشەی سەرەکی دەبێتەهۆی دەستەبەربوونی ١٠,٤٢٤ ئەنجام، کە هیچیان پەیوەندییان بە ناونیشانەکەی تۆوە نییە؟

هەر ڕادەیەك لە بەخت کە هەتبێ، دەبێ لانی کەم ناونیشانێکت دەستکەوێ کە وادیار بێ بابەتێکی توێژینەوەی باشە. ئەگەر ناونیشانێك یان زیاتر بە فلتەری توێژینەوەی سەرەتاییدا تێپەڕی، ئەوەیان هەڵبژێرە کە گونجاوترە. تۆ کاتێکی زۆر بەسەر دەبەیت لە فێربوون لەبارەی ماددەکەتەوە. یاسایەك نیە کە بڵێت خۆش بەسەر نابەیت!

تێزێکی کاتی گەڵاڵە بکە

هەر کە ناونیشانەکەت بۆ بابەتەکەت هەڵبژارد، پێویستە تێزێکی کاتی گەڵاڵە بکەیت. (وشەی تێز نزیکە لە "هایپۆسەسیس" و هەمان مانا دەگەیەنن– ئەو بەڵگاندنە سەنتەرییەی کە دەتەوێ بیسەلمێنیت یان ڕەتی بکەیتەوە لە بابەتەکەتدا. تێز وەکو بابەتێك نییە. بابەتەکەت ئەوەیە کە تاووتوێی دەکەیت، تێزەکەت ئەو ئەنجامگیرییەیە کە لەو تاووتوێکردنەوە دەستت دەکەوێ).

"گوزارشتێکی تێز" بیرۆکەی سەرەکیی بابەتەکەت کۆ دەکاتەوە، ئەمە بە گشتی تەنیا ڕستەیەك یان دووانە.

بزانە من وتم تێزێکی کاتی. مەرج نییە ئەمە ببێتە تێزی کۆتاییت. لەبەرئەوەی هەموو توێژینەوەکەت هێشتا تەواو نەکردووە، لەم ساتەدا دەتوانیت تەنیا بە تێزی "باشترین مەزەندە"ت بێیتە پێش.

ئەگەر تێزی کاتی بە ئاسانی نایەتە مێشکتەوە– و لەوانەشە هەر نەیەت– ئەوا دانیشە و کەمێکی تر بیر بکەوە. ئەم پرسیارانە لە خۆت بکە:

–چ شتێك تایبەت یان نائاسابیە لەبارەی ----------؟ (بۆشاییەکە بە ناونیشانی بابەتەکەت پڕ بکەرەوە).

----------چۆن پەیوەندی هەیە بە ڕووداوەکانی ڕابردووەوە؟

--------چ کاریگەرییەکی لەسەر کۆمەڵگە دروست کردووە؟

–دەمەوێ جیهان چی بزانێت لەبارەی ------؟

–چ پرسیارم هەیە لەبارەی ---------؟

لەوانەیە تۆ لە ماوەی ئەم قۆناغە سەرەتاییە توێژینەوەدا بۆت دەرکەوێ کە تێزە کاتییەکەت بە خێرایی پەیدا نابێ. دەشێ پێداچوونەوەی بوێت، لەوانەیە تەنانەت لەسەر تێزێك بگیرسێیتەوە کە ڕێك پێچەوانەی بنچینەییەکەی تۆیە! لە ڕاستیدا دەشێ پێویست بکات لەماوەی توێژینەوەکەتدا چەند جارێك بە تێزەکەتدا بچیتەوە.

هەنگاوی ٤: چوارچێوە کاتییەکە دابنێ

هەر کە تێزە کاتییەکەت گەڵاڵە کرد، بیر لەوە بکەوە چۆن دەشێ بۆ ماددەکە بچیت. ئەو پرسانە ریز بکە کە پلان دادەنێیت لێیان بکۆڵیتەوە. پاشان چوارچێوە کاتییەکە بە پوختی دابنێ، ئەو ڕێکخستنە پیشان بدە کە تیایدا دەشێ تاووتوێی ئەو پرسانە بکەیت.

هەنگاوی ٥: توێژینەوەی چڕوپڕ ئەنجام بدە

ئێمە هەنوکە باسی سەرچاوەکانی کتێبخانە و ئینتەرنێتمان و ئەمەی کە چۆن سوودیان لێوەربگرین کردووە. با ئێستا کتومت باسی ئەوە بکەین چۆن هەموو ئەو سەرچاوە و زانیارییەی بۆ بابەتەکەت کۆیان دەکەیتەوە ڕێك دەخەیت.

لێرەدا دوو هەنگاو هەن. یەکەم، تۆ کاغەزە بچوکەکانی سەرچاوەکان (بیبلۆگرافی) دروست دەکەیت بۆ هەر سەرچاوەیەك کە دەتەوێ تەماشای بکەیت. پاشان هەموو زانیاریی ناو سەرچاوەکانت دەگوازیتەوە بۆ ناو تاکە لیستێك– بیبلۆگرافییە کردارییەکەت.

لەوەتەی کەسێك یەکەم بابەتی توێژینەوەی نووسیووە شێوازی دوو هەنگاوەکە لەئارادابووە و بە پاساوێکی باشیشەوە: شتێکی کرداریيە! ئەمە یارمەتیت دەدات توێژینەوەکەت بە شێوازێکی پڕاوپڕ و رێکخراو ئەنجام بدەیت و ئامادەکردنی دوایین بیبلۆگرافیت ئاسانتر دەکات.

بۆ دروستکردنی بیبلۆگرافییە کردارییەکەت، پێویستت بە کۆمەڵێك کاغەزی بچوکی ٣ بە ٥ هەیە. تۆ بەهەمان شێوە کاغەزە بچوکەکان ئەو کاتە بەکاردێنیت کە تیبینی بۆ بابەتەکەت دەنووسیتەوە، بۆیە ئێستا بەستەیەکی گەورە لەو کاغەزە بچوکانە بکڕە. لەوانەیە نزیکەی ٣٠٠ دانە بەس بێت. لەکاتێکدا کە تۆ خەریکی ئیشەکەتیت، یەکێك لەو بۆکسانە هەڵگرە کە بۆ هەڵگرتنی کاغەزە بچوکەکان دیزاین کراون. ناو، ناونیشان و تەلەفۆنی خۆتی لەسەر بنووسە. ئەگەر بزرت کرد، ئەوا غەریبەیەك دەتوانێ (هیوادارم) بۆتی بگەڕێنێتەوە.

گەڕانێکی سیستەماتیکی دەست پێبکە بۆ هەر مادەیەك کە دەشێ زانیاری تێدا بێت بۆ بابەتەکەت. کاتێك تۆ کتێبێك، وتارێك یان سەرچاوەیەك دەدۆزیتەوە کە مژدەبەخش دیارە، کاغەزێکی بچوکی بەتاڵ دەربێنە. لە پێشەوە کاغەزەکە ئەم زانیارییانەی خوارەوە بنووسە:

لە لای راستی سەرەوەی کاغەزەکە: ژمارەی ریزبەندیی کتێبەکە بنووسە، ئەگەر هەبوو، یان تەواوی وێب ئەدرێسەکە بنووسە. هەر زانیارییەکی تریش بنووسە کە یارمەتیدەرە بۆ دۆزینەوەی ماددەکە لەسەر رەفەی کتێبخانەکە.

لە بەشی سەرەکی کاغەزەکە: ناوی نووسەرەکە بنووسە، ئەگەر درابوو- یەکەم جار ناوی ئەخیر، پاشان ناوی یەکەم و ئینجا ناوی ناوەڕاست. پاشان تایتڵی وتارەکە، ئەگەر دەگونجێ، لەناو دوو جووت کۆما(علامە نقل القول)دا. پاشان ناوی کتێبەکە، گۆڤارەکە، رۆژنامەکە، وێبسایتەکە- بە هێڵ لەژێردراوی.

(ئەگەر تۆ هەنوکە تەواوی وێب ئەدرێسەکەت لە سوچی لای راست نووسیووە، پێویست ناکات دووبارە بینووسیتەوە).

هەر وردەکارییەکی تر کە پێویستە هەتبێ بۆ جارێکی تر دۆزینەوەی کتێبەکە یان وتارەکە، بۆ نموونە:

-بەرواری چاپکردن

–چەندجارەی چاپکردن– بۆ نموونە، "چاپی سێیەم ١٩٩٠" بۆ کتێبێك، "چاپی بەیانییان" بۆ رۆژنامەیەك.

–ژمارە چەندە یان بەرگی چەندە

–ژمارەی ئەو لاپەڕانەی کە وتار یان زانیارییەکەی تێدایە

جارێکی تر، شتێکی جەوهەرییە کە تەواوی وێب ئەدرێسی سەرچاوەکە بنووسیت، نەك تەنیا وێبسایتە سەرەکییەکە. گەڕان لە سایتێکی ئالۆزدا بۆ دۆزینەوەی ئەو ئیقتیباسە کورتەی نوسیووتە دەشێ کات بە فیڕۆ بدات.

لە سوچی چەپی سەرەوەی کاغەزەکە: ژمارەی لێبدە. یەکەم کاغەز کە لەسەری دەنووسیت ژمارە یەکە # ١، دووەمیشیان # ٢ و بەم شێوەیە. ئەگەر رێکەوت ژمارەیەك تێکەڵ بکەیت و بەسەریدا تێپەڕیت، نیگەران مەبە. تەنیا ئەوە گرنگە کە ژمارەیەك بۆ هەر یەکێك لە کاغەزەکان دیاری بکەیت. ئەمە بۆ هەر سەرچاوەیەکی شیمانەیی زانیاری کە دەیدۆزیتەوە ئەنجام بدە، تەنیا یەك سەرچاوەش بۆ هەر یەکێك لە کاغەزەکان دابنێ. بوارێکیش لەسەر کاغەزەکە جێ بێڵە– کاتێکی دواتر زانیاریی زیاتری لەسەر دادەنێیت.

نموونەی کاغەزێکی بیبلۆگرافی بۆ کتێبێك

| |
|---|
| ١ |
| ٣١٤,٦ |
| **ژووری سەرەکیی خوێندنەوە** |
| **سپێشلەر، جەی دەبلیو.** |
| **یاسای ملکەچیی سوودگەرایانە لەگەڵ یاسای ئەمریکییە کەمئەندامەکان** |
| **(بەتایبەت سەیری لاپەڕە ٥٤-٦١ بکە)** |
| **کتێبخانەی کۆلێژ** |

نموونەی کاغەزێکی بیبلۆگرافی بۆ وتارێکی گۆڤارێك

٢

www.timeince.com/pub/2003/index.html

سمۆلۆ جیلٚ

ئامانجە پیرۆزەکان، ئەنجامە تێکەڵەکان"

گۆڤاری تایم

(٣١ی جولای، ٢٠٠٣، لاپەڕە ٥٤-٥٥)

نموونەی کاغەزێکی بیبلۆگرافی بۆ وتارێکی ڕۆژنامەیەك

٢

www.nytimes/index/404/5.html

وەید بێتسی

"دەست نەگەیشتن بە هۆتیلەکانی دێهات لەژێر مشتومڕدا"

گۆڤاری تایم

(٣١ی جولای، ٢٠٠٣، لاپەڕە ٥٤-٥٥)

ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز

(١٤ی نیسانی ٢٠٠٤، قسمی ٥، لاپەڕەی ٤)

ئامادەبوون بۆ نووسینەوەی تێبینییەکان

کاغەزەکانی بیبلۆگرافی وەکو نەخشەیەك وەهان بۆ سۆراخکردنی گەنجینەی زانیارییەکانت. پێنج شەش کاغەز دەربێنە و ئەو ماددانە بدۆزەرەوە کە لەسەر کاغەزەکان لیست کراون. کەمپێك لەسەر مێزەکەت یان ریحلەکەت دابنێ و دەست بکە بە ئیش.

کاتێك بابەتەکەت دەنووسیت، هەموو ئەو زانیارییە بەدەست دێنێت کە پێویستتە لە تێبینییەکانتەوە، نەك لە سەرچاوە بنچینەییەکانەوە. بۆیە، گرنگە کە تێبینیی وریایانە و تەواو بنووسیتەوە. دەبێ چ جۆرە زانیارییەك بخەیتە ناو تێبینییەکانەتەوە؟ هەر شتێك کە پەیوەندی هەبێت بە ماددەکەتەوە و بەتایبەت تێزەکەتەوە. ئەم شتانە دەگرێتە خۆ:

١.زانیاریی گشتیی پەیوەند بە پێشینە (ناو، بەروار، داتای مێژوویی).

٢.ئاماری توێژینەوە

٣.ئیقتیباسی شارەزایان

٤.پێناسەکانی زاراوە تەکنیکییەکان

دەشێ تۆ راهاتبیت لەسەر ئەوەی جۆرێك لە دەفتەرەکانی یادداشتت هەبێت. من رێگایەکی باشترتان پێدەڵێم –تۆمارکردنی هەموو تێبینییەکانتان لەسەر کاغەزە بچوکەکان.

با بڵێین تۆ کتێبێکی سەرچاوەت دۆزیووەتەوە کە هەندێ زانیاری تێدایە لەبارەی ماددەکەتەوە. پێش ئەوەی دەست بکەیت بە نووسینەوەی تێبینییەکان، کاغەزی بیبلۆگرافییەکەت بۆ ئەو کتێبە دەربێنە.

دڵنیا بەرەوە لەوەی کە هەموو زانیاریی سەر کاغەزەکەت دروستە. ئایا تایتڵەکە رێك ئەوەی سەر کتێبەکەیە؟ ئایا ناوی نووسەرەکە بە دروستی سپێل کراوە؟ هەر زانیارییەکی تر ئیزافە بکە کە دەتەوێ لە دوایین بیبلۆگرافییەکەتدا دایبنێیت.

رێنماییەکانی نووسینەوەی تێبینییەکان

هەر کە کاغەزی بیبلۆگرافییەکەت تەواو بوو، بەلایەوە بنێ. هەندێ کاغەزی بچوکی بەتاڵی تر بێنە و لە کتێبی سەرچاوەکەتەوە دەست بکە بە نووسینەوەی تێبینی.

–بیرۆکەیەك، ئایدیایەك، کۆتێك (ئیقتیباسێك)، یان فاکتێك لەسەر هەر کاغەزێك بنووسە...و تەنیا یەك دانە. ئەگەر رووبەرووی ئیقتیباسێك یان برە زانیارییەکی زۆر درێژ بوویتەوە، ئەوا

دەتوانیت لە پێشەوە و لە پشتەوە کاغەزەکە بینووسیت، ئەگەر پێویست بوو. بەڵام قەت مەیخەرە سەر کاغەزی دووەم.

ئەی ئەگەر نەتتووانی برە زانیارییەکە لەسەر یەك کاغەز جێ بکەیتەوە؟ دابەشی بکە بۆ دوو پارچە یان زیاتری بچوکتر، پاشان هەریەکەیان بخەرە سەر کاغەزی جیاجیا.

—بە وشەکانی خۆت بینووسە. خاڵە سەرەکییەکان پوخت بکەرەوە لەبارەی پەرەگرافێك یان بەشێك یان ماددەکە بە وشەکانی خۆت بنووسەرەوە. خۆت لە کۆپیکردنی وشە بە وشە لابدە.

—ئەو ماددەیەی کە وشە بە وشە کۆپیت کردووە، بیخەرەناو دوو جووت کۆماوە (علامە نقل القول). ئاساییە کە لە بابەتەکەتدا رستەیەك یان پەرەگرافێك دابنێیت کە لەلایەن کەسێکی ترەوە نووسراوە بۆ جەختکردنەوە لە خاڵێکی دیاریکراو (بەو مەرجەی کە بەشێوەیەکی سنووردار ئەمە بکەیت). بەڵام پێویستە ئەو رستانە کتومت بەو شێوەیەی کە لە دەقە بنچینەییەکەتدا هاتووە کۆپی بکەیت— وشە بە وشە، کۆما بە کۆما، خاڵ بە خاڵ و هیتر. هەروەها هەمیشە دەبێ ئەو ئیقتیباسانە لە بابەتەکەتدا بخەیتە ناو کۆماکانی نقل القول و رێز بۆ نووسەرەکە دابنێیت.

# جەنگی 1812 (ناونیشانی بابەتەکە)

I راگەیاندنی جەنگ

A. راگەیاندنی مەدیسۆن بۆ جەنگ

1. هۆکار
2. بەروار

B. کۆنگرێس جەنگ رادەگەیەنێ

1. مشتومڕ لە کۆنگرێسدا
   a. هەڵۆکانی جەنگ
   b. فیدراڵیستەکان
2. راگەیاندنی جەنگ

II جەنگی 1812

A. جەنگ لە 1812–1813

1. ئامادەکارییەکان بۆ جەنگ
2. گرتنی کەنەدا

**وردەکاری بۆ کاغەزەکانی تێبینیت زیاد بکە**

لەکاتێکدا کە هەر کاغەزێکی تێبینی تەواو دەکەیت، ئەمانەی خوارەوە بکە:

–لەلای چەپی سوچی سەرەوەی کاغەزەکە، ژمارەی سەرچاوەی کاغەزە بیبلۆگرافییە پەیوەندیدارەکە بنووسە (لەلای سوچی چەپ). ئەمە بیرت دێنێتەوە کە زانیارییەکەت لە کوێ وەرگرتووە.

–لەژێر ژمارەی سەرچاوەوە، ژمارە ئەو لاپەڕە (یان لاپەڕانە) بنووسە کە زانیارییەکەی تێدا بووە.

–چوارچێوە سەرەتاییەکەت دەربێنە. زانیاریی سەر کاغەزەکەت لەژێر چ سەرەبابەتی چوارچێوەکەتدا جێگەی دەبێتەوە؟ سەرەبابەتی "I"؟ سەرەبابەتی " II"؟ ژمارەی رۆمانیی پەیوەندیدار لەسەرەوەی سوچی راستی کاغەزی تێبینییەکانت بنووسە (دەشتووانی ژمارەی ئاسایی یان پیتی گەورەی ئینگیزی بەکاربێنیت).

ئەگەر دڵنیا نیت لەوەی کە زانیارییەکە لە چوارچێوەکەتدا جێگەی دەبێتەوە، ئەستێرە (*)یەك دابنێ لەبری پیتێکی بابەتەکە. دواتر، کاتێك تۆ چوارچێوەکە بە درێژتر دەنووسیت، دەتوانیت هەوڵ بدەیت ئەم کاغەزە بچوکانە کە شتی "گشتی"یان لەسەرە بخەیتە ناو رووبەرە دیاریکراوەکانەوە.

–لە نزیك پیتی بابەتەوە، وشەیەك یان دووانی "سەردێڕ" دابنێ کە وەسفی زانیاریی سەر کاغەزەکە دەکات.

–کاتێك تۆ لە نووسینەوەی تێبینی لە سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە تەواو بوویت، نیشانەیەکی چێك کردن لەسەر کاغەزی بیبلۆگرافی دابنێ. ئەمە وات لێدەکات بزانیت ئیشی سەرچاوەت تەواو بوو، لانی کەم بۆ ئێستا.

دڵنیا بە لەوەی کە زانیاری بە وردی دەگوازیتەوە بۆ سەر کاغەزەکانی تێبینی. جارێکی تر سەیری ناوەکان، بەروارەکان و ئاماری تر بکەرەوە. هەرچی پەیوەندی بە کاغەزەکانی بیبلۆگرافیتەوە هەیە، بە راستی گرنگ نییە کە هەریەك لەم بڕگانە لەو شوێنە دەقاودەقانە بن کە من لێرە خستوومنەتەڕوو. تۆ تەنیا پێویستت بەوەیە کە جێگیر بیت. هەمیشە ژمارەی لاپەڕە لە شوێنی خۆیدا دابنێ بەهەمان شێواز.

تێبینییە کەسییەکانی خۆت دابنێ

به درێژایی پرۆسەی تێبینی نووسینەوەت، دەشێ هەندێ کاغەزی تێبینیی "کەسی" دروست بکەیت– بیرۆکەکان، ئایدیاکان یان بۆچوونەکانی خۆت لەبارەی ماددەکەت یان تێزەکەت.

هەر تێبینییەك لەسەر کاغەزێکی تێبینی جیاواز بنووسە، هەروەکو چۆن لە وەرگرتنی زانیاری لە سەرچاوەکانی ترەوە ئەمەت کرد. سەرەبابەتێك و سەرەبابەتێکی لاوەکی بۆ کاغەزی تێبینییەکەت دابنێ. لەو بۆشاییەدا کە تۆ ژمارەی سەرچاوەت تێدا دادەنا، ناوی خۆت

یان ڕەمزێکی تری لەسەر بنووسە. (من "م" بۆ "بۆچوونی من" دادەنێم). ئەمە بیرت دێنێتەوە کە تۆ سەرچاوەی زانیارییەکە یان بیرۆکەکەیت.

**هەنگاوی ٦: چوارچێوەی چڕوپڕ ئامادە بکە**

**توێژینەوەکەت تەواو بوو**

کە بەو مانایەیە لانی کەم نیوەی بابەتەکەت– لەوانەشە سێ لەسەر چواری– تەواو بووە، ئەگەرچی هێشتا دەبێ وشەیەکی یەکەم ڕەشنووس بنووسیت.

ئێستا کاتی ڕێکخستنی داتاکەت هاتووە. تۆ پێویستت بەوەیە بڕیار بدەیت ئاخۆ هێشتا تێزە کاتییەکەت بەرەو ئامانج دەڕوات، بزانە چۆن بابەتەکەت ڕێك دەخەیت و چوارچێوە چڕوپڕەکە بنووسە.

لێرەیە کە سیستەمی کاغەزەکانی تێبینی ئەنجامیان دەبێت. کاغەزەکانی تێبینیت ئامرازێکی بێ هاوتات پێدەدەن بۆ ڕێکخستنی بابەتەکەت. هەموو کاغەزەکانی تێبینی بێنە دەرەوە و پاشان:

١.هەموو ئەو کاغەزانە گروپ بکە کە هەمان پیت یان ژمارەی سەرە بابەتی چوارچێوەکەیان لەسەرە (لە سوچی ڕاستی هەر کاغەزێك).

٢.ئەو گروپە جیاوازانە ڕێك بخە، بەپێی چوارچێوە کاتییەکەت.

٣.لەناو هەر گروپی بابەتێکدا، کاغەزەکان زیاتر ڕێك بخە. ئەو کاغەزانە گروپ بکە کە هەمان "سەردێڕ"یان هەیە (تایتلێ دوو وشەیی لە سوچی ڕاستی سەرەوە).

٤.بچۆرە ناو کاغەزە کەسی و شتە گشتییەکانت، ئەوانەی کە بە ئەستێرە یان ڕەمزی خۆت نیشانەت کردوون. ئایا دەتوانیت هیچ کام لەوانەی لەناو گروپە بابەتەکانی ئێستادا دابنێیت؟ ئەگەر وایە، ئەستێرەکە بە پیت یان ژمارەی سەرەبابەت جێگۆڕکێ پێبکە. ئەگەر نا، کاغەزەکە بخەرە دواوەی هەموو کاغەزەکانی ترەوە.

دەبێ ئێستا کاغەزەکانی تێبینییەکانت بەپێی چوارچێوە سەرەتاییەکەت ڕێکخرابن.

ئێستا دەبێ کاغەزەکانی تێبینیت بە گوێرەی سەرەباسە سەرەتاییەکانت ڕێکخرابن. چەند خولەکێك تەرخان بکە بۆ پێداچوونەوەی کاغەزەکانی تێبینیت، لە سەرەتای بەستە کاغەزەکەوە دەست پێبکە و تاوەکو کۆتای بەردەوام بە. ئەوەی کە ئێستا دەیخوێنیتەوە،

بنچینەیەکی خاوی بابەتەکەتە- ئەو زانیارییەی کۆت کردوونەتەوە لەو ڕێکخستنەدا کە تۆ (بەشێوەیەکی کاتی) پلان دادەنێیت بۆ پێشکەشکردنی.

ئایا ئەم ڕێکخستنە هێشتا مانای هەیە؟ یان ڕێکخستنێکی تر باشتر دەبێ؟ ئەمەی خوارەوە کۆمەڵێك ئاراستەگیریی بۆ ڕێکخستن کە لەوانەیە بۆ ئەو بابەتەی کە دەینووسیت لەبەرچاویان بگریت:

١.کرۆنۆلۆجی. ڕووداوەکان لەو ێکخستنەدا باس دەکات کە تیایدا ڕوویانداوە (بە پێی کاتی ڕوودا و).

٢.شوێنی. زانیاری لە سیستەمی جیۆگراف یان فیزیکیدا دەخاتەڕوو (لە باکوورەوە بۆ باشوور، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، لە چەپەوە بۆ ڕاست، لەناوەوە بۆ دەرەوە و بەم شێوەیە).

٣.ژمارەیی/ئەلف بێیی. ڕێگایەکی ڕوونە بۆ ڕێکخستنی بابەتێك بۆ نموونە لەسەر "دە فرمانەکە" یان "ئەو سێ مرۆڤەی لە هەمووان زیاتر بەلامەوە پەسەندترن".

٤.دابەشکردنی گەورە. بۆ ئەو بابەتانەی کە بەشێوەیەکی لۆژیکی دابەش دەبن بەسەر بەشە ڕوونەکاندا.

٥.چۆن...گوڵدانێك پەروەردە بکەیت، بابەتێکی باشتر بنووسیت، و هیتر. وەکو ئەم کتێبە، ماددەیەك لە "سەرەتا چی بکەیت"ەوە ڕێك دەخات بۆ "دواجار چی بکەیت".

٦.کێشە/چارە (بە هۆکار و دەرەنجامیش ناسراوە). زنجیرەیەك کێشە و چارە دەخاتەڕوو، بۆچی شتێك ڕوویدا، یان پێشبینی ئەوە دەکات چ شتێك لە ئەنجامی هۆکارێکی دیاریکراودا ڕەنگە ڕووبدات.

٧.هۆکار/دەرەنجام. باسی هەلومەرجێك، کێشەیەك یان هۆکارێك دەکات و بە ئاراستەیەکی دواوە ئیش دەکات بۆ ئەو شتەی کە لەوانەیە بووبێتە هۆکاری.

٨.بەراورد/جیاوازی. باس لە هاوشێوەییەکان و جیاوازییەکانی نێوان خەڵکی، شتەکان یان ڕووداوەکان دەکات. لەوانەشە ئەو کاتە بەکاربێت کە دەتەوێ قسە لەسەر باشییەکان و خراپییەکان شێوازێك، تاقیکردنەوەیەکی زانستی، چارەسەرێك، ئاراستەیەك و هیتر بکەیت.

٩.ڕێکخستن بەپێی گرنگی. یەکەم جار قسە لەسەر لایەنە هەرە گرنگەکانی پرسێك دەکات پاشان بەرەو کەمترین گرنگی دەڕوات یان بە پێچەوانەوە. (جیاوازییەکی بچوکی ئەمە ڕێکخستنی بابەتەکەتە لە زانراوەوە بەرەو نەزانراو).

١٠.بەڵگەهێنانـەوە بـۆ/لـەدژی. مـشتومڕە بـۆ و لـەدژی هەڵوێـستێك، پرسـیارێك، بڕیارێـك، ئاراستەگیرییەك، شێوازێك و هیتر.

یەكەم چوار زنجیرە بە "سروشـتی" دادەنـرێ، لـەوەدا كـە ڕێكخـستنەكە تەقریبـەن لەلایـەن ماددەكەوە پێویـست كـراوەز زنجیرەكـانی تـر بـریتین لـە "لـۆژیكی" لـەوەدا كـە ڕێكخـستنەكە لەلایەن تۆ "ی نووسەر" وە هەڵدەبژێردرێت و دەسەپێنرێت.

تێبینی ئەوە بكە كە لە زۆر حاڵەتدا، ئەو ڕێكخـستنە واقیعییـەی كـە هەڵیدەبـژێری بەهـەمان شـێوە قـابیلی پێـچەوانەبوونەوەیە– تـۆ دەتوانیـت لەكاتـدا بـەرەو پێـشەوە و بـەرەو دواوە بجوڵێیت، هۆكـار و دەرەنجـام یـان دەرەنجـام و هۆكـار، هتـد لەبەرچـاو بگـرە. كەواتـە تـۆ لـە ڕاستیدا دە دوانزە ڕێگات لەبەردەم دایە بۆ ڕێكخستنی ماددەكەت!

لەوانەیە ماددە و تێزەكەت ئەوە دیاریبكەن كە كام ئاراستەیەی ڕێكخستن بەباشـترین شـێوە كاریگەرن.

ئێستا دەبێ كاغەزەكانی تێبینیت بە گوێرەی سەرەباسە سـەرەتاییەكانت ڕێكخـرابن. چـەند خولـەكێك تـەرخان بكـە بـۆ پێداچـوونەوەی كاغـەزەكانی تێبینیـت، لـە سـەرەتای بەسـتە كاغەزەكەوە دەست پێبكە و تاوەكو كۆتـای بـەردەوام بـە. ئـەوەی كـە ئێـستا دەیخوێنیتـەوە، بنچینەیەكی خاوی بابەتەكەتە– ئـەو زانیارییـەی كـۆت كردوونەتـەوە لـەو ڕێكخـستنەدا كـە تـۆ (بەشێوەیەكی كاتی) پلان دادەنێیت بۆ پێشكەشكردنی.

ئایا ئەم ڕێكخستنە هێشتا مانای هەیە؟ یان ڕێكخستنێكی تر باشتر دەبێ؟ ئەمەی خـوارەوە كۆمەڵێك ئاراستەگیریی بۆ ڕێكخستن كە لەوانەیە بۆ ئەو بابەتەی كـە دەینووسـیت لەبەرچـاویان بگریت:

١.كرۆنۆلۆجی. ڕووداوەكان لەو ێكخستنەدا باس دەكات كە تیایدا ڕوویانداوە (بـە پێـی كـاتی ڕووداو).

٢.شوێنی. زانیـاری لـە سیـستەمی جیـۆگراف یـان فیزیكیـدا دەخاتـەڕوو (لـە بـاكوورەوە بـۆ باشوور، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، لە چەپەوە بۆ ڕاست، لەناوەوە بۆ دەرەوە و بەم شێوەیە).

٣.ژمارەیی/ئـەلف بێیـی. ڕێگایـەكی ڕوونـە بـۆ ڕێكخـستنی بابـەتێك بـۆ نموونـە لەسـەر "دە فرمانەكە" یان "ئەو سێ مرۆڤەی لە هەمووان زیاتر بەلامەوە پەسەندترن".

٤.دابەشکردنی گەورە. بۆ ئەو بابەتانەی کە بەشێوەیەکی لۆژیکی دابەش دەبن بەسەر بەشە روونەکاندا.

٥.چۆن...گوڵدانێك پەروەردە بکەیت، بابەتێکی باشتر بنووسیت، و هیتر. وەکو ئەم کتێبە، ماددەیەك لە "سەرەتا چی بکەیت"ەوە رێك دەخات بۆ "دواجار چی بکەیت".

٦.کێشە/چارە (بە هۆکار و دەرەنجامیش ناسراوە). زنجیرەیەك کێشە و چارە دەخاتەروو، بۆچی شتێك روویدا، یان پێشبینی ئەوە دەکات چ شتێك لە ئەنجامی هۆکارێکی دیاریکراودا رەنگە روربدات.

٧.هۆکار/دەرەنجام. باسی هەلومەرجێك، کێشەیەك یان هۆکارێك دەکات و بە ئاراستەیەکی دواوە ئیش دەکات بۆ ئەو شتەی کە لەوانەیە بووبێتە هۆکاری.

٨.بەراورد/جیاوازی. باس لە هاوشێوەییەکان و جیاوازییەکانی نێوان خەڵکی، شتەکان یان رووداوەکان دەکات. لەوانەشە ئەو کاتە بەکاربێت کە دەتەوێ قسە لەسەر باشییەکان و خراپییەکان شێوازێك، تاقیکردنەوەیەکی زانستی، چارەسەرێك، ئاراستەیەك و هیتر بکەیت.

٩.رێکخستن بەپێی گرنگی. یەکەم جار قسە لەسەر لایەنە هەرە گرنگەکانی پرسێك دەکات پاشان بەرەو کەمترین گرنگی دەڕوات یان بە پێچەوانەوە. (جیاوازییەکی بچوکی ئەمە رێکخستنی بابەتەکەتە لە زانراوەوە بەرەو نەزانراو).

١٠.بەڵگەهێنانەوە بۆ/لەدژی. مشتومڕە بۆ و لەدژی هەڵوێستێك، پرسیارێك، بڕیارێك، ئاراستەگیرییەك، شێوازێك و هیتر.

یەکەم چوار زنجیرە بە "سروشتی" دادەنرێ، لەوەدا کە رێکخستنەکە تەقریبەن لەلایەن ماددەکەوە پێویست کراوە. زنجیرەکانی تر بریتین لە "لۆژیکی" لەوەدا کە رێکخستنەکە لەلایەن تۆ "ی نووسەر" وە هەڵدەبژێردرێت و دەسەپێنرێت.

تێبینی ئەوە بکە کە لە زۆر حاڵەتدا، ئەو رێکخستنە واقیعییەی کە هەڵیدەبژێری بەهەمان شێوە قابیلی پێچەوانەبوونەوەیە— تۆ دەتوانیت لەکاتدا بەرەو پێشەوە و بەرەو دواوە بجوڵێیت، هۆکار و دەرەنجام یان دەرەنجام و هۆکار، هتد لەبەرچاو بگرە. کەواتە تۆ لە راستیدا دە دوانزە رێگات لەبەردەم دایە بۆ رێکخستنی ماددەکەت!

لەوانەیە ماددە و تێزەکەت ئەوە دیاریبکەن کە کام ئاراستەیەی رێکخستن بەباشترین شێوە کاریگەرن. ئەگەر لە بژارەیەك زیاترت هەبوو، ئەوەیان بەکاربێنە کە لە هەموویان زیاتر پێی

ئاسودەیت یان ئەوەیان کە پێت وایە ئاسانترینە بۆت. (کەس ناڵێت پێویستە قورسترین رێگە هەڵبژێریت!) بیرت نەچێ کە دەتوانیت ئاوێتەیەکی دوو رێگە بەکاربێنیت. بۆ نموونە، لەوانەیە تۆ ناوی رووداوەکان لە رێکخستنی کرۆنۆلۆجیدا بێنیت و پاشان باسی هۆکار/دەرەنجامی هەریەکەیان بکەیت.

ئەگەر پێویست دەکات، بە چوارچێوە گشتییەکەتدا بچۆرەوە بەپێی ئەو بڕیارەی پەیوەست بە رێکخستن کە داوتە. پاشان، بە هەریەك لەو گروپەی کاغەزەکاندا برۆ کە لە هەمان ژمارە یان پیتی سەرەبابەتەکانیان هەیە. رێکیان بخەرەوە بۆئەوەی ئەمانیش پەیرەوی لەو رێسا رێکخستنە بکە کە هەڵتبژاردووە.

پاش ئەوەی هەموو ئەو کاغەزانەت رێك خست کە سەرەدێڕێکی دیاریکراویان بۆ دانرابوو (III،II،I یان C ،B ،A) بەو کاغەزانەدا بچۆرەوە کە بە ئەستێرە یان رەمزە کەسییەکەت نیشانە کراون. هەوڵ بدە بزانیت لەکوێ لەگەڵ بەستە کاغەزەکانتدا دێنەوە.

کاغەزێك مەخەرەناو ئەگەر پێناچێت زانیارییەکەی ناوی لە هیچ شوێنێکدا جێگەی بێتەوە. ئەگەری هەیە کە داتاکە پەیوەندیدار نەبێت بەو تێزەی پێیداچوویتەوە. لە ئێستادا بەلایەوە بنێ. تۆ دەتوانیت هەوڵ بدەیت جارێکی تر بیخەیتەوەناو.

کاتێکیش تۆ تێبینییە نەگونجاوەکان بەلاوە دەنێیت، بیرت نەچێت سۆراخی "کونەکان" بکەیت لە بابەتەکەتدا، ئەو رووبەرانەی کە هاوار دەکەن بۆ فاکتی تازەتر، نموونەی باش، یان گواستنەوەیەکی باش. کەس حەز ناکات بۆی دەربکەوێت کە پێویستی بە کەمێکی تر لێکۆڵینەوە هەیە، بەڵام ئەگەر کێشەیەکت بەدی کرد، گرەنتیت پێدەدەم کە مامۆستاکەشت دەیبینێت. مەهێڵە "کونێکی رەش" بابەتێکی گریمانەیی ناپاب بکاتە شتێك مام ناوەند تەنیا لەبەرئەوەی ناتەوێ سەعاتێکی تر لە کتێبخانە یان لەسەر ئینتەرنێت بەسەر ببەیت.

ئێستا لە پێشەوە بەرەو دواوە بەناو کاغەزەکانی تێبینییەکاندا برۆ. دەبینیت؟ تۆ چوارچێوە چڕوپڕەکەت نووسیووە تەنانەت بەبێ ئەوەی بزانیت. ژمارەکان یان پیتەکانی سەرەبابەتەکان لەسەر کاغەزەکانت لەگەڵ سەرەبابەتە سەرەکییەکانی چوارچێوەکەتدا دێنەوە. ئەو سەردێڕانەی سەر کاغەزەکانی تێبینییەکانت سەرەبابەتی لاوەکین بۆ چوارچێوەکەت.

سەردێڕەکانی کاغەزەکانی تێبینیت بگوازەرەوە بۆ سەر بابەتەکەت. ئەمانە بەهەمان ڕێکخستنی بەستە کاغەزە بچوکەکانت لە چوارچێوەکەتدا دەردەکەون.

**هەنگاوی ٧: یەکەمین ڕەشنووس بنووسە**

لەوانەیە درکت پێ نەکردبێت، بەڵام تۆ هەنووکە ئیشێکی سەختی زۆرت ئەنجامداوە کە دەچێتە قۆناغی نووسینەوە. تۆ بیرت لەوە کردەوە بابەتەکەت چۆن دروست دەبێت، چۆن تێبینییەکانت ڕێکخستووە و چۆن چوارچێوەیەکی چڕوپڕت ئامادەکردووە. هەموو ئەوەی کە ماوە، گواستنەوەی زانیاری و ئایدیاکانتە لە کاغەزەکانی تێبینییەوە بۆ بابەتەکەت.

نووسینێکی باش پێویستی بە تەرکیز و بیرکردنەوەیە. تەرکیز و بیرکردنەوەش پێویستییان بە هێمنی هەیە– و بڕێکی زۆریش! تۆ بەهەمان شێوە پێویستت بە بڕێکی زۆر لە بۆشایی سەر ڕیحلە یان مێز هەیە، بۆئەوەی بتوانیت کاغەزە بچوکەکانی تێبینی لەبەردەمتدا بڵاو بکەیتەوە، دەبێ ڕووبەری ئیشکردنت زۆر ڕۆشن بێت و دەبێت تۆ قاموس و موڕادیفاتت لێوە نزیك بن. ئەگەر بکرێ، ڕاستەوخۆ لەسەر کۆمپیوتەرەکەت "بنووسە"، بۆئەوەی بتوانیت بە پەنجەدانان لەسەر دوگمەکان وشەکان زیاد، دیلیت بکەیت و ڕێك بخەیتەوە.

بیرت بێت: لەم خاڵەدا، ئامانجی تۆ ئامادەکردنی ڕەشنووسە. چاوەڕوان ناکرێ یەکەم ڕەشنووست کامڵ بێت. وا دادەنرێ کە پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە. ئەگەر بچیتە ناو بیروباوەڕەوە کە نیازتە بابەتێکی ئامادە بۆ مامۆستا لە یەکەمین هەوڵتدا ئامادە دەکەیت، ئەوا بەهەڵەداچوویت. ئەم جۆرە فشارەی لێهاتوویی تەنیا دەبێتەهۆی شڵەژان و نائومێدی.

جەوهەری نووسینی باش پەیوەندی کەمی هەیە بە ڕێزمان، سپێل، خاڵبەندی و هاوشێوەی ترەوە. جەوهەری نووسینی باش، بیرکردنەوەی باشە.

بیرۆکەکانت، ئایدیاکانت و لۆژیکت بناغەی بابەتەکەتن. هەروەها پێویستت بەوەیە بناغەی خانوویەك دابنێیت پێش ئەوەی نیگەرانی دانانی دەرگای پێشەوە بیت. بۆیە، بۆ ئێستا، تەنیا تەرکیز بکەرە سەر دانانی بیرکردنەوەکانت لەسەر کاغەز. نیگەرانی بەکارهێنانی وشەی کتومت "ڕاست" مەبە. نیگەرانی ئەوە مەبە کۆما لە هەموو شوێنە دروستەکان دابنێیت. ئێمە دوایی مشووری ئەو پۆلێنکردنە دەخۆین.

کاغەزە بچوکەکانی تێبینییەکانت یارمەتییان دایت تا چوارچێوەیەکی چڕوپڕ ئامادە بکەیت. ئێستا یارمەتیت دەدەن تا ڕستە و پەرەگرافە واقعییەکانی بابەتەکەت دابڕێژیت:

١.دەبێ کاغەزە بچوکەکانت وەکو چوارچێوە چروپڕەکەت ڕێکبخرێن. هەموو ئەو کاغەزانە دەربێنە کە بە ژمارە یان پیتی یەکەم سەرەبابەتی ناو چوارچێوەکەت نیشانە کراون.

٢.لە دەرەوەی ئەو بەستەیەدا، هەموو ئەو کاغەزانە دەربێنە کە وەکو یەکەم سەردێڕی لاوەکی بە هەمان "سەردێڕ"ی ناو چوارچێوەکەت نیشانە کراون.

٣.سەیری زانیارییەکانی سەر ئەو کاغەزانە بکە. بیر لەوە بکەوە کە چۆن بڕە جیاجیاکانی زانیاری دەشێ لە پەرەگرافێکدا لەگەڵ یەکتری بێنەوە.

٤.ئەو کاغەزانە ڕێك بخەرەوە بۆئەوەی بکەونە ناو ئەو ڕێکخستنەکەی کە تۆ پێت وابووە باشترینە بۆ پەرەگرافەکە.

٥.ئەمە بۆ هەر گروپێکی کاغەزەکان ئەنجام بدە تا ئەو کاتەی کە دەگەیتە کۆتایی بەستەکە.

هەر پەرەگرافێکی ناو بابەتەکەت وەکو وتارێکی بچوك وایە. دەبێ ڕستەی سەرەکی هەبێت– دەربڕینێکی ئەو فاکت یان خاڵە سەرەکییەی تۆ لە پەرەگرافەکەدا قسەی لەسەر دەکەیت– و ئەو بەڵگەیەی تێدابێت کە پشتگیری دەکەیت. ئەم بەڵگەیە دەتوانێ لە فۆرمی جیاجیادا بێت، وەکو وتەی شارەزایان، ئاماری توێژینەوە، نموونە لە توێژینەوە یان ئەزموونی خۆت، وەسفی چروپڕ، یان زانیاری باکگراوندی تر.

پەرەگرافەکانت وەکو بریکەکان لەناو "دیواری بەڵگە"ی خۆتدا دابنێ. هەر پەرەگرافێك بە وریاییەوە بونیاد بنێ و خوێنەرانت هیچ بژارەیەکیان لەبەردەمدا نابێ جگە لەوەی لەگەڵ ئەنجامگیریی کۆتاییت هاوڕا بن.

ئەگەر پەرەگرافەکان بریك بن، گواستنەوەکان– ڕستەیەك یان دەستەواژەیەك کە خوێنەر لە بیرۆکەیەکەوە دەباتە سەر بیرۆکەیەکی تر– ئەو چیمەنتۆیەن کە بەیەکیانەوە دەبەستنەوە. گواستنەوە نەرم و نیانەکان یارمەتی خوێنەر دەدەن تا بەشێوەیەکی ئاسان لە بیرۆکەیەوە بچنە سەر بیرۆکەیەکی تر.

### ئێستا هەمووی بخەرە سەر پەڕەکاغەزی ڕاستەقینە

ڕەشنووسەکەت دەبڵ سپەیس یان سێ جار سپەیس بکە– ئەمە دەستکاریکردنی لەکاتێکی دواتردا ئاسانتر دەکات. پاش ئەوەی هەر کاغەزێکی تێبینیت تەواو کرد، نیشانەیەکی پێداچوونەوە لە خوارەوە دابنێ.

ئەگەر بڕیار بدەیت کە زانیاری لە کاغەزێکی دیاریکراوەوە وەرناگریت، فڕێی مەدە- بوەستە. بیخەرە ناو بەستەیەکی جیاوە. لەوانەیە بڕیار بدەیت کە ئەو بڕەزانیارییە بخەیتە ناو بەشێکی تری بابەتەکەتەوە یان پاش ئەوەی کە ڕەشنووسەکەت دەخوێنیتەوە ڕەئیت بگۆڕیت و بڕیار بدەیت زانیارییەکە لەو شوێنەدا دابنێیت کە لە بنەڕەتدا پلانت بۆ دانابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە ڕووبەڕووی ئەو کاغەزانە ببیتەوە کە جێگەیان نابێتەوە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو قەناعەتەی کە لە بابەتەکەتدا شوێنیان نییە، هەوڵ مەدە بە زۆر شوێنیان بکەیتەوە. بیانخەرە لاوە. هەروەکو جۆنی کۆچران دەڵێت "ئەگەر ئەم کاغەزانە زیان لە ڕێکخستنەکە بدەن، پێویستە بڕۆن".

ئەی ئەگەر گیرت خوارد؟

تووشی کۆسپی نووسەر بوویت؟ دە ئەو فێڵانەی خوارەوە بزانە بۆئەوەی دەرباز بیت:

-وایدابنێ خەریکی نووسینیت بۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزت. تەنیا هەموو ئەو شتانەی پێی بڵێ کە لەبارەی ماددەکەتەوە فێریان بوویت و ئەمەی کە بۆچی بڕوات وایە تێزەکەت ڕاستە.

-زمانی ڕۆژانە بەکاربێنە. خەڵکانێکی زۆر ڕوو دەکەنە بەکارهێنانی دەستەواژە و وشەی پڕ باق و بریق کە بیریان دەچێتەوە کە ئامانجیان بریتییە لە پەیوەندیکردن (اتصال). سادەتر بێ باشترە.

-هەر شتێ بکە. شتێك تایپ بکە...هەر شتێك بێ. هەر کە یەکەم پەرەگرافت نووسی- تەنانەت ئەگەرچی بە ڕاستی یەکەم پەرەگراف خراپە- مێشکت دەست دەکات بە بەرهەمهێنانی بیرۆکە ڕەمەکییەکان.

-خۆت چاکی مەکە! لەکاتێکدا کە ڕەشنووسەکەت دەنووسی، خۆت مەخەرە داوی بیرۆکە نێگەتیڤەکانەوە، وەکو ئەوەی کە "ئەمە بە ڕاستی گەمژانە دیارە" یان "من نووسەرێکی خراپم. بۆچی ناتوانم ئەوە باشتر گوزارشت بکەم؟" بیرت نەچێت: ئامانجی تۆ ڕەش نووسە- گریمانەی ئەوە دەکرێ کە کەمێك خراپ بێ.

-بەردەوام بە لە جوڵان. ئەگەر تۆ زانیت لە بەشێکی دیاریکراودا گیرت خواردووە، لەوێ بۆ چەند سەعاتێك دامەمێنە- یان تەنانەت بۆ چەند خولەکێکیش. تەنیا تێبینییەکی خێرا بنووسە لەبارەی ئەوەی کە دەتەوێ پلانی چ شتێك لەو بەشەدا دابنێی، پاشان بچۆرە سەر

بەشی دواتر. زۆر لە خۆت بکە تا ئەوەندەی بکرێت بە چەند هەنگاوێکی کەم هەموو رێگای ناو بابەتەکەت ببڕیت.

نووسینی سەربەست و بیرلێکردنەوە

بیرلێکردنەوە و نووسینی سەربەستی بە تەرکیز دوو شێوازن کە لەلایەن نووسەرانی پرۆفێشناڵەوە بەکاردێن کاتێك تەوژمی ئەفراندن لە شوێنێکی مێشکیاندا دادەوەستێت. لەکاتێکدا کە هاوشێوەن، چەند جیاوازییەکی گرنگ هەن لەنێوان دوو شێوازەی دەستپێکردندا.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا، سنوورێکی زەمەنی کورت دابنێ (بۆ نموونە ١٠ یان ١٥ خولەك)، بیرۆکەی سەرەکیت لە دەستەواژەیەك یان رستەیەکدا پوخت بکەرەوە بۆ بەجوڵە خستنی ئایدیاکانت و ئەوەی کە نووسیووتە چاکی مەکە یان تەنانەت پیایدا مەچۆرەوە تا ئەو کاتەی کاتەکە تەواو دەبێت.

بیرلێکردنەوە بریتییە لە نووسینی هەر شتێك بکرێ بە بیرتدا بێت کە پەیوەندی بە ماددەکەتەوە هەبێت. ئەمە پێویستی بەوە نییە ئیش بە هیچ زنجیرەیەك بکەیت یان تێبینییەکانت لۆژیکی بن یان تەنانەت بەجێ بن. پرسیار خستنەڕووی خۆت لەبارەی ماددەکە، گرنگ نییە چەندە نامۆیە، لەوانەیە یارمەتیت بدات تا ئایدیای نوێ بەرهەم بێنیت.

لە نووسینی سەربەستی بەتەرکیزدا، جەختکردنەوە لەسەر نووسینی...هەر شتێکە...بەبێ نیگەران بوون لەمەڕ ئەوەی ئاخۆ ئەوەی کە دەینووسیت بەشێوەی تەمومژاویش پەیوەندی بە ماددەکەتەوە هەیە. مەسەلەکە هەر دەستپێکردنی نووسینە– یادداشتێکی رۆژانە، ژیاننامەی سەگەکەت، بیرۆکەکانت لەبارەی ڤیدیۆ هەنووکەییەکانی رۆك– و نەوەستان تا کات تەواو دەبێت.

بیرلێکردنەوە بەکەڵکە کاتێك تۆ ئامادەیت بنووسیت بەڵام ناتوانیت سەرەداوی ئەمەی کتومت لە کوێوە دەست پێبکەیت بدۆزیتەوە. سەربەست نووسین ئەو کاتە بەکەڵکە کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانیت مێشکت بخەیتە کار. هەردوو شێوازەکە یارمەتیت دەدەن تا دەست بکەیت بە نووسین، کە هەموو ئەو شتەیە تۆ هەوڵی بۆ دەدەیت.

سەرچاوەکان بە دۆکیومێنت بکە

بۆ خۆلادان لە دزی، پێویستە تۆ ئەو سەرچاوەیە دۆکیومێنت بکەیت کاتێك هەریەك لەمانەی خوارەوە دەخەیتە ناو بابەتەکەتەوە:

—ئەو کۆت (ئیقتیباسات)انەی لە سەرچاوەیەکی بڵاوکراوەوە وەرگیراون.

—تیۆرە یان ئایدیاکانی کەسێکی تر.

—رستەکان، دەستەواژەکان یان دەربڕینە تایبەتەکانی کەسێکی تر.

—فاکتەکان، فیگەرەکان و داتای لێکۆڵینەوەی کۆکراوە لەلایەن کەسێکی ترەوە.

—هێڵکاری، وێنە یان خشتەی دیزاینکراو لەلایەن کەسێکی ترەوە.

هەندێ حاڵەتی ناوازە هەن. تۆ پێویستت بە دۆکیومێنت کردنی سەرچاوەی ئەو فاکت، تیۆرە، یان دەربڕینە نییە کە مەعریفەی باوە. هەروەها پێویستت بە ئاماژەدان بە سەرچاوەیەك نییە کاتێك دەستەواژە یان دەربڕینی کەسێکی نەناسراو بەکاردێنیت.

بۆ حوکمدان لەسەر ئەوەی ئاخۆ دەستەواژەیەك پێویستی بە ئامـاژەدان بە سەرچاوەکەی هەیە یان نا، پرسیار لە خۆت بکە ئاخۆ بە پێچەوانەوە خوێنەران پێیان وادەبێ خودی خۆت ئەو زانیاری یان ئایدیایەت گەڵاڵەکردووە. ئەگەر وەڵامەکە بەڵێیە، پێویستت بە ئامـاژەدان بە سەرچاوەیە. ئەگەر گومانت هەیە، هەرچۆنێك بێت ئاماژەی سەرچاوە بنووسە.

پەراوێزەکان

بۆ ماوەی ساڵانێك، رێگای پەسەند بۆ رێزگرتن لە سەرچاوەکان بریتی بوو لە پەراوێز. دوو فۆرمی تری بە دۆکیومێنتکردن، ئێستا سەرچاوەکانی کۆتایی و ئاماژەدانی ناو کەوانەکانیش باون.

پەراوێز، ئاماژەی سەرچاوەیەکی کە لە خوارەوەی لاپەڕەی تێکستێکدا دەردەکەوێت. تۆ بەرزە ژمارەیەك لە سەرەوەی کۆتایی ئەو فاکت یان دەستەواژەیە دادەنێیت کە پێویستت بە دۆکیومێنتکردنێتی کە بە خوێنەرانت دەڵێت سەیری خوارەوەی لاپەڕەکە بکەن بۆ ئاماژەدان بە سەرچاوەی داتاکە.

چی لە پەراوێزدا دادەنرێ؟ هەمان ئەو زانیارییەی کە لە بیبلۆگرافیادا دادەنرێ. هەروەها هەمان ئەو ژمارە لاپەڕەیەی کە زانیارییەکەی لەسەر دەرکەوتووە.

لەبەردەم ئەو ئاماژەی سەرچاوەیەدا، هەمان ئەو ژمارە بەرزە دادەنێیت کە لە تەنیشت دەستەواژە یان فاکتەی ناو تێکستەکەت دایدەنێیت.

سنوور نییە بۆ ئەو ژمارەیەی پەراوێزەکان کە دەشێ لە بابەتەکەتدا هەبن. بە دەستپێکردن لە ژمارە ١ەوە، هەر پەراوێزێك بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك ژمارە بکە. بۆ هەر بەرزە ژمارەیەك لە بابەتەکەتدا، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە سەرچاوەیەکی ئاماژە لە خوارەوەی لاپەڕەکە هەیە.

وەکو ریزبەندیکردنە بیبلۆگرافییەکان، لایەنە جیاجیاکان ئامازە بە یاسای جیاواز دەکەن بۆ دانانی پەراوێزەکان. پرسیار لە مامۆستاکەت بکە کە پەیڕەوی لە یاساکانی کێ دەکات.

ئەگەر مامۆستاکەت ئەفزەڵیەتێکی نییە، دەشتووانیت یاساکانی MLA بەکاربێنیت، کە منیش بەکاریان دێنم. ( ڕێنماییەکانی MLA بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەو بابەتانە بەکاردێن کە بواری ئاداب و زانستە مرۆییەکاندا نووسراون. ئەگەر تۆ بابەتێك لەبواری فیزیا یان زانستی کۆمەڵایەتیدا دەنووسیت، پرس بە مامۆستاکەت بکە لەو رووەوە کە پەیڕەویی کام ستایڵە بکەیت. ستایڵی جیاجیا و دیاریکراو لە زیندەوەرزانی، کیمیا، ماتماتیك، ئەندازە، دەروونناسی و هیتردا بەکاردێن).

هەنگاوی ٨: توێژینەوەی زیاتر بکە

ئایا هیچ کەلێنێکت لە توێژینەوەکەتدا بەدی کرد لەکاتێکدا کە یەکەم ڕەشنووست ئامادە دەکرد؟ هەندێ پرسیارت وروژاند کە تۆ پێویستت بە زانیاریی زیاترە بۆ وەڵامدانەوە؟ ئەگەر وایە، ئێستا کاتی ئەوەیە کە سەری کتێبخانە بدەیت بۆ دوایین تەقەلا لەگەڵ کتێبەکاندا.

هەنگاوی ٩: دووەمین ڕەشنووس بنووسە

ئامانجی ئەم قۆناغە چاککردنی مانایە– ڕێڕەوی بابەتەکەت چاك بکە، بیرۆکەکانت باشتر ڕێکبخە، خاڵە سەرلێشێوێنەرەکان روون بکەرەوە و بەڵگاندنە لاوازەکان بەهێز بکە.

لەکاتێکدا کە چاو بە ڕەشنووسەکەتدا دەخشێنیتەوە، ئەم پرسیارانەی خوارەوە لە خۆت بکە:

–ئایا بیرۆکەکانت بەشێوەیەکی لۆژیکی لە خاڵێکەوە دەچن بۆ خاڵێکی تر؟

–ئایا مانای هەر رستەیەك و پەرەگرافێك تەواو رۆشنن؟

–ئایا هەر رستەیەك مانا دەدات بەدەستەوە– یان پاڵپشتی دەکات؟

–ئایا تۆ بەشێوەیەکی نەرم و نیان لە پەرەگرافێکەوە بەرەو پەرەگرافێکی تر دەجوڵێیت؟ یان یان بەشێوەیەکی ڕەمەکی لە ماددەیەکەوە بەرەو ماددەیەکی تر باز دەدەیت؟

–ئایا بە بەڵگەی بەرجەستەوە پشتگیری ئەنجامگیرییەکەت دەکەیت– داتای توێژینەوە، نموونەکان، ئامار؟

–ئایا ئاوێتەیەکی باشی بەڵگە دادەنێیت– ئیقتیباساتی شارەزایان، داتای زانستی، ئەزموونە کەسییەکان، نموونە مێژووییەکان؟

–ئایا پێشەکییەکی بەرجەستە و ئەنجامگیرییەکی بەرجەستەت هەیە؟

–ئایا بە وشەکان و ستایلی خۆت نووسیووتە؟ یان هەر ئەو دەستەواژە و ئیقتیباساتە بە یەکەوە گرێ دەدەیت کە لە نووسەرانی ترەوە وەرتگرتوون؟

–ئایا ماددەکەت بە تەواوی روون کردووەتەوە، یان وات داناوە کە دەشێ خوێنەران زیاتر لە تۆ زانیارییان لەبارەوە هەیە؟ (بیرت بێت: ئێستا لەگەڵ ماددەکەدا ئاشنایت، بەڵام تەنیا لەبەرئەوەی ئێستا شتێك روونە بەلاتەوە بەو مانایە نییە کە خوێنەران دەزانن لەبارەی چییەوە ئەدوێیت).

–ئایا قەناعەتت بە خوێنەران هێناوە کە تێزەکەت دروستە؟

–ئایا زانیارییەك هەیە کە، لەکاتێکدا کە راست و زانیاری بەخشە، بەڵام پەیوەندیدار نییە؟ بیبڕە!

–ئایا روانگەیەکی تۆکمەت بەرقەرار کردووە (واتە کەسی یەکەم، دووەم یان سێیەم لە سەرەتاوە تا کۆتایی)؟

–ئایا دوایین پەرەگرافت بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە تەواوی بابەتەکەت پوخت دەکاتەوە و بەشێوەیەکی کاریگەر بەڵگاندنەکەت "بە کۆتا" دەگەیەنێت؟

هەر پەڵەیەکی گرفت بە قەڵەم رەنگێك رەنگ بکە. ئەگەر بیرۆکەیەکت لەبارەی ئەوەی کە چۆن ئەو بەشە چاك بکەیت، لە رەشنووسەکەتدا بینووسە. ئێستا دانیشە و دەست بکە بە جارێکی تر نووسینەوە. تەرکیز بخەرە سەر هەموو ئەو رووبەرانەی کێشە کە دۆزیوتنەوە.

ئەگەر پێویست دەکات، زانیاریی تازە دابنێ. یاری بە رستەکان، پەرەگرافەکان و تەنانەت تەواوی بەشەکان بکە.

ئیش لەسەر پەرەگرافەکانی دەستپێك و کۆتایی بکەرەوە

کاتێك دەزانیت کە بابەتێکی جوانت دارشتووە، پشکنینێکی پەرەگرافەکانی سەرەتا و کۆتایی بکەرەوە. کات تەرخان بکە بۆ جارێك و جارێکی تر چوونەوە بەسەریانەدا– بۆئەوەی ئەوەندەی بکرێ باشترینیان لێ دەربچێت. زیاتر لە بابەتێکی " زۆر باش نییە" نمرەیەکی باشتر لە چاوەڕوانکراوی بەهۆی "A+" لە پێشەکی و ئەنجامگیری بەدەستهێناوە.

پەرەگرافی دەستپێکی بابەتەکەت لە هەموویان گرنگترە. ئەمە بەڵگاندن بۆ یان لەدژی چی دەکەیت (و ئەمەی کە بۆچی ئەو دیوەت هەڵبژاردووە) دەردەخات و پاشماوەی بابەتەکە دەناسێنێت. ئەگەر بە باشتی نووسرابێت، ئەوا بەبێ وەستان مامۆستاکەت رووەو پاشماوەی بابەتەکە پاڵ دەنێت و چەند خاڵێکت بۆ رێکخستنی جوان دەستەبەر دەکات. ئەگەر بە لاوازی نووسرابێت، ئەوا لەوانە نییە گرنگ بێ کە دواتر چی دێت– دەشێ مامۆستاکەت بگاتە ئەو ئەنجامەی کە تۆ بە روونی نازانیت باسی چی دەکەیت و بەو پێیەش نمرەت بۆ دابنێت (لەکاتێکدا کە بە پێچەوانەوە لەوانەبوو کاتێکی کەمتر بە پاشماوەی بابەتەکەت بەسەر ببات).

وەکو سەمونی لەفە بیر لە پێشەکی و ئەنجامگیری بکەرەوە، وا دابنێ زانیاریی نێوانیش هەمبەرگر، کاهوو، تەماتە و ترشیاتە. لەوانەیە بەکێشکردنی سەرەکی ئەوە بێت کە لە نێوانەکەدایە، بەڵام تۆ پێویستت بە نانەکەیە ئەگەر بە لەفە ناوی ببەیت.

ئەمانەی خوارەوە هەندێ رێگەن بۆئەوەی بە کەمێك راکێشانەوە بابەتەکەت دەست پێبکەیت:

–شتێك بڵێ کە سەرنج رادەکێشێت.

–شتێکی مشتومڕئامێز بڵێ.

–وێنەی دیمەنێك بکێشە.

–رووداوێك سەر لەنوێ دروست بکەرەوە.

–ئیقتیباسێکی کاریگەر بەکاربێنە.

–پرسیارێکی وروژێنەر بکە.

بەلام – قەت– نوکتە بەکارمەهێنە. نوکتەکە بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە. زۆربەی مامۆستایان سوعبەت نازانن کاتێك نمرە دادەنێن.

**هەموو فاکتەکانت بپشکنە**

کاتێك چاککردنی ناوەرۆك و مانات تەواو کرد، دانەیەکی خاوێن چاپ یان تایپ بکە، پاشان هەموو فاکتەکانت دووجار چێك بکەرەوە بۆ دڵنیابوون لە کتومتی:

–ئایا ناوەکان، زاراوەکان و شوێنەکانت بە دروستی سپێلّ کردووە؟

–کاتێك بەروارەکان و ئامارەکانت ئیقتیباس کردووە، ئایا ژمارەکانت بە دروستی نووسیووە؟

–ئایا ئاماژەی سەرچاوەت داناوە بۆ هەر فاکت، دەربڕین یان ئایدیایەك کە هی خۆت نییە؟

–ئەگەر شتێکت لە سەرچاوەیەك وەرگرتووە، ئایا ئەو سەرچاوەیەت بە دەقاودەقی، وشە بە وشە، کۆما بە کۆما ئیقتیباس کردووە، ئایا شتەکەت خستووەتە ناو نیشانەکانی گواستنەوە "علامە نقل القول"؟

لە رەشنووسە نوێکەتدا هەر راستکردنەوەیەك نیشانە بکە. جارێکی تر، قەڵەم رەنگ یان بەکاربێنە بۆئەوەی دواتر بتوانیت بە ئاسانی راستکردنەوەکان بدۆزیتەوە.

لە جارێکی تر نووسینەوە بەردەوام بە

ئێستا تەنانەت سەرنجێکی وردتر بدە لە رستە و پەرەگرافەکانت. هەوڵ بدە نەرم و نیانتر، چڕتر و بۆ تێگەیشتن ئاسانتریان بکەیت.

–فرمانەکانی کردار و بکەردیار بەکاربێنە: "هەندێ لە مەیموونە دەست بەسەردا گیراوەکان بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ یان زیاتر لە ژیاندا ماونەتەوە" باشترە لە "٣٠ ساڵ یان زیاتر لەلایەن هەندێ لە مەیموونە دەست بەسەرداگیراوەکانەوە بەسەر براوە".

–ئەگەر بکرێ فرمانی ناتەواو بکە بە فرمانی کردار: باشترە کە بڵێیت "زریانێك لای دەریاکەوە هەڵیکردبوو" نەك "لای دەریاکەوە زریانێك هەبوو" یان "لای دەریاکە زریان بوو".

–ئایا درێژدادڕییەکی زۆر هەیە؟ هەر هەلێك کە بکرێ بقۆزەرەوە بۆ خستنەڕووی هەمان بیرۆکە بە وشەی کەمتر.

–ئایا شوێن هەن کە تیایاندا دەستەواژە دانان یان دارشتن نامۆیە؟ هەوڵ بدە رستەکە یان بەشەکە رێك بخەیتەوە بۆئەوەی باشتر بەرجەستە ببێ.

–ئایا وشەی وەسفیی رەنگاورەنگت بەکارهێناوە؟ ئایا بە خوێنەرت وتووە "فڕۆکەکان زیانیان بەرکەوتبوو" یان وێنەیەکی رەنگاورەنگتر و ئەفرێنەرانەترت پیشانداوە: "فڕۆکەکان ببوونە کۆمەڵە پارچەیەکی ژەنگاویی ئاوێزانبوو کە کونی فیشەکەکانیان بە روونی پێوە دیارمابوو"؟

–بەدوای قاموسێکدا بگەڕێ بۆ ئەو هاومانایانەی گونجاوترن لەو وشانەی کە لە بنەڕەتدا هەڵتبژاردوون. بەڵام زۆر دوور نەکەویتەوە و وشەی وەها لێڵ بەکاربێنیت کە خوێنەری ئاسایی ماناکانیان نازانێ. کاتێك گومانت هەیە، سۆراخی وشەی ئاشنا بکە نەك لێڵ، کورت لەبەرانبەر درێژ، بەرجەستە لەبەرانبەر گریمانەیی، وشەی راستەوخۆ لەبەرانبەر دەستەواژەی سەرگێژکەر.

–ئایا قسەی سواو یان دەربڕینی بازاڕیت لە ڕادەبەدەر بەکارهێناوە؟ بەتایبەت بە نووسینی ئەکادیمیدا، هیچیان بەشێوەی دیاریکراو پێشوازییان لێناکرێت.

–ئایا هەندێ وشەی دیاریکراوت لە رادەبەدەر بەکارهێناوە؟ بە بەردەوامی بەکارهێنانی هەندێ وشە نووسینەکەت تاقەتبەر دەکات. سۆراخی هاوماناکان بکە بۆ ئەگەرەکانی تر.

–وشەکان چۆن دەردەکەون؟ کاتێك بە دەنگی بەرز بابەتەکەت دەخوێنیتەوە، ئایا وەکو پارچە مۆسیقایەکی هاوریتم دێتەدەر؟ یان وەکو سرودێکی ماتەم دەردەچێت؟

–یەکێك لە باشترین رێگاکان بۆ بەخشینی کەمێك "وزە" بە نووسینەکەت، گۆڕینی بونیادی رستەکەتە. ناوبەناو رستەی کورت بەکاربێنە. تەنانەت زۆر کورتیش. رستەی بێ بکەر بەکاربێنە. رستەی سادە و ئاڵۆز بەکار بێنە.

–هەمیشە مەبەستی بابەتەکەت لەبیر بێت: گەیاندنی ئایدیاکانت ئەوەندەی بکرێ بە روونی و پوختی. بۆیە لەناو وردەکارییەکاندا ون مەبە. ئەگەر پێویست بکات لەنێوان ئەو وشە "کامڵ"ە و رێك و پێکترین بابەتی وێناکراو یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەوا روو بکەرە ئەوەی دووەمیان.

جارێکی تر، بە قەڵەمی رەنگاورەنگ راستکردنەوەکان لەسەر رەشنووسەکەت نیشانە بکە. پێویست ناکات جارێ بابەتەکەت چاپ بکەیتەوە– تا ئەو کاتەی کە ئەوەندە نیشانە کراوە کە خوێندنەوەی قورسە!

**هەنگاوی ١٠: دوایین بیبلۆگرافیای خۆت ئامادە بکە**

دەبێ بیبلۆگرافیاکەت لە کۆتایی بابەکەتدا بێت، لەسەر لاپەڕە یان چەند لاپەڕەیەکی جیاواز:

–ئینچێك لە سەرەوەی لاپەڕەکەوە: تایتڵەکە لە ناوەڕاستدا دابنێ "ئەو نیشانەی وەرگیراون" یان "ئەو نیشانەی سوودیان لێوەرگیراوە" بە پێی ئەوەی کە چ جۆرە بیبلۆگرافییەك بەکاردێنیت.

–هەمان مەودا بەکاربێنە کە بۆ تەواوی بابەتەکەت بەکارت هێناوە– ئینچێك.

–وا لەگەڵ لاپەڕەکانی بیبلۆگرافیت مامەڵە بکە کە درێژەی تێکستی بابەتەکەتن و بەو پێیە ژمارەبەندییان بکە– دەست مەکەرەوە بە ژمارەدانانەوە.

–بەپێی ئەلف بێ سەرچاوەکان لیست بکە، بە دوایین ناوی نووسەر. ئەگەر نووسەر ناوی نەهاتبوو، بە یەکەم وشەی تایتڵی بەرهەمەکە لیستەکە بکە (مەگەر ئەوەی یەکەم وشە "A"، "An" یان "The" بێت، لەم حاڵەتەدا بە دووەم وشەی تایتڵەکە لیستەکە بکە).

–دەبێ یەکەم دێڕی هەر سەرچاوەیەك بکەوێتە لای راست. هەموو دێڕەکانی تریان لەلای راستەوە پێنج سپەیسی بدەرێ.

–هەموو سەرچاوەکان دەبڵ سپەیس بکە و لەنێوان داخڵکردنەکاندا دەبڵ سپەیس بکە.

**هەنگاوی ١١: سپێڵت بپشکنە و بۆ راستکردنەوە بخوێنەرەوە**

ئێستا کاتی ئەوەیە کە بابەتەکەت لە هەر هەڵەیەکی رێزمان و سپێڵ دەرباز بکەیت. من پێم وتن کە بیرۆکەکانتان برگەی هەرە گرنگی بابەتەکەتانە. هەرواشەز بەڵام بەهەمان شێوە راستە کە هەڵە زەقەکانی رێزمان و سپێڵ وا لە مامۆستاکەت دەکات بڕوا بەوە بێنێ کە تۆ یان بێ باکیت یان تەواو نەزانیت– کە هیچیان ئاماژەی باش نین بۆ نمرەی کۆتاییت.

–وشە خراپ سپێڵ "حنجە" کراوەکان. هەر وشەیەك چێك بکە.

–خاڵبەندی هەڵە. بە یاساکانی دانانی کۆما، نیشانەی گواستنەوەی وتە، نوقتەکان و خاڵبەندی تردا بچۆرەوە. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە لە سەرتاپای بابەتەکەتدا پەیرەوی لەو یاسایانە دەکەیت.

–بونیادی ناتەواوی رستە. سۆراخی برگە رێزمانییە زیادەکان، ئامرازی پەیوەندیی نەگونجاو و هیتر بکە.

**هەنگاوی ١٢: با کەسێکی تر بیخوێنێتەوە و بۆت راست بکاتەوە**

بابەتەکەت چاپ بکەرەوە، بۆئەوەی هەموو ئەو راستکردنەوانە ئەنجام بدەیت کە لەماوەی دوایین هەنگاودا ئەنجامت دابوون. بابەتەکەت بەپێی رێنماییەکانی مامۆستا رێك بخەرەوە. دوایین بیبلۆگرافی و پەراوێزەکانت دابنێ.

تایتڵێك بدە بە بابەتەکەت، تایتڵێك کە کورت و ئەوەندی بکرێ جوانە بەڵام بە خوێنەران بڵێت کە دەکرێ چاوەڕێی چی بکەین بۆ فێربوون لە بابەتەکەوە.

کەسێك بدۆزەرەوە کە هەڵە راستکەرەوەیەکی باشە– دایك یان باوك، خزم، هاوڕێ– و داوای لێبکە بابەتەکەت بخوێنێتەوە بۆ هەڵە راستکردنەوە پێش ئەوەی دوایین رەشنووس ئامادە بکەیت.

**هەنگاوەکانی ١٣–١٤: دوایین رەشنووس**

هەر گۆڕانکارییەك بگرەخۆ کە لەوانەیە خوێندنەوەی راستکردنەوەکەت هێنابیە کایەوە. دوایین رەشنووس چاپ بکە. جارێکی تر هەڵە راست بکەرەوە– زۆر بە وریاییەوە.

ئەمانەش چەند فێڵێکن  کە سوودیان هەیە: (١) بە دەنگی بەرز بابەتەکەت بخوێنەرەوە. بەردەوام بە– لەسەربانەکانەوە دەنگت هەڵبڕە! سەرسوڕهێنە کە چەندە ئاسان بۆت دەردەکەوێ کە وشەکان لە شوێنی هەڵەن، رێزمانت لاوازە، تەنانەت چەند وشەیەکیش سپێڵیان تەواو نییە. (٢) لە کۆتاییەوە بەرەو سەرەتا بابەتەکەت بخوێنەرەوە. ئەمە وات لێدەکات تا تەرکیز بخەیتە سەر هەر کام لە تاکە وشەکان و رێگایەکی هەستییە بۆ دۆزینەوەی وشە خراپ سپێڵ کراوەکان.

دوایین هەنگاو؟ بابەتەکەت بخەرە ناو فایلێکەوە. پاشان رادەستی بکە– بێگومان لەکاتی خۆیدا!

راپۆرتە زارەکییەکان

هەندێ جیاوازیی سەرەکی هەن لەنێوان نووسینی راپۆرتێك و پێشکەشکردنی بە شێوەی زارەکی، بەتایبەت ئەگەر تۆ نەتەوێ هەڵەی خوێندنەوەی راپۆرتەکە تەنیا لەبەردەم پۆلدا بکەیت.

ئەگەر تۆ واجبی ئەوەت پێ سپێردراوە کە وتارێك لە پۆلدا پێشکەش بکەیت، لەوانەیە بکەوێتە ناو یەکێك لەو پۆلێنبەندییانەوە:

—روونکردنەوە: دەربڕینێکی راستەوخۆی فاکتەکان.

—بەڵگاندن: هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕاکانی لانی کەم بەشێك لە ئامادەبووان.

—وەسفکردن: دابینکردنی وێنەیەکی بینایی بۆ گوێگرانت.

—گێڕانەوە: باسکردنی رووداو یان بەسەرهات.

فۆرمە هەرە باوەکانی راپۆرتە زارەکییەکان کە لە قوتابخانە دەکرێنە واجب، روونکردنەوە و بەڵگاندنن. تۆ بۆت دەردەکەوێت کە تا رادەیەکی زۆر وەکو نووسینی بابەت، بۆ ئەم وتارانە زانیاری تاووتوێ و رێك دەخەیت.

بیرت بێت: ئەگەر تۆ خۆت بۆ (بەڵگاندن)ێك ئامادە دەکەیت، قەناعەت بە خۆت نەهێنیت کە پێویست ناکات تاووتوێی هەردوو لای بابەتەکەت بکەیت تەنیا لەبەرئەوەی کە تۆ تەنیا یەکێکیان دەخەیتەڕوو. دەبێ تۆ بە هەموو فاکتەکانەوە دووجار خۆت ئامادە کردبێت بۆ، چونکە لەوانەیە بکەویتە بەر تەحەدای پرسیار و بەڵگاندنەکانی قسەکەرەکانی تر.

لەکاتێکدا کە زانیاری کۆ دەکەیتەوە بۆ راپۆرتەکەت، بۆ نووسینی تێبینی لەسەر کاغەزە بچوکەکان، وەکو ئەوەی بۆ نووسینی بابەت کردتت، ئەمەت لەبیر بێت: بۆئەوەی کاریگەر بیت، پێویستە تۆ هەندێ تەکنیکی جیاواز بەکار بێنیت کاتێك تۆ رووداوێك "دەگێڕیتەوە" نەك "دەنووسیت". بۆ نموونە:

—ناونیشانەکەت فراوان مەکە. ئەم ئامۆژگارییە کە بۆ ئامادەکردنی راپۆرتە نووسراوەکانیش راستە، تەنانەت زۆر گرنگترە کاتێك وتارێك ئامادە دەکەیت. هەوڵ بدە وتارێکی کاریگەر لەسەر "ئیلینۆر روزڤێلت"، "رۆمانەکانی جەین ئۆستن" یان "سوپای ئەمریکا" لە ١٥ خولەکدا پێشکەش بکەیت، کە بە زۆری کاتی دیاریکراوە بۆ راپۆرتە زارەکییەکان. ئەم ناونیشانانە بۆ زنجیرەیەك لە کتێبەکان زۆر گونجاون!

"چۆن ئیلنۆر روزڤێلت رۆڵی خانمی یەکەمی گۆڕی"، "چۆنێتی شکستی فیلمی "بێ ئاگا" لەوەی پەیرەوی لە ستانداردەکانی (ئێما)ی جەین ئۆستن بکات" یان "لایەنە باش و خراپەکانی کوتانی ئەندامانی سوپا بە ڤاکسینی ئەنتراکس" ناونیشانی بەڕێوەبراوترن. تەسککردنەوەی مەودای وتارەکەت یارمەتیت دەدات کاریگەرتر تاووتوێ و ڕێکی بخەیت.

—ئەوەنــدە ئامــار بــەکار مەهێنــە. لەکاتێکـدا کـە زۆر گـرنگن بـۆ دانـانی قورسـایی بـۆ هەڵوێـستەکەت، بڕێکـی زۆر لێـی، تـەنا لـە کێـشی وتارەکـەت کـەم دەکاتـەوە و ئامـادەبووان بێتاقەت دەکات.

—وتە نەستەقەکان ڕەنگ و ژیان دەدەن بە وتارەکەت. بەڵام بـە وریاییـەوە بـەکاریان بێنـە، چونکە دەشێ وتارەکەت خاو بکەنەوە. خێرا بچۆرە سەر رستە پێکەنینهێنەرەکەت بەر لـەوەی کە باوێشکەکان دەست پێبکەن.

—لە بەرانبەر ئیقتیاباساتدا وریابە. بە پێچەوانەی نووسینی بابەتەوە، وتار ڕێگەت بۆ خـۆش دەکات تا خۆت وەکو هێزێك بونیاد بنێیت بە ترسێکی کەمترەوە لـەوەی کـە بـە دزی تۆمـەتبار بکرێیت. بۆیە تۆ دەتوانیت فـاکتی یـەکجار زۆرتـر بـەبێ گرێدانـەوە بـە سەرچـاوە بخەیتـەڕوو. (بەڵام باشترە کە سەرچاوەکانت هەبێ لە بارێکدا کـە لـەبارەی فاکتەکانـەوە پرسـیارت لێکـرا). دەتوانیــت ئیقتیبــاس بــەکار بێنیــت، بــەڵام کاتێــك زمــانی جیاوازیــان هەیــە یــان ســۆزێك رادەکێشن.دڵنیا بەرەوە لەوەی کە ئاماژە بە سەرچاوە بکەیت.

بۆم دەرکەوتووە کە هەوڵدان بۆ هەڵدانەوەی کۆمەڵە کاغەزێك لە بەردەم پۆلەکەتـدا قورسـە. کاغەزە بچوکەکان کە لە لـەپی دەسـتتدا جێگـەیان دەبێتـەوە بـەکارهێنانیان ئاسـانترە، بـەڵام تـەنیا ئەگـەر تێبینییـەکانی سـەریان زۆر کـورت و ئامانجیـان پێکابێـت. پاشـان ئەمانـە وەکـو "ئاراستەکەر" رۆڵ دەبینن نەك کاغەزی وشە بـە وشـە. چـەندەی تێبینییـەکان کـورتتر بـن— و چەندەی زیاتر پراوەی راپۆرتەکەت بکەیت بۆئەوەی هەر تێبینییـەك زانیـاریی گونجاو ئاراسـتە بکات— ئەوەندەش راپۆرتەکەت کاریگەر دەبێت. (چەندەی کەمتریش پێویـست بکـات سـەیریان بکەیت، ئەوەندە بەرقەرار کردنـی پەیوەنـدیی بینـایی لەگـەڵ پۆلەکـە و مامۆسـتاکەتدا ئاسـانتر دەبێ).

ئەمانەی خوارەوە چەند ڕێگایەکن بۆ ئەوەی راپۆرتە زارەکییەکان کاریگەرتر بکەیت:

-کەسێك دیاری بکە بۆ ئەوەی موخاتەبەی بکەیت- باشترە هاوڕێیەك بێت، بەڵام هەر کەسێکی تامەزۆر یان چالاك دەبێت- و وتارەکەتی ئاراستە بکە.

-پراوە بکە، پراوە بکە، پراوەی پێشکەشکردنەکەت بکە. زۆرجار شڵەژانەکان دەرەنجامی نەبوونی بڕوابەخۆبوونن. چەندەی بڕوات بەخۆت بێ لەوەی کە ماددەکەت دەزانیت، کەمتر دەشڵەژێیت و ئەوەندەش پێشکەشکردنەکەت ئاساییتر دەبێ.

-ئەگەر تۆ وەکو منیت و تەنیا بە بیرۆکەی وەستان لەبەردەم ژوورێکی پڕ لە خەڵك بە دەست "لەرزین"ە خۆنەویستەکانەوە دەناڵێنیت، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە دەتوانیت مینبەر، ریحلە یان شتێکی تر بەکار بێنیت بۆئەوەی خۆتی پێوە بگریت.

هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشە پێش ئەوەی بچیتە بەردەم پۆل. ئەگەر تۆ شوێنەکەت لەدەست دەدەیت یان بۆت دەرکەوت خەریکە بڕوابەخۆبوونت لە دەست دەدەیت، لە هەڵوەستەکردن، تەنانەت هەڵکێشانی هەناسەیەك یان دووانی قووڵ نیگەران مەبە.

## بەشی هەشتەم

# چۆن بۆ تاقیکردنەوەکان سەعی بکەیت

بە درێژایی ژیانی خوێندنت- و لەوانەشە پاشماوەی ژیانت- تاقیکردنەوە حەتمییە هەرچەندە هەندێ جار ترسێنەر و نیگەرانکەریشە. چەندەی زوو تەکنیکەکانی خۆئامادەکردن، ئەنجامدان و لێهاتوویی تاقیکردنەوەکان فێر بیت، ئەوەندە باشتر دەبێت.

**ئەوان دەیانەوێ چی بزانن؟**

زۆرێك لە تاقیکردنەوەکان چەندەی پێوەری زانینتن لەبارەی خودی ماددەکە، ئەوەندەش پێوەرێکی شێوازی سەعیکردنتن- توانات بۆ رێکخستنی شاخێك لە ماددە. ئەمە بەتایبەت بۆ هەر تاقیکردنەوەیەك راستە کە بانگەشەی پێوانەکردنی بەرهەمی زانینی ساڵانێك و لێهاتوویی تۆ لە پانتاییەکی فراوانی ماددەکە دەکات- تاقیکردنەوە بۆ ماستەر، تاقیکردنەوەی پۆلی دوانزەی بنەڕەتی، تاقیکردنەوەی کەفائە و هیتر. ئەمەش بەو مانایەیە کە دەشێ چەندەی باشتر سەعی بکەیت، نمرەی باشتر لەو تاقیکردنەوانە بێنیت.

پێش ئەوەی بتوانیت بڕیار بدەیت کە چۆن سەعی بکەیت بۆ تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو، زۆر گرنگە کە بزانیت دەقاودەق لە چ شتێك تاقی کردنەوە ئەنجام دەدەیت. خۆئامادەکردن بۆ کویزێکی هەفتانە زۆر جیاوازە لە خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ. هەروەها بونیادی تاقیکردنەوەکەش گرنگییەکی زۆری هەیە، مەرج نییە لەو رووەوە کە چۆن سەعی دەکەیت، بەڵکو لەو رووەشەوە کە کاتێك پرسیارەکانت دەکەوێتە بەردەست چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت.

### لە چی دەترسیت؟

تاقیکردنەوەکان شتی ترسناکن. بۆیە پێش ئەوەی بچمە سەر خستنەڕووی تەکنیکەکانی ئەنجامدانی تاقیکردنەوە، با مامەڵە لەگەڵ یەکێك لەو کێشە هەرە سەرەکییانەدا بکەین کە زۆرێك لە ئێوە ڕووبەڕووی دەبنەوە:شڵەژانی تاقیکردنەوە، کاردانەوەیەك کە لەپە دەستە ئارەقاوییەکان پیشانی دەدەن، مێشکێکی بەتاڵ و ئەنگێزەت بۆ ڕاکردن لە بچوکترین دەرفەتدا.

کاتێك کەسێك بانگەشەی ئەوە دەکات کە "لە تاقیکردنەوە باش نییە" مەبەستی چییە؟ بۆ زۆر کەس، بە ڕاستی بەو مانایەیە کە باش سەعی ناکەن (یان، لانی کەم، باش خۆیان ئامادە ناکەن). بۆ ئەوانیتر، دەشێ بەو مانایە بێت کە بە ئاسانی هۆشیان پەرت دەبێت، ئامادەییان تیا نییە بۆ ئەو جۆرە تاقیکردنەوەیەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، یان تەنیا لە ڕووی ئەقڵییەوە ئامادە نین "هیچ" تاقیکردنەوەیەك بکەن.

ئێمە هەمووومان سروشتی کێبڕکێکارانەی تاقیکردنەوەکان دەزانین. کاتێك ڕووبەڕووی تەحەدییەکی وەها دەبینەوە، هەندێکمان قوڵ و مەچەکی لێ هەڵدەماڵێت. ئەوانیتر بەهۆی فشارەوە باڵانسیان نامێنێت. لەوانەیە هەردوو کاردانەوەکە پەیوەندییەکی کەمیان هەبێت بە ئاستی زانین، زیرەکی ڕێژەیی، یان ڕادەی خۆئامادەکردنەوە. دەشێ زیرەکترین خوێندکارەکانی ناو پۆلەکەت ئەوانە بن کە زۆرترین ترسیان لە تاقیکردنەوەکان هەیە.

### بڕوام پێبکە، تۆ تەنیا کەس نیت

ئازایەتی بەدەست بێنە– خەڵکانێکی کەم چاوەڕوانی تاقیکردنەوە دەکەن، بەشێکی زیاتر لە ئێوە زیاتر لەوەی کە بیری لێ دەکەنەوە لە تاقیکردنەوە دەترسن. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە دەبێ بترسن.

خەڵکێکی کەم بە هێمنی، ئاسایی و ئامادە بۆ کردار، دەچنە شوێنی تاقیکردنەوە. زۆرێك لە ئێمە ناخمان خورپە دەکات، ئارەقە ڕژێنەکانمان لە گێڕی قورس دەڕۆن و ئارەزوویەکی جددیمان هەیە بۆئەوەی لە شوێنێکی تر بین... هەر شوێنێکی تر.

چەندەی زۆر فشار بخەیتە سەر خۆت– چەندە زیاتر ڕێگە بدەیت ترسی تاقیکردنەوە( و هەروەها نمرەی باشی ئومێد بۆ خوازراو) بێتە ناو مێشکتەوە، ئەوەندەش کەمتر یارمەتی خۆت

دەدەیت. (و چەندەی تاقیکردنەوەکە بە راستی گەورە بێت، ئەوەندەش ئەگەری زیاترە کە گرنگییەکەی بیر خۆت بهێنیتەوە).

با رووبەڕووی بینەوە: دەشێ نمرەکانت لە هەندێ تاقیکردنەوەدا کاریگەرییەکی گەورەیان هەبێت لەسەر چوونت بۆ چ کۆلێژێك، چوونت بۆ خوێندنی باڵا یان وەرگرتنی ئیشێك کە حەزت لێیەتی. بەڵام گرنگ نییە تاقیکردنەوەیەك چەندە گرنگ بێ بۆ ژیانی پیشەییت، بەهەمان ئاست گرنگە کە گرنگی ئەو تاقیکردنەوەیە لە مێشکتدا کەم بکەیتەوە. نابێ ئەمە کاریگەری لەسەر خۆئامادەکرنت دابنێ– دەبێ هێشتا وەها سەعی بکەیت کە ژیانت پەیوەستە بە نمرەیەکی باڵاتر. لەوانەشە وابێت.

لەوانەیە لەبەرچاوگرتنی تەواوی ئەزموونەکە یارمەتیدەر بێ: بیست ساڵ دوای ئێستا، کەس بیری نامێنێت یان باکی نییە لە چ تاقیکردنەوەیەکدا چەندت هێناوە– گرنگ نییە چ هەستێکی چارەنووسسازت بۆ ئەم تاقیکردنەوەیەی ئێستا هەیە.

بێگومان، تۆ دەتوانیت کردنی هەموو ئەمانە ئاسانتر بکەیت بە نەچوونە دەر لە رێگاکەت – بە دڵنیاییەوە پێش تاقیکردنەوەیەکی بەتایبەت گەورە یان گرنگ– بۆ زیاکردنی شڵەژان بۆسەر رووداوێکی هەنووکە شڵەژێنەر. دوو رۆژ بەر لە تاقیکردنەوەی بەکالۆری کاتی ئەوە نییە لە هاوڕێکەت گۆشەگیر ببیت، بگوازیتەوە، ئیشەکەت بگۆڕی، قەرزێکی گەورە رابکێشیت، یان هەر تەوژمێکی تر لە رووباری کپی ژیانتدا دروست بکەیت.

به هەبوونی هاوڕێی لەو شێوەیە...

هەندێ لە خەڵکی لەسەر نەگبەتییەکەیان دەژین و ئیرەییت پێ دەبەن گەر تۆش لەسەری نەلەوەڕێیت. ئەوان دەیانەوێ بتخەنە ناو خەمۆکییەکەیانەوە، چ ئەوەی بە راستی بزانیت یان خەمت بێت چ روودەدات.

ئەم پرۆفێشناڵانەی نیگەرانی، ئەو خەڵکانەن کە دەبێ لێیان دوور بکەویتەوە کاتێك خۆت بۆ تاقیکردنەوە ئامادە دەکەیت. ئەوان دەناڵێنن "ئاخ، قەت ئەو هەموو شتە فێر نابم!". لەوانەیە تۆ خاڵ لە "ئسلوبە جوانەکان" بەدەست نەهێنیت گەر بڵێیت "دەکرێ دەمت داخەیت

و سەعی بکەیت! " بەڵام دەتوانیت چێژ لە (بیرکردنەوە لێی) بەدەست بێنیت کاتێک بەرەو شوێنێکی هێمن بۆ سەعی بە ڕێگادا دەڕۆیت.

وریای ئەو "هاوڕێ"یانە بە کە شەوی پێش تاقیکردنەوە تەلەفۆنت بۆ دەکەن و دەڵێن بوەستە، "ئێستا بۆم دەرکەوت کە دەبێ لە بەشی ١٢ش سەعی بکەین!" مەکەوە داوەکەیانەوە. لەبری ئەوەی تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکەیت، بە هێمنی بیریان بهێنەرەوە کە ئەو پەڕە چاپکراوانەی مامۆستا دوو هەفتە لەمەوبەر دابەشی کردن بە روونی پیشانی دەدات کە تەنیا بەشی ٦ تا بەشی ١١ بۆ تاقیکردنەوەکە داخڵە. پاشان تەلەفۆنەکە دابخەرەوە، دوای ژیانی خۆت بکەوە و لێگەڕێ با تا دوایین تاقیکردنەوە دەستی نیگەرانییان بگووشن. (هەڵبەت، ئەگەر تۆ بەلاتەوە ئاساییە سۆراخی ئەوە بکەیت چ بۆ تاقیکردنەوە داخڵە، تەلەفۆنێکی وەها دەتتۆقێنێت...و کاتت بەفیڕۆ دەدات).

چۆن ئاستی شڵەژانت بێنیتە خوارەوە

بۆئەوەی لە "گرنگی"ی تاقیکردنەوەیەك تێبگەیت، ئەو لیستەی خوارەوە بخوێنەرەوە. زانینی وەڵام بۆ زۆرترین پرسیاری مومکین، یارمەتیت دەدات شڵەژانت کەم بکەیتەوە:

١.تاقیکردنەوەکە چ ماددەیەك دەگرێتەخۆ؟

٢.بەدەستهێنانی چەند نمرە مومکینە؟

٣.تاقیکردنەوەکە لە چ ئاستێکدا حسابی بۆ دەکرێ؟

٤.چەند کاتم هەیە تاقیکردنەوەکە بکەم؟

٥.تاقیکردنەوەکە لە کوێ دەکرێ؟

٦.چ جۆرە پرسیار لە تاقیکردنەوەکەدا دەبن (بەیەکگەیاندن، فرەهەڵبژاردن، وتار، ڕاست و هەڵە و هیتر)؟

٧.چەندێك لە هەر جۆرە پرسیارێك لە تاقیکردنەوەکەدا دێتەوە؟

٨.چەند نمرە بۆ هەر پرسیارێك دادەنرێ؟

٩.ئایا بەشی دیاریکراو لە تاقیکردنەوەکەدا هەن کە نمرەی زیاتر لەوانەیتریان لەسەر بێ؟

١٠.ئایا تاقیکردنەوەی کتێبی کراوە دەبێ؟

١١.چ دەتوانم ببەمە ژوورەوە لەگەڵ خۆمدا؟ حاسبە؟ نەستەلە؟ شتی تر کە گرنگن بۆ سەرکەوتووبوونم؟

١٢.ئایا کە وەڵامی هەڵەم دایەوە نمرەم لێ دەشکێت؟

### رێگاکە ببڕە

بۆ نەهێشتنی نیگەرانیی پێش تاقیکردنەوە، پیاسەیەك یان مەلەیەکی پڕ وزە بکە. لە رۆژانی پێش تاقیکردنەوەدا، گرنگ نییە چەندە "گەورە"یە، زۆر سەعی مەکە یان زۆر سەرسەختانە سەعی مەکە، دەنا بە مێشکێکی هیلاکەوە دەچیتە هۆڵی تاقیکردنەوە.

تۆ هەنوکە زانیووتە کە ناوبڕە بە بەرنامەکراوەکان لەماوەی رۆتینی سەعیکردندا تەرکیزت لەسەر کتێبەکان ئاسانتر دەکات و تەواوکردنی واجبەکانت بە تەرکیزی زیاترەوە خێراتر دەکات. بەخشتەکردنی ناوبڕەکان لەماوەی خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە هەمان کاریگەری هەیە.

گرنگ نییە سنووربەندییەکان یان فشارەکانی کات چین، هەست بەوە مەکە کە ناتوانیت ئەو ناوبڕە کورتانە دابنێیت. لەوانەیە ئەو کاتەی کە بڕوات وابێ بە کەمترین شێوە دەتوانی دابنێیت لە هەموو کاتێکی تر پێویستت پێیان بێت، هەروەکو چۆن ئەوانەی بە زۆرترین شێوە پێویستیان بە تەکنیکەکانی کات بەرێوەبردنە "ئەو کاتەیان نییە" بۆ فێربوونیان.

### هەنوکە پشوو بدە

ئەگەر مێشکت تێکەڵەیەکە لە فاکت و ژمارەکان، ناو و بەروارەکان، لەوانەیە بەلاتەوە قورس بێت بالانسی ئەو وردەکارییە دیاریکراوانە سفر بکەیتەوە کە پێویستە بیرت بێنەوە، تەنانەت ئەگەرچی هەموو ماددەکە لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا و بە پێچەوانەشەوە بزانیت. لەوانەیە ئەو هۆرمۆنی (ئەدرینالین) خورپەبەخشەی کە بە کۆئەندامەکەتدا تەوژم دەکات "بیر هاتنەوەی دەستبەجێ" نامومکین بکات.

سادەترین تەکنیکی پشوودان، هەناسەهەڵکێشانی قووڵە. لەسەر کورسییەکەت بە پشتدا پاڵ بکەوە، ماسولکەکان شل بکەرەوە و سێ هەناسە قووڵ هەڵکێشە (بۆ هەر هەناسەیەك کە رایدەگریت تا ژمارە ١٠ بژمێرە).

جۆرەها تەکنیکی ڕامان (مێدیتەیشن) هەن کە بەهەمان شێوە سوودیان بۆت هەیە. هەریەکەیان لەسەر هەمان بنەما ڕۆنراون– تەرکیزی مێشکت خستنەسەر یەك شت بۆ کردنەدەری هەموو شتێك. لەکاتێکدا کە تۆ تەرکیز دەخەیتەسەر ئامانجی ڕامانەکەت (ئەگەرچی ئامانجەکە هیچ بێت، وشەیەکی پوچ بێ یان خاڵێك بێت لەسەر دیوارەکە)، مێشکت ناتوانێ بیر لە هیچ شتێکی تر بکاتەوە، کە یارمەتی دەدات کە کەمێك خاو بێتەوە.

جارێکی تر کە ناتوانیت تەرکیز بکەیت، هەوڵ بدە پاڵ بەیتەوە، سێ هەناسەی قووڵ هەڵکێشیت و بۆ خولەکێك یان زیاتر تەرکیز بخەیتەسەر وشەی "ڕۆن". کاتێك تەواو بوویت، دەبێ لە حاڵەتێکی زۆر ئارامتر و ئامادەتردا بیت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر تاقیکردنەوەیەك.

خۆئامادەکردن بۆ نمرە گەورەکان لە تاقیکردنەوەدا

هەندێ لە سروتەکانی خۆئامادەکردن گونجاون بۆ هەر تاقیکردنەوەیەك، هەر لە کویزی هەفتانەوە تا تاقیکردنەوەی بەکالۆری و هەرشتێکی تر لەو نێوانەدا.

لە پێشەوە پلان دابنێ

دانی پێدا دەنێم. کاتێك من خوێندکار بووم، تەنانەت لە کۆلێژیش، چەماوەی هۆشم بە کۆتایی هەفتەکان سنووردار بوو. لەو خووانەی کە هەمبوو، سەعی دوایین خولەك، دروستکردنی قۆپی و نمرەکانی لاوازی بوون.

کلیلی خۆلادان لەو هەموو خراپییەکان پێداچوونەوەی ناوبەناوی ئاساییە. چەندەی زۆر پێدابچیتەوە، ئەوەندە کەمتر پێویست دەکات شەونخونییەکان رابکێشیتە ناو هەفتەی تاقیکردنەوەکەت. تۆ هەنوکە لە سەری سەرەوەی ماددەکەت ماویتەتەوە، ئەو پرسیارانەت نوسیووە و کردووە کە لە پێداچوونەوەکانت سەرچاوەیان گرتووە و بە تێبینییەکانی ناو پۆلەکەت و کتێبی مەنهەجتدا چوویت بۆ دڵنیا بوون لەوەی لە هەموو شتێك تێدەگەیت. پێداچوونەوەی دوایین خولەکت تا ڕادەیەك بۆ خۆشی و بەپلان دەبێ، نەك هەناسەتەنگانە و بەپەلە.

## دوو سەعاتی ورياكەرەوە بەكاربێنە

ئەنجامی لاواز لە تاقيكردنەوەيەك، ساردكەرەوەيە. كەوتن لە تاقيكردنەوەيەك كە هەستت كردبوو ئامادەيت بۆی، خەمناكە. لەدەستچوونی تاقيكردنەوەيەك بەتەواوی، كارەساتبارە. زەرورە كە بزانيت كەی و لە كوێ هەموو تاقيكردنەوەكان خراونەتە خشتەوە و كاتێكی زۆريان بۆ تەرخان بكەيت بۆ ئەوەی پێيان رابگەيت.

ئەگەر تۆ هێشتا لە ئامادەييت، پێڕاگەيشتن بە تاقيكردنەوەيەكی دياريكراو نابێ زۆر قورس بێت– دەشێ لە ماوەيەكی دياريكراوی وانەكەتدا لەناو پۆلێكی ئاسايی ئەنجام بدرێ. بەڵام لە كۆلێژ، لەوانەيە تاقيكردنەوەكان لە كاتی جياواز لە ماوەی ئاسايی وانەكە بخرێنە خشتەوە...و لە شوێنی جياوازيش ئەنجام بدرێن.

بەهەمان شێوە، لەوانەيە تاقيكردنەوە گەورەكانی وەكو بەكالۆری، تەنانەت لە قوتابخانەكەی خۆشتدا ئەنجام بدرێن. لەم حاڵەتانەدا، دڵنيا بەرەوەی لەوەی كە كاتی پێويست تەرخان دەكەيت بۆ رێگا، جا لە هەر كوێيەك بێت– بەتايبەت ئەگەر تۆ دڵنيا نەبيت چۆن ئەگەيتە ئەوێ!

هەركە كات و شوێنی تاقيكردنەوەكەت زانی، بيخەرە ناو رۆژمێری هەفتانەتەوە. چ ئەوەی لە ئامادەيی بيت يان كۆلێژ يان خوێندنی باڵا، زۆربەی قوتابخانەكان هەفتەيەك، دوو يان تەنانەت زياتريش بۆ تاقيكردنەوەكانی كۆتايی دادەنێن. ئەم ماوەيەی تاقيكردنەوە بەزۆری لە ناو پۆلدا رادەگەيەنرێ (بەزۆريش لە رۆژی يەكەمدا) و چاپ دەكرێت.

ئەگەر تۆ سەر لەبەيانی تاقيكردنەوەيەكت هەبێت و زۆر بترسيت لەوەی كە ئامادەييت تيا نەبێ، فێڵێك لە خۆت بكە– چەند رۆژێك پێش تاقيكردنەوە بەيانيان زوو هەستە، نانێكی باش بخۆ و واجبەكەت ئەنجام بدە يان بە تێبينييەكانتدا بچۆرەوە. ئەمە يارمەتيت دەدات تا وزەيەكی زۆر بخەيتەناو مێشكت و وای لێبكەيت رابێت لەسەر شيكاركردنی پرسيارەكان يان بيركردنەوەی جدی لەبارەی شەيكسپيەر لە كاتێكی زووتر لە كاتی ئاسايی.

## واجبە ئيختيارييەكان بكە بە ناچاری

هەندێ جار، وێڕای خوێندنەوەی ئاسابيت و واجبەكانی ترت، مامۆستا واجبی ترت لە سەرەتای كۆرسەكەدا دەخاتە ئەستۆ. لەوانەيە ئەم كتێب، وتار و كورتە توێژينەوانە قەت لە

هیچ وانەیەکدا قسەیان لەسەر نەکرێت- بەڵام رەنگە ماددەکەیان بۆ تاقیکردنەوەیەك داخڵ بێت، بەتایبەت تاقیکردنەوەی کۆتایی. ئەگەر بیرت چووە ئەم خوێندنەوە زیادەیە بخەیتە ناو رۆژمێری ئاساییتەوە، بەڵام هیوادار بوویت کە پێش تاقیکردنەوەکە بیانخوێنیتەوە، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە ئەوەندە کات برەخسێنیت کە ئەم کتێبانە بکریت یان بدۆزیتەوە.لەوانەیە ژمارەیەکی زۆری خوێندکارانی تر ئەو خوێندنەوانەیان جێ هێشتبێت بۆ دوایین خولەك و لەوانەیە تۆ نەتووانیت ئەو ماددەیە بدۆزیتەوە کە پێویستتە ئەگەر ماوەیەکی درێژ چاوەڕێ بکەیت.

قەڵەمەکان، قەڵەم رەساسەکان...نەستەلە

دواجار، هەر کەرەستەیەك کە پێویستتە بیهێنە بۆ تاقیکردنەوە، هەر لە قەڵەمەوە تا قەڵەم رەساس تا حاسبە. هەروەها پێشنیاری ئەوە دەکەم- بەتایبەت بۆ تاقیکردنەوەیەکی درێژ- کە نەستەلەیەك یان نوقڵ یان خواردنێکی "وزەبەخشی خێرا"تان پێ بێت بۆئەوەی بیخۆن کاتێك پێویستتان بە زللەیەکی بێدارکەرەوەی گریمانەییە.

هەرچەندە زۆرێك لە دەفتەرچە یان ئەسئیلەی تاقیکردنەوەکان بواری نووسینی تێبینییان هەیە، لەوانەیە بەس نەبێت بۆ مەبەستەکانتان. ئەگەر داوات لێکرا کە وتارێك بنووسیت، ئەوا پێویستت بە کاغەزی مسودەی زۆر دەبێت بۆ گەڵاڵەکردن و رێکخستنی بیرۆکەکانت پێش ئەوەی قەڵەم بخەیتەسەر کاغەز. بەهەمان شێوە، لەوانەیە تاقیکردنەوەیەکی بەتایبەت ئاڵۆزی ماتماتیك بە خێرایی هەموو کەنارەکانی پەرەی وەڵامدانەوەکەت بگرێتەوە، بۆیە کۆمەڵێك کاغەزی یەدەك لەگەڵ خۆتدا بێنە. کۆمەڵێك بارودۆخی کەم هەن کە تیایاندا بەکارهێنانی ئەم پەرە کاغەزانە قەدەغەن.

ئەگەر تۆ گوێت نەگرت پێش...

پێدابچۆرەوە، پێدابچۆرەوە، پێدابچۆرەوە. ئەگەر تۆ پەیرەوی لە ئامۆژگاریی من نەکەیت بۆ پێداچوونەوەی ناوبەناو، کات بەلاوە بنێ بۆ پێداچوونەوە و سەعی هەفتەیەك یان دووان پێش تاقیکردنەوە. زۆربەی کۆلێژەکان- و زۆرێك لە ئامادەییەکان- ماوەی خوێندنەوە یان سەعی

دەخەنەڕوو، زۆرجار هەفتەی پێش نیوەی ساڵ یان کۆتایی ساڵ، کاتێك هیچ وانەیەك ناوترێتەوە. کاتەکانی کتێبخانە زۆرجار درێژ دەکرێتەوە. کەڵك لەم کاتە وەربگرە.

چەندەی ماددەی زۆرت پێویست بێ بۆ پێداچوونەوە، ئەوەندەش گرنگترە کە خشتەکەت پاك بکەیتەوە. بارستەیەکی چوار، پێنج یان شەش کۆرسی کە ٢٠، ٤٠ یان زیاتری کتێب، محازەرە و مشتومڕ، بابەت و پرۆژە دەگرێتەوە، بە ئاسانی سەدان لاپەڕەی تێبینییەکان بەرهەم دێنێت. پێداچوونەوە، تێگەیشتن و سەعیکردن لێیان پێویستی بە تەقەلایەکی تەواوکات هەیە بۆ هەفتەیەك یان دووان. بۆیە دڵنیا بەرەوە لەوەی کە هەموو ئیشەکەی تری کۆتایی نیوەی وەرزی خوێندنت، بەتایبەت بابەت و پرۆژە گەورەکان، بەرەو تەواو بوونن.

ماددەکەت ڕێك بخە

١.هەموو ئەو ماددەیە کۆ بکەرەوە کە بۆ کۆرسەکە بەکارت هێناوە: کتێبەکان، ڕاهێنانەکان، مەلزەمەکان، تێبینییەکان، واجبەکان و تاقیکردنەوە و بابەتەکانی پێشوو.

٢.ناوەرۆکەکان لەگەڵ ئەو ماددەیە بەراورد بکە کە تاقیکردنەوەی لێ دەکرێت و پرسیار لەخۆت بکە: کتومت پێویستم بە پێداچوونەوەی چییە بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە؟

٣.(ڕێکخەری پێش تاقیکردنەوە) کە لە کۆتایی ئەم بەشەدایە فۆتۆکۆپی بکە. بە وریاییەوە بەشی "ئەو ماددەیەی دەبێ رووماڵ بکرێ" لەبەرچاو بگرە. دیاریکراو بە. چەندەی وردەکار بیت، ئیشێکی باشتر دەکەیت لە پێداچوونەوەی هەموو ئەو رووبەرانەی کە دەبێ بیانزانیت. ئەم راهێنانە یارمەتیت دەدات تا ئەوەی کە پێویستە بیکەیت، بە بارستە بکەیت.

٥.لەکاتێکدا کە بە ماددەکەدا دەچیتەوە و دەگەیتە ئەو ئەنجامەی کە بۆ تاقیکردنەوەکە دەیزانیت، خەتێکی تۆخی چێك کردن لە دێڕی "پێداچوونەوە"دا بێنە.

٦.ڕێنماییەکی گرنگ: پەڕەیەکی بچوکی قۆپی ئامادە بکە وەك بڵێی نیازی ئەوەت هەبووە لە تاقیکردنەوەدا قۆپی بکەیت کە بێگومان، نیازت نییە. بۆ سەعیی دوایین خولەك ئامادەی بکە. ئەگەر بایی پێویست بەختیشت هەبێ کە تاقیکردنەوەیەکی کتێبی کراوە بکەیت، سوپاسم بکە!

### ئەو کاتە تەرخان بکە کە پێویستتە

ئەو پرسیارانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرە کاتێك بیر لەو کاتە دەکەیتەوە کە پێویستتە بۆ سەعیکردن لە تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو:

–بە زۆری چەند کات بۆ ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە بەسەر دەبەم؟ ئەنجامەکان چۆن بوون؟ ئەگەر بەزۆری سێ سەعات بەسەر دەبەیت و هێشتا ئەنجامەکانت خراپن، لەوانەیە پێویستت بە هەڵسەنگاندنی ئەو کاتە هەیە کە بەسەری دەبەیت، یان وردتر، کە خراپ بەسەری دەبەیت.

–لە ئێستادا چ نمرەیەك دێنم؟ ئەگەر تەنیا ئاستی دووەمە (B) و قەناعەتت وایە کە ناتوانیت نمرەی یەکەم (A) بێنیت، دەشێ بڕیار بدەیت کە کاتی کەمتر بۆ تاقیکردنەوە و کاتی زیاتر بۆ ئەو ماددەیە تەرخان بکەیت کە تیایدا باشتر دەتوانیت بۆ نمرەی باشتر نیشانە بگریتەوە. ئەگەر نمرەکەت لاوازە (C+) و نمرەیەکی باش لە تاقیکردنەوە (B)یت دەداتێ، دەشێ بڕیار بدەیت کە کاتێکی زۆرتر بۆ ئەم ماددەیە تەرخان بکەیت.

–دەبێ چ سەعییەکی تایبەت بکەم؟ ئەمە شتێکە کە بە تێبینییەکانتدا بچیتەوە و لەگەڵ گروپێکی سەعیدا پراوە بکەیت، بەڵام ئەگەر پێویستت بەوەیە لە تاقیگەی زمان دابنیشیت و چەند سەعاتێك گوێ لە سی دییەکان بگریت یان گروپێکی خاوتر بەڕێوە ببەیت ئەوا بەو پێیە پلان دابنێ.

–ئەو ماددانە ڕێك بخە کە پێویستە سەعییان لێ بکەیت، ڕیتمی خۆت دیاری بکە و بزانە لە یەکەم سەعاتی پێداچوونەوەدا چەند ڕۆیشتوویت. ئەمە چۆن بەراورد دەکرێت بەوەی کە بۆ سەعی جێت هێشتووە؟ هەموو سەعاتەکان وەکو یەك بەرهەمهێن نابن، بەڵام دەبێ تۆ بتوانیت ئەو کاتە بەرجەستە بکەیت کە پێویستتە پەیوەست بەوەی کە لە سەعاتێکدا دەتوانی چەند بە ئەنجام بگەیەنیت.

### بۆچی سەعیی دوایین خولەك کاریگەریی نییە

هەموومان جارێك لە جاران، بە پۆزشێك ئەمەمان کردووە– تا دوایین سات چاوەڕێ بووین و پاشان هەوڵماندواە بەهای کاری هەفتەیەك یان مانگێك یان تەواوی وەرزێکی خوێندن بئاخنینە ناو شەوێك یان کۆتایی هەفتەیەك. ئایا ئەمە بۆ تۆ کاریگەری هەبوو؟ پێت وانیە.

راستییەکە ئەوەیە کە دواخستن بۆ دوایین سات- لە ئاستێك لە ئاستەکاندا- تەنیا بۆ هەندێ لە خوێندکاران کاریگەرە. بە جۆرێك لە جۆرەکان، ئەوان لە ئێمەومانان زیاتر دەتوانن شتی زۆر بخەنە ناو یادەوەریی کورت مەوداوە و بە راستیش، لانی کەم بۆ ٢٤ سەعات، بیریان بێت. ئەی پاش ئەو ٢٤ سەعاتە؟ با دەبیات. کە بەو مانایەیە ئەگەر توانیان لە کویزێکی هەفتانە باش بن، هەموو ئەو پەلەپەلییەی دوایین سات هیچ وەهای لەباردا نەبووە بۆ تاقیکردنەوەی داهاتووی نیوەی سالْ یان کۆتایی سالْ.

ئەوانیتر لە ئێمە ئەو برە سوودەش وەرناگرین- پاش شەوێك لە نەخەوتن و خواردنەوەی قاوەیەکی زۆر، بەختمان هەیە کە بیرمان بێت تاقیکردنەوەمان هەیە. چەند سەعاتێك دواتر، دوای هەوڵدان بۆ بێدار مانەوە تا کاتی پێویست و گەڕانەوە بۆ ناو پێخەف، نەك تەنیا هیچ فێر نەبووین، تەنانەت لەو تاقیکردنەوەیەشدا باش نەبووین کە لە دوایین ساتدا ئەو هەموو گوڕوتینەمان بۆی خستبووەگەڕ!

لەوانەیە ئەمە باشترین هۆکار بێت بۆئەوەی کە لە دوایین خولەکدا سەعی نەکەین- سوودی نییە!

هەرچۆنێك بێت چۆن لە دوایین ساتدا سەعی بکەیت

لەگەڵ ئەوەشدا، سەرباری بڕیارەکەت، باشترین نیازەکانت و بیروڕای تۆکمەت لەمەڕ ئەوەی کە سەعیی دوایین خولەك پێشنیارێکی فاشیلە، دەشێ خۆت لە -هەرچەندە مەرج نییە زووزوو- پێگەیەکدا بدۆزیتەوە کە پێویستت بەوەیە شەوی پێش تاقیکردنەوەیەك کە هیچ سەعیت بۆی نەکردووە شتێك بکەیت. ئەگەر وایە، ئەمە ئامۆژگاری منە بۆئەوەی شەوی سەعی دوایین ساتەکەت لانی کەم تا رادەیەك سەرکەوتوو بێت:

-واقعبین بە لەمەڕ ئەوەی کە دەتوانیت بیکەیت. بە دڵنیاییەوە ناتوانیت بەها کاری وەرزێکی خوێندن لە تاکە شەوێکدا جڵەو بکەیت، بەتایبەت ئەگەر ئامادەبیت لەو وانەیەدا دەگمەن (یان هەر نەبووبێت) و تەنیا چاوت بە چەند لاپەڕەیەکی کتێبەکانی مەنهەجەکەدا خشاندبێت. چەندەی هەوڵ بدەیت زانیاریی زۆر لە کاتی کەمدا وەربگریت، ئەوەندە کەمتر بێ توانا دەبیت.

واقعبین بوون بەو مانایەیە کە هۆشیارانە بارودۆخەکەت هەڵسەنگێنیت- تۆ بە سەری پەنجەکانتەوە خۆت هەڵواسیووە و هەوڵ دەدەیت خۆت لە کەوتنە ناو مەنجەڵێك رۆنی قرچاو دەرباز بکەیت. خۆلادان لە رۆنەکە، رزگارکردنی خانمەکە و بۆمانەوەی میرنشینەکە (بەدەستهێنانی (A) لە تاقیکردنەوە) کەمێك زۆرە داوای بکەیت، گرنگ نییە کام "هێزە ئەفسانەییە" پشتیوانیت دەکات.

بژاردەیی بە و بە قووڵی سەعی بکە

چەندەی وانەی زۆرت لەدەستدا بێت، ئەوەندەش دەبێ بژاردەیی بیت لە رێکخستنی جەلەسەی سەعی دوایین ساتت. ناتوانی لە هەمووی سەعی بکەیتەوە. بۆیە پێویستە- ئەوەندەی لە تواناتایە- ئەوە بناسیتەوە کە کام بابەتانە بە دڵنیاییەوە لە تاقیکردنەوە دێنەوە. ئینجا تەنیا لەوانە سەعی بکەیت. لەم بارەدا وا باشترە کە برێکی زۆر لەبارەی کەمێکەوە بزانیت نەك کەمێك لەبارەی زۆرەوە. لەوانەیە تۆ خۆشبەخت بیت و ئەو سێ بابەتە هەڵبژێریت کە سێ وتارەکە دەیگرنەخۆ!

-مەسازی یادەوەریت بکە. هەر تەکنیکێکی یادەوەری بەکاربێنە کە فێری بوویت بۆ زیادکردنی ئەوەی لە تواناتدایە لە یادەوەری کورت مەوداتدا بیهێڵیتەوە.

-بزانە کەی وازدێنیت. کاتێك ناتوانیت ناوی خۆت بیر بێتەوە یان تەرکیز بکەیتەسەر کتێبەکەی بەردەمت، واز بێنە و بچوو کەمێك بخەوە.

- بەیانیی زوو لەبەرچاو بگرە نە سەعی دوایین ساتی شەو، بەتایبەت ئەگەر کەسێکی "بەیانیان" بیت. من بۆم دەرکەوتووە کە زۆر کاریگەرترە زوو بخەویت و هەڵسیت نەك درەنگ بخەویت و بە بێتاقەتی هەستیت.

(چەند خولەکی یەکەمی تاقیکردنەوەکەت بە نووسینی هەموو ئەو شتانەوە بەسەر ببە کە لەبیرتن بەڵام ترست هەیە بیرت بچنەوە).

کاتێك گومانت هەیە، پرسیار بکە

بەڵێ، مامۆستا هەن کە لە وردەکارییە هەرە ناخۆشەکانی کۆرسەکەیان ئیمتیحانتان دەکەن، داواتان لێ دەکەن هەرچی کاغەز و کتێب و تێبینی هەیە پێیدا بچنەوە.

پێم وانییە هەموو مامۆستاکان بەو شێوەیە ئیش بکەن. زیاتر ئەگەری هەیە کە لە بەشێکی بچوکی کۆرسەکەدا ئیمتیحان بکرێیت- ئەو بابەت یان پرسیارە دیاریکراوە یان فاکت یان ژمارانەی کە مامۆستا پێی وایە گرنگترینن.

چۆن دەزانی ئەمانە کامانەن؟ بە دەربڕینێکی تر، چۆن دەزانی چی لە تاقیکردنەوەکەدا دێتەوە؟

مامۆستاکان زۆر سەرەداو دەدەن بە دەستەوە. بە گشتی، دەشێ چەندەی زیاتر هەمان ماددە ببینیت یان ببیسیت، ئەوەند زیاتر گرنگ بێت و ئەگەری زیاتر بێ کە لە تاقیکردنەوەدا بێتەوە.

پێویست ناکات فاکتێك یان بابەتێك دووبارە بێتەوە تا هاوار بکات "فێرم بە!" هەروەکو چۆن فێر بوویت تەماشای زمانی جەستەی مامۆستایەك بکەین و گوێ بۆ سەرەداوە زارەکییەکان شل بکەیت بۆ ناسینەوەی بابەتە شایستەکان، فێر دەبیت ئەو بابەتانە بناسیتەوە کە مامۆستا- بەشێوەیەکی نازارەکی- دەڵێت لەهەمووان گرنگترن. دەشێ تێڕوانینی مامۆستاکەت بەرانبەر تێبینی نووسینەوەش هۆشداریت پێبدات. ئەگەر داوات لێبکات تێبینی چڕوپڕش بنووسنەوە- تەنانەت بیەوێ رادەستیشیان بکەیت(هەندێ جار لە ئامادەیی و بەدەگمەن لە کۆلێژ)- پێم وایە تێبینییەکانی ناو پۆلتان زۆر لە کتێبەکانی مەنهەجتان گرنگتر دەبن. بەو پێیە سەعی بکە.

ئایا لە تاقیکردنەوە و کویزەکانی پێشووی ئەو وانەیە رزگار بوویت؟ پێویستە تاقیکردنەوە گەڕاوەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە لەلایەن مامۆستاکەتەوە لەسەری نووسراوە، ئاماژەیەکی نایابت پێبدات لەبارەی ئەوەی کە تەرکیزی کاتی سەعیت بخکەیتە سەر کوێ.

ئایا هەڵەیە پرسیار لە مامۆستا بکەیت کە پێشبینی چ جۆرە تاقیکردنەوەیەك بکەیت؟ بە هیچ شێوەیەك نە. ئایا هەمیشە پێت دەڵێت؟ بە هیچ شێوەیەك نە. ئەگەر دەستت بگاتە ئەو پرسیارە کۆنانەی هەمان ئەو مامۆستایە نووسیوونی، بەتایبەت ئەگەر هەمان ماددە بگرنە خۆ کە لەوانەیە لە تاقیکردنەوەدا بێنەوە، بۆ پێداچوونەوە بەکاریان بێنە.

چاوەڕێی ئەوە مەکە هەمان ئەو پرسیارانە جارێکی تر بێنەوە. هیچ مامۆستایەك ئەوەندە ئاسانگیر نییە. بەڵام شێوازی ئامادەکردنی تاقیکردنەوەکە، ئەو جۆرە پرسیارانەی کە دانراون

و ئاوێتەی پرسیارەکان (١٠٠ ڕاست و هەڵە، ٥٠ فرەهەڵبژاردن و شەرحێك) ئایدیایەکی باشتر دەداتێ لەمەڕ ئەوەی چاوەڕوانی چی بکەیت لە تاقیکردنەوەدا.

بشزانە ئاخۆ دەتوانیت کەسێك بدۆزیتەوە کە ساڵی ڕابردوو یان وەرزی خوێندنی ڕابردوو ئەو مامۆستایەی هەبووە. دەتوانن هۆشداری، ڕێنمایی، ئامۆژگاری یان ئاماژەیەکت بدەنێ؟

هەندێ لە مامۆستاکان حەزیان تەنیا لە یەك جۆری پرسیارە. هەندێکیان ئارەزوومەندی ڕاست و هەڵەن، ئەوانیتر لەگەڵ فرەهەڵبژاردنی کورتن. ئەگەر تاقیکردنەوە کۆنەکان، خوێندکارانی پێشوو، قسەکانی خودی مامۆستا لەمەڕ تاقیکردنەوەی ئاینده و ئەزموونی خۆت پێت بڵێن ئەمە ڕاستە، دەشێ تۆش بۆ ئەو جۆرە تاقیکردنەوەیە سەعی بکەیت. هەڵبەت دەبێ تۆ هێشتا ماددەکە بزانیت. تەنیا ئەوە هەیە کە پێویستە ئەوە بیر خۆت بێنیتەوە کە بە فۆرمێکی دیاریکراو مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

باشترین مامۆستاکان لێکدراوێکی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە بەکاردێنن بۆئەوەی بۆیان دەربکەوێ چی دەزانیت. بە ڕاشکاوییەوە دەڵێم، هەندێکیان ڕقیان لە نمرەدانانی پرسیارەکانی وتار (یان شەرح)، بۆیە بە دەگمەن بەکاریان دێنن. بۆچی مامۆستاکانی تر پرسیارەکانی وتار بەکاردێنن؟

١.ئامادەکردنیان خێراتر و ئاسانترە.

٢.لەوانەیە پەسەندتر بن کاتێك گروپێك بچوکە و تاقیکردنەوەکە جارێکی تر بەکارنایەتەوە.

٣.بەکاردەهێنرێن بۆ کەشفکردنی تێڕوانینی خوێندکار نەك پێوانەکردنی دەستکەوتەکانیان.

٤.بەکاردەهێنرێن بۆ هاندان و پاداشتکردنی گەشەی شارەزایەتی خوێندکار لە نووسیندا.

٥.گونجاون کاتێك گرنگە خوێندکار ڕوون بکاتەوە یان وەسف بکات.

٦.زۆر گونجاوترن بۆ هەندێ ماددە. لەوانەیە تۆ لە ئینگلیزی و مێژوودا پرسیاری زیاتری وتارت هەبن بە بەراورد بە زانستەکان.

هەندێ لە مامۆستاکان پرسیاری بابەتی (مەوزوعی)یان پێباشترە چونکە:

١.ئەمانە پەسەندترن کاتێك گروپەکە گەورەیە و لەوانەیە تاقیکردنەوەکە بەکاربهێنرێتەوە.

٢.ئەمانە پراوپڕترن کاتێك کە پێویستە نمرە زۆر جێ متمانەکانی تاقیکردنەوە دەستبەجێ بەدەستبهێنرێن.

٣.ئەمانە زۆر گونجاوترن بۆ گرتنەخۆی برێکی زیاتری ناوەرۆك لە هەمان برەکاتدا.

٤.ئەمانە بۆ مامۆستا ئاسانترن بۆئەوەی نمرەیەکی بێ لایەنانە دابنێت. بۆ نموونە هەر خوێندکارێك دەبێ "C" بنووسێت بۆئەوەی پرسیاری ژمارە ٢٢ی راست بێت.

٥.ئامادەکردنی ئەمانە بۆ هەندێ مامۆستا ئاسانترە.

٦.دەشێ ئەمانە کاتێك بەکاربێن کە پێویستە خوێندکاران دەربکەون.

قەت سەعی لە "هەمووشتێك" مەکە

هەر کە جۆری ئەو تاقیکردنەوەیەت بۆ دەرکەوت کە رووبەرووت دەبێتەوە، پێویستە بزانیت چی لە تاقیکردنەوەکەدا دێتەوە (و لێرەوە، پێویستە سەعی لە چی بکەیت). بیرت بێت، کە بە دەگمەن، ئەویش ئەگەر،"هەموو شتێکە".

بە لایەنی زۆرەوە، پێداچوونەوەیەکی کورتی ئەو ماددەیە بکە کە قەناعەتت وایە ئەوەندە گرنگ نییە کە لە تاقیکردنەوەی ئایندەدا دابنرێ. ئەمە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کاتی زیاترت بۆ تەرکیز پێدەدات لەسەر ئەو رووبەڕانەی کە دڵنیایت دێنەوە.

پاشان پەرەیەکی "سەعی لێکردن" دروست بکە بۆ هەر تاقیکردنەوەیەك. لەسەری، هەندێ کتێبی دیاریکراو بۆ پێداچوونەوە، تێبینی بۆ چوونەوەسەر و بابەت، قاعیدە، ئایدیا و چەمك ریزبەندی بکە بۆ چوونەوەسەر. ئەم شێوازە تەمبەڵیکردن بچوك دەکاتەوە، بە شێوەیەکی لۆژیکی سەعیکردنەکەت رێك دەخات و "تەکان"ی بەردەوامی سەرکەوتنت دەداتێ لەکاتێکدا کە هەر برگەیەك تەواو دەکەیت.

خۆت تاقی بکەرەوە

تۆ کردووتە بە خوویەك کە لەکاتی سەعیکردن لە تێکستەکانتدا پرسیار بنووسیتەوە، بۆچی هەوڵ نەدەیت تاقیکردنەوەکانی خۆت دابرێژیت؟ چەندەی قورستر ئامادەیان بکەیت، باشتر ئامادە و بروابەخۆت دەبیت کاتێك رووبەرووی تاقیکردنەوەی واقیعی دەبیتەوە.

تاقیکردنەوەکانی پراوەکردن، سوودی واقیعیت پێ دەگەیەنن، چ ئەوەی بۆ کویز سەعی بکەیت یان بەکالۆری یان کەفائە. لە راستیدا، چەندەی تاقیکردنەوە درێژتر و بەستانداردکراوتر بێت، ئەوەندە گرنگە کە ئاشنا بیت بە بونیادەکەی، رێساکانی و تەڵەکانی.

یەکەم و پێش هەموو شتێك، ئاشنابوون بە هەر جۆرێکی تاقیکردنەوە کە ئەنجامی دەدەیت بێ رادە گرنگە، چونکە توانات پێ دەدات بەشێوەیەکی ستراتیژی سەعی لە ماددەکە بکەیت (ئەولەویەتی پێ بدەیت) و بەشێوەیەکی ستراتیژی جێبەجێی بکەیت (رێك بخەیت). ئاشنابوون ئاسوودەیی بەدواوەیە و ئاسوودەیی –ئارامگرتن– کلیلی باشبوونە.

ئاشنابوون بەهەمان شێوە رێکخستنی لێدەکەوێتەوە، رێگەت بۆ خۆش دەکات تا تەرکیز بخەیتەسەر خودی تاقیکردنەوەکە نەك بونیادەکەی. ئەمە کاتی زیاترت پێدەدات تا بەشێوەیەکی واقیعی تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەیت نەك ئەمەی لێی تێبگەیت. ئەمە بەهەمان شێوە کاریگەریی هەر سنووربەندییەکی کات کەم دەکاتەوە کە تاقیکردنەوەکە بەسەرتدا دەیسەپێنێت.

دواجار، ئەنجامدانی تاقیکردنەکانی پراوەکردن رێگایەکی زۆر کاریگەرن بۆ سەعیکردن و بیرهاتنەوەی ماددەکە.

رێساکان و بیرهێنەرەوەکانی رۆژی تاقیکردنەوە

ئەگەر تاقیکردنەوەکە لە کاتێکی ئاسایی وانەکەدا نییە، دڵنیا بەرەوە لەوەی کە زوو بگەیتە شوێنی تاقیکردنەوەکە. پەیوەست بەو شێوەیەی کە بەلاتەوە پەسەندە (بڕوانە بەشی دووەم)، لەو شوێنە دانیشە کە حەزت لێیە.

لەگەڵ ئەوەشدا وریابە. لەوانەیە هەندێ جیاوازی هەبن کە پێویست بکات لەبەرچاویان بگریت. لە تاقیکردنەوەیەکدا کە ۲۰۰ بۆ ۳۰۰ کەس ئامادەیە، باشییەکی بەرچاو هەیە لە دانیشتن لە پێشەوە: باشتر دەتوانیت گوێت لە رێنماییەکان و وەڵامی پرسیارەکان بێت و بەشێوەیەکی گشتی یەکەم کەس بە تاقیکردنەوەکە ڕادەگەیت (و دوایین کەس رادەستی دەکەیت).

کات تەرخان بکە بۆ چاوخشاندن بە تاقیکردنەوەکەدا

ئەگەر مۆڵەتت هەیە بۆ ئەوەی بە تەواوی چاوی پێدا بخشێنیت، پێش دەست کردن بە تاقیکردنەوەکە ئەمە بکە. بیرۆکەیەکی گشتی لەوەی کە لەبەردەمتایە بۆ خۆت فەراهەم بکە.

بەم شێوەیە تۆ دەتوانیت بەشە ئاسانترەکان بدۆزیتەوە و بیرۆکەیەکت لەبارەی نمرەی هەر بەشێك هەبێت.

من ئەو خوێندکارانە دەناسم کە بەناو تەواوی تاقیکردنەوەکەدا دەڕۆن و بەسەر چەند بڕە کاتێکدا دابەشی دەکەن پێش ئەوەی هەر پرسیارێك بخوێننەوە یان تاکە وەڵامێك بنووسن- تەرخانکردنی ٢٠ خولەك بۆ بەشی یەکەم، ٤٠ بۆ بەشی دوو و بەم شێوەیە. تەنانەت لە تاقیکردنەوە فرەهەڵبژاردنەکانیشدا، ئەوان تێکڕای ژمارەی پرسیارەکان دەژمێرن، دابەشی کاتی دیاریکراوی دەکەن و "ئامانجگەلێك" دادەنێن لەسەر ئەوەی دەبێ چ کاتێك بگەنە پرسیاری ١٠، پرسیاری ٢٥ و هیتر.

رێساکانی واقیع بزانە

ئایا لەبەرانبەر مەزەندەکردندا سزا دەدرێیت؟ لەوانەیە مامۆستا پێت بڵێت کە لەبەرانبەر هەر وەڵامێکی راستدا دوو نمرە بەدەست دێنیت، بەڵام لە بەرانبەر هەر دانەیەکی هەڵەدا نمرەیەك لەدەست دەدەیت. بە دڵنیاییەوە ئەمە کار دەکاتە سەر ئەوەی ئاخۆ مەزەندەی پرسیارەکە دەکەیت یان جێی دەهێڵیت- یان، لانی کەم، ئەمەی کە هەست دەکەیت پێویستت بە بنەبڕکردنی چەند وەڵامی گریمانەیی هەیە پێش ئەوەی مەزەندەکردن لە بەرژەوەندیتدا بێت.

لە حاڵەتی تاقیکردنەوەیەکی ستانداردکراودا، وەکو تۆفڵ، رێنماییەکان لەسەر تاقیکردنەوەیەکی پێشوو بخوێنەرەوە پێش ئەوەی بچیتە شوێنی تاقیکردنەوەکە. (چەندەها کتێب هەن کە "پرسیارەکانی پێشوو"یان لەخۆگرتووە). پاشان تەنیا چاو بخشێنە بە رێنماییەکانی ناو ئەو کتێبەدا بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هیچ شتێك گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. ئەمە کاتت بۆ دەگەڕێنێتەوە- کاتێك کە لەماوەی تاقیکردنەوەیەکی وەهادا بەنرخە.

ئایا پرسیارەکان یان بەشەکان قورساییان هەیە؟ هەندێ لە تاقیکردنەوەکان دوو، سێ یان پرسیاری زیاتریان هەیە، کە هەندێکیان نمرەی زۆر کەمیان لەسەرە- ١٠ یان١٥٪ی نمرەی کۆتاییت. لەوانەیە بەشێك، بەزۆری وتارێکی گەورە، نمرەی زۆری لەسەر بێت- ٥٠٪ یان زیاتری نمرەکەکەت. لێگەڕێ با ئەمە کار بکاتە سەر ئەو بڕە کات و وزەیەی کە تۆ بۆ هەر بەشێك تەرخانی دەکەیت.

ئاگاداری کات بە. جارێکی تر، ئەگەر پرسیارەکان یان بەشەکان قورساییەکیان هەبێت، دەبێ کاتی زیاتر فەراهەم بکەیت بۆ ئەوانەی کە ٩٠٪ی نمرەکەت پێکدەهێنن و بە خێرایی ئەو بەشە ١٠٪یە تەواو بکە لەکاتێکدا کە مامۆستا ئەسئیلەکان کۆ دەکاتەوە.

رێگای خۆت بەرەو نمرەیەکی باش دارێژە

بە درێژایی تاقیکردنەوەیەك، هەلی ئەوە لەدەست مەدە کە وێنەیەك بۆ خۆت بکێشیت ئەگەر یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتن لە پرسیارەکە یان وەڵامی راست بدۆزیتەوە. ئەگەر پرسیارەکە لەبارەی هەر جۆرە هۆکار و دەرەنجامێکە کە چەند هەنگاوێکی تێدایە، لە رێگەی بەکارهێنانی رەمز یان وشەی کورت کراوە بە خێرایی ئەو هەنگاوانە بکێشە یان بنووسە. دەشێ ئەم یارمەتیت بدات بۆ بینینی برگە نادیارەکان، تێگەیشتنی پەیوەندییەکانی نێوان بەشەکان و هەڵبژاردنی وەڵامی دروست.

جیاکاری بکە و لاببە

زۆرجار مەزەندەکردن هیچ عەیبی تیا نییە، هەڵبەت مەگەر ئەوەی کە خۆت بزانیت کە وەڵامە هەڵەکان سزایان لەسەرە. تەنانەت ئەو کاتەش، زۆرجار پرسیارەکە ئەوەیە چەند جار مەزەندە بکەیت (و لەسەر چ بنەمایەك).

ئەگەر سزایەك نەبێ بۆ وەڵامەکە هەڵەکان، نابێ قەت وەڵامەکان بە بۆشی جێ بهێڵیت. بەڵام دەبێ تۆ هەموو شتێکیش بکەیت کە دەتوانیت بۆ زیادکردنی ئەگەرەکانی راست بوونت. ئەگەر هەر پرسیارێکی فرەهەڵبژاردن چوار رێگەچارەت پێ بدات، بۆ هەرجارێك کە مەزەندە دەکەیت تۆ ٢٥٪ی هەلی راستبوونت هەیە (و، بێگومان، ٧٥٪ی چانسی هەڵەبوونیشت هەیە).

بەڵام ئەگەر تۆ بتوانیت تاکە وەڵامێك لاببەیت– وەڵامێك کە بەشێوەیەکی مەعقول دڵنیایت ناتوانیت راست بیت– چانسەکانی راستبوون بە رێژەی ٣٣٪ زیاد دەکات.

هەروەها گومانی تیا نییە کە ئەگەر بگەیتە سەر رێگەچارەیەك لەنێوان دوو وەڵامدا، تەنیا وەکو هەڵدانی دراوێکی ئاسن وایە: ٥٠–٥٠. لە دوورمەودا دا، تۆ ئەوەندەی هەڵەکان، مەزندەی راستەکان دەکەیت. تەنانەت ئەگەرچی سزایەك هەبێت بۆ مەزەندە کردن، لەوانەیە من وەڵامێکم هەڵبژاردایە ئەگەر ئەگەرەکانم بۆ ٥٠–٥٠ کەم بکردایەتەوە.

گریمانەکردنی ئەمەی کە تۆ وەڵامێك یان زیاترت لابردووە، بەڵام هێشتا لە وەڵامی راست دڵنیا نیت و ڕێگایەکی دیاریکراوت نییە بۆ لابردنی هیچی تریان، ئەمەی خوارەوە چەند ڕێنماییەکی شارەزایەکن بۆ ئەوەی "مەزەندەکان"ت کارزانانەتر بن:

–ئەگەر دوو وەڵام وەکویەك دیار بن، هیچیان هەڵمەبژێرە.

–لەوانەیە "روونترین" وەڵام بۆ پرسیارێکی قورس، هەڵە بێت، بەڵام وەڵامێك کە لێیەوە نزیکە راست بێت.

–ئەگەر ئەو وەڵامانەی کە بۆ پرسیارێکی ماتماتیکی جێ دەهێڵرێن پانتاییەکی فراوان بگرنەوە، ژمارە دوور و نزیکەکان لابە و ژمارەیەك لە ناوەراستدا هەڵبژێرە.

–ئەگەر دوو بڕ زۆر نزیك بن، یەکێکیان هەڵبژێرە.

–ئەگەر دوو ژمارە تەنیا بە خاڵێکی دەیی جیاواز بن (و ئەوانیتر نزیك نەبن)، یەکێکیان هەڵبژێرە. (بۆ نموونە: ١٥،٦،١,٥،٤٠،٢,٣ من خۆم ١,٥ یان ١٥م هەڵدەبژارد ئەگەر لانی کەم لە پرسیارەکەوە بمزانیایە کە دەبێ خاڵە دەییەکە بۆ کوێ بچێت).

–ئەگەر دوو وەڵام بۆ پرسیارێکی ماتماتیکی لە یەکبچن– چ ئەوەی هاوکێشە بن یان شێوە– یەکێکیان هەڵبژێرە.

بیرت بێت: ئەمە ڕێگایەك نییە بۆ زۆر باش بوون لە تاقیکردنەوەیەك– ئەمانە تەنیا ڕێگای (تاقیکراوە و راست)ن بۆ زیادکردنی هێزی مەزەندەکردنت کاتێك هیچی ترت لەبەردەستدا نەبێ.

ئایا دەبێ قەت مەزەندەیەك بگۆڕیت؟

یەکەم مەزەندەت چەنێك راست بوو؟ لەوانەیە زۆر باش بووبێت (بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە هەر لە سەرەتاوە بنەمایەکت هەبووە بۆ مەزەندەکردن). بۆیە تەنیا ئەو کاتە باشە بیگۆڕیت کە:

–ئەمە تەنیا مەزەندەیەکی لەپڕ بوو و پاش بیرکردنەوەی قووڵتر گەیشتیتە ئەو ئەنجامەی کە مەزەندەی دواترت، لانی کەم، ئەوەندە لەناکاو نەبووە.

–تۆ شتێکت بیر هاتووەتەوە کە ئەگەرەکانی مەزەندەکەتی بە تەواوی گۆڕیووە (یان وەڵامی پرسیارێکی دواتر یارمەتیدەر بووە وەڵامی ئەمەیان بزانیت!)

- پرسیارێکی ماتماتیکت خراپ قەبڵاندووە.

-پرسیارەکەت باش نەخوێندووەتەوە و تێبینی شتێکی وەکو "نابێ"، "هەمیشە" یان بڕگەی ڕێزمانیی گرنگی ترت نەکردووە.

ئەی ئەگەر چوار یان پێنج وەڵام لاببەیت و بگەیتە ئەو بڕوایەی کە ئەوەی ماوە- ئەو وەڵامە ڕاستەیە کە بۆی چوویت- بە تەواوی هەڵەیە؟ لایببە و جارێکی تر شیکردنەوەکەت بە چوار وەڵامەکەی تر دەست پێبکەوە.

ئەگەر تۆ مەزندەیەکت لەسەر ئەو جۆرە پرسیارانە ئەنجامدا و پێشبینی ئەوەت کرد کە پەڕەی تاقیکردنەوەکەت دەدرێتەوە دەست، خاڵێکی بچوک یان هەر ڕەمزێکی تر لە تەنیشتییەوە دابنێ. ئەم شێوەیە تۆ دەتوانیت ئەوە هەڵسەنگێنیت کە مەزندەکەت چەنێك سەرکەوتوو بووە.

ئەگەر لە ماوەی تاقیکردنەوەیەکدا کات هەبوو بۆ گەڕانەوە بۆ پرسیارەکان و جارێکی تر بیرکردنەوە لێیان، بەرەوپێش بڕۆ و ئەو وەڵامانە لاببە کە دەزانیت ڕاست نین. ئەمە کاتت بۆ دەگەڕێنێتەوە. تۆ ئەو وەڵامانە فەرامۆش دەکەیت کە لاتبردوون و تەرکیز دەخەیتەسەر ئەوانەی کە دەمێننەوە. خاڵێکی بچوك، بەڵام لەوانەیە ئەمە بۆ هەر پرسیارێك چەند چرکەیەکت لێ بگرێت.

کاتێك تۆ پێت وایە تێکڕای بەشێکت تەواو کردووە، دووجار چێکی بکەوە بۆ دڵنیا بوونەوە لەوەی کە بە ڕاستی تەواوت کردووە. سەیری وەڵامەکانت یان ئەسئیلەکەت بکە بۆ دڵنیا بوونەوەی لەوەی کە هەموویان وەڵام دراونەتەوە.

تۆ دوای ڕێنماییەکان دەکەویت!

ڕێنماییەکان بخوێنەرەوە و لێیان تێبگە. ئەگەر قەرار وایە کە هەر وەڵامێکی ڕاست بۆ هەر پرسیارێك لە تاقیکردنەوەی فرەهەڵبژاردندا چێك بکەیت- و تۆ وایدادەنێیت کە تاکە وەڵامێك بۆ هەر پرسیارێك ڕاستە- ئەوا بڕێکی زۆری وەڵام لەدەست دەدەیت!

ئەگەر تۆ لە دوو یان سێ پرسیاری وتار، یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەوا تەقریبەن بە دڵنیاییەوە کاتت تەواو دەبێ ئەگەر هەوڵ بدەیت دانە بە دانە وەڵامیان بدەیتەوە. تەنانەت ئەگەرچی هەر پێنجیان تەواو بکەیت، لەوانەیە مامۆستا تەنیا نمرە لەسەر دووانی یەکەم دابنێ. لەبەرئەوەی

کاتێکی زۆرت بۆ سێ دانەکەی تر داناوە، ئەوا زۆر جێگەی گومانە کە یەکەم دوو وەڵامت ئەوەندە چڕوپڕ و جوان بن کە نمرەیەکی باش بەدەست بێنیت.

ئەگەر فاکت یان هاوکێشەی پەیوەندیدار هەبن کە ترسی ئەوەت هەبێ لەبیرت بچنەوە، لە شوێنێکی ئەسئیلەکەت بیاننووسە پێش ئەوەی هەر شتێکی تر بکەیت. ئەمە کاتی زۆر ناگرێت و دەشێ لە هەندێ نیشانەی بیرهاتنەوەی جددی دەربازت بکات.

لە ڕێگاکەتدا بەرەو دەرەوە، سەرنجی کێ رادەکێشیت؟

لە کۆتاییدا کات بەجێ بێڵە بۆ چێك کردنەوەی وەڵامەکانت و مەیکە بە خوو کە تاقیکردنەوەکان زوو جێ بێڵیت. شتێك کەم هەیە لەوە بەدەستی بێنیت کە وادادەنرێ سەرنجراکێشانی مامۆستا و خوێندکارانی ترە لەبەرانبەر ئەوەی کە تۆ چەندە (پێت وایە) زیرەکیت بەوەی کە یەکەم کەس لە ژووری تاقیکردنەوە دێیتە دەرەوە. کات دابنێ بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە ئەوپەڕی هەوڵی خۆتت داوە. ئەگەر تۆ بەتەواوی ڕەزامەند بیت بە وەڵامەکانت بۆ هەموو پرسیارەکان، ئاساییە بڕۆیت، تەنانەت ئەگەرچی یەکەم کەسیش بیت. بەڵام بە گشتی، خاوبوونەوە یارمەتیت دەدات تا خۆت لە هەڵەی بێباکانە بەدوور بگریت.

بەهەمان شێوە، نیگەرانی ئەوە مەبە کە ئەوانیتر چی دەکەن. ئەگەرچی دوایین کەسێك بیت کە دەڕۆیت، کێ باکی پێیەتی؟ دەشێ ئەوانیتر ڕاسب بن، گرنگ نییە چەندە زوو و بە بڕوا بەخۆییەوە دەرپەڕیوونەتە دەرەوە! بۆیە هەموو ئەو کاتە تەرخان بکە کە پێویستتە و ئەوەندەی دەکرێ باش هەوڵ بدە.

١٦ ڕێنمایی بۆ سەرکەوتووبوون لە تاقیکردنەوە فرەهەڵبژاردنەکاندا

١.پرسیارەکە بە تەواوی بخوێنەرەوە پێش ئەوەی سەیری هیچ وەڵامێك بکەیت. وەڵامی خۆت فەراهەم بکە پێش ئەوەی هیچ کام لە بژارەکان بپشکنیت.

٢.وریابە لەوەی کە پرسیارەکان زۆر نەخوێنیتەوە. هەوڵ مەدە سەرکۆنەی ئامادەکەر بکەیت و سۆراخی ئەو ڕێسا و فێڵانە بکەیت کە بوونیان نییە.

٣.لە پارچەیەکی خوێندنەوەدا هێڵ بە ژێر وشە سەرەکییەکاندا بێنە.

٤.بژارەیەکی پۆزەتیڤ ئەگەری زیاترە کە ڕاست بێت نەك نێگەتیڤەکە.

٥.لەدژی یەکەم پاڵنەرت مەوەستەوە مەگەر ئەوەی کە دڵنیا بیت کە هەڵەیت.

٦.سۆراخی ئەو نێگەتیڤ و وشانەی تر بکە کە بۆ فریودانت دانراون. ("کام لەمانە خوارەوە یەکێك نین لە....").

٧.وەلامەکە بە زۆری (هەڵە)یە ئەگەر "هەموو"، "هەمیشە"، "هەرگیز" یان "هیچیان" بگرێتەخۆ. دووبارەی دەکەمەوە، بە زۆری وایە.

٨.وەلامەکە چانسێکی گەورەی (راست)بوونی تێدایە ئەگەر "هەندێ جار"، "لەوانەیە" یان "هەندێ"ی تیا بێت.

٩.کاتێك تۆ وەلامە راستەکە نازانیت، بۆ وەلامە هەڵەکان بگەڕێ.

١٠.وەلامێك لامەبە مەگەر ئەوەی کە بە راستی بزانیت هەر وشەیەك چ مانایەك دەگەیەنێت.

١١.سۆراخی رێکخستنی وەلامەکان مەکە. تەنیا لەبەرئەوەی بژارەی "C" سێ جار بەدوای یەکدا دەرکەوتووە بەو مانایە نییە کە "C" وەلامی راست نییە بۆ پرسیاری چوارەمیان. متمانە بە زانینی خۆت بکە.

١٢.هەر وەلامێك بخوێنەرەوە بەر لەوەی دانەیەکیان هەڵبژێریت. تاقیکردنەوە دانەرێکی لێهاتوو وەلامێکی ساختە دادەنێت کە تەقریبەن راستە، فریوت دەدات تەنانەت بەر لەوەی بژارەکانی تر لەبەرچاو بگریت.

١٣.لە تاقیکردنەوەیەکی بەستاندارکراودا، دڵنیا بەرەوە کە هەر وەلامێك لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دادەنێیت.

١٤.زۆرجار درێژترینو/یان ئاڵۆزترین وەلام بۆ پرسیارێك راستە– تاقیکردنەوە دانەرەکە ناچار بووە گرێ و دەستەواژەی شیاو دابنێ بۆئەوەی وابکات وەلامەکە تەواو و رۆشن بێ.

١٥.لەو بژارانە بەگومان بە کە پێدەچێ بۆ منالێکی دوو ساڵیش روون بن. بۆچی مامۆستا شتێکی وەها ئاسانت دەخاتە بەردەم؟ لەوانەیە ئەمە نەکات، ئەو فێڵبازە!

١٦.دەستبەرداری پرسیارێك مەبە کە، پاش خوێندنەوە، بێ رادە سەرلێشێوێنەر و قورس دیارە. دەشێ تەماشاکردنی لە گۆشەنیگایەکی ترەوە، دارشتنەوەی بە وشەکانی خۆت، یان کێشانی وێنەیەك یارمەتیت بدات تا دواجار لێی تێبگەیت.

**ستراتیژیی فرەهەڵبژاردن**

سێ رێگا هەن بۆ چالاکانە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی فرەهەڵبژاردن:

١.لە یەکەم پرسیارەوە دەست پێبکە و بەردەوام بە، پرسیار بە پرسیار، تاوەکو دەگەیتە کۆتایی، قەت پرسیارێك جێ مەهێڵە تا ئەو کاتەی کە یان بە تەواوی وەڵامت داوەتەوە یان مەزندەیەکی لێزانانەت کردووە.

٢. سەرەتا هەموو پرسیارێکی ئاسان وەڵام بدەرەوە- ئەوانەی کە دەزانیت بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەك دەتوانیت وەڵامیان بدەیتەوە یان ئەوانەی کە پێویستیان بە سادەترین خەملاندن هەیە- پاشان بگەڕێرەوە سەر قورسترینەکان.

٣.یەکەم جار "قورسترین" پرسیارەکان وەڵام بدەرەوە، پاشان بگەڕێرەوە سەر ئاسانەکان.

هیچ کام لەو سێ بژارانە لەخۆیاندا راست یان هەڵە نین. لەوانەیە هەریەکەیان بۆ کەسێکی جیاواز کەڵکی هەبێ. (و من پێم وایە کە ئەو سێ شێوازە هەموویان لە سیاقی رێکخستنی تاقیکردنەوەکەدا هەن. لەوانەیە ئەو بەشانەی نمرەی زۆریان لەسەرە کاریگەرییەکی زۆر لەسەر ستراتیژییەکەت دابنێن).

یەکەم شێواز، بە یەك مانا، خێراترینە، لەوەدا کە هیچ کات بەفێڕۆ نادرێت بە خوێندنەوەی تەواوی تاقیکردنەوەکە لە هەوڵدان بۆ دیاریکردنی ئاسانترین یان قورسترین پرسیارەکان. بە گریمانەکردنی ئەمەی کە تۆ رێگە بە خۆت نادەیت تاکە پرسیارێك گیرت بکات بۆئەوەی بڕێکی زیادەی کاتی پێوە خەریك بکەیت، لەوانەیە ئەمە ئەو شێوازە بێت کە زۆربەتان بەکاریدەهێنن.

دووەم شێواز زامنی ئەوە دەکات کە وەڵامە راستەکانت زیاد بکەیت- یەکەمجار ئەو وەڵامانە دەنووسیت کە دڵنیایت لێیان. هەروەها لەوانەیە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەی کە تۆ ئەمانە تا رادەیەك خێرا ئەم ئاسانانە وەڵام دەدەیتەوە، زۆرترین کاتت پێ بدەن بۆ ئیشکردن لەسەر ئەوانەی کە پێت وایە بەشێوەیەکی دیاریکراو سەر لێ شێوێنەرن.

زۆرێك لە شارەزایان پێشنیاری ئەم شێوازە دەکەن چونکە جەخت دەکەنەوە لەوەی کە وەڵامدانەوەی پرسیارگەلێکی زۆر یەك لەدوای یەك، بڕوابەخۆبوونی راستەوخۆت پێدەدات بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو پرسیارانەی لێیان دڵنیا نیت. ئەگەر بۆت دەرکەوت کە کۆکیت لەگەڵیدا، کەواتە بەهەموو شێوەیەك ئەم ستراتیژییە بەکاربێنە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەشێ تەنیا تێبینیی ئاسانەکان بکەیت لەکاتێکدا کە خوێندنەوەیەکی پێشینە بۆ تاقیکردنەوەکە دەکەیت. ئەمە کاتێکی کەمتر دەگرێت و بەلای منەوە، هەمان "تەکانی بڕوابەخۆبوون" دەدات.

دوایین شێواز له‌ راستیدا ئه‌وه‌یانه‌ كه‌ من به‌كارم هێناوه‌. له‌ راستیدا، من ئه‌وه‌م كردووه‌ به‌ خاڵێك كه‌ یه‌كه‌م جار پرسیاره‌ هه‌ره‌ قورسه‌كان حه‌ل بكه‌یت، پاشان به‌ په‌یژه‌ی قورسیدا بچیته‌ "خواره‌وه‌". (كه‌ به‌و مانایه‌یه‌ من به‌ ئاراسته‌ی دواوه‌ ئیشم كردووه‌، چونكه‌ زۆرێك له‌ دانه‌رانی تاقیكردنه‌وه‌ و مامۆستایان په‌یتا په‌یتا زیاتر تاقیكردنه‌وه‌كانیان قورس ده‌كه‌ن).

له‌وانه‌یه‌ به‌لای تۆوه‌ سه‌یر دیار بێت، بۆیه‌ با ده‌روونناسییه‌كه‌ت بۆ روون بكه‌مه‌وه‌. من بۆم ده‌ركه‌وت كه‌ ئه‌گه‌ر فشاری كات له‌ كۆتایی تاقیكردنه‌وه‌كه‌دا په‌یتا په‌یتا بمگاتێ، ئه‌وا زیاتر له‌ پێگه‌یه‌كدا ده‌بم بۆ وه‌لامدانه‌وه‌ی ئاسانترین پرسیاره‌كان– و برێكی زۆریان– له‌ كورتترین كاتی ماوه‌دا، نه‌ك ئه‌وانه‌ی كه‌ به‌ راستی ده‌بێ زۆر بیریان لێ بكه‌مه‌وه‌. دواجار، به‌ هاتنی كۆتایی تاقیكردنه‌وه‌كه‌، هۆشم وه‌كو كاتی سه‌ره‌تا ئیشی نه‌ده‌كرد.

ئه‌مه‌ سوودی گه‌وره‌ی شێوازی سێیه‌مه‌: كاتێك به‌ زۆرترین شێوه‌ "بێدار"، چالاك و به‌ئاگابووم، ده‌ست و په‌نجه‌م له‌گه‌ڵ ئه‌و پرسیارانه‌دا نه‌رم كرد كه‌ زۆرترین شیكردنه‌وه‌، بیركردنه‌وه‌ و لێكدانه‌وه‌یان پێویست بوو. كاتێك به‌زۆرترین ئاست بێتاقه‌ت بووم– نزیكی كۆتایی– وه‌لامی ئه‌و پرسیارانه‌م ده‌دایه‌وه‌ كه‌ ته‌قریبه‌ن "به‌سه‌ری زمان ده‌خوران".

له‌هه‌مان كاتدا، ته‌كانێكی بڕوابه‌خۆبوونی راسته‌قینه‌شم به‌ خۆم ده‌به‌خشی. هه‌ركه‌ یه‌كه‌م پرسیاری قورسم ته‌واو ده‌كرد، ده‌ستبه‌جێ حاڵم باشتر ده‌بوو. كاتێك هه‌موو قورسه‌كانم ته‌واو ده‌كرد، هه‌موو شتێك به‌ره‌و لێژی ده‌چوو.

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، من هه‌میشه‌ هه‌وڵ ده‌ده‌م بایی پێویست كات دابین بكه‌م بۆئه‌وه‌ی لانی كه‌م بۆ هه‌ر پرسیارێك وه‌لامێك دابنێم. باشتره‌ پرسیارێكت هه‌ڵه‌ بێ و سێ وه‌لامه‌كه‌ی تر ته‌واو بكه‌یت نه‌ك یه‌كێكت راست بێت و سێ بۆشایی جێ بێڵیت. ئه‌مه‌ شێوازێك نییه‌ بۆ هه‌موان ده‌ست بدات، به‌لام له‌وانه‌یه‌ بۆ تۆ گونجاو بێت.

مه‌كه‌وه‌ره‌ ناو "سه‌رگێژه‌ی وه‌لام"، واته‌ ئه‌و سه‌رنجدانه‌ بێ ئاكامه‌ی كه‌ هه‌ندێ له‌ خوێندكاران هه‌یانه‌ كاتێك ناتوانن بیر له‌ وه‌لامێك بكه‌نه‌وه‌– بۆ ١٠ خوله‌ك. شتێك بكه‌. باشتره‌ به‌رده‌وام بیت و ئه‌و پرسیاره‌ت هه‌ڵه‌ بێت نه‌ك كاتی به‌ نرخ به‌ نه‌كردنی هیچه‌وه‌ به‌ فیڕۆ بده‌یت.

**هەموو یان هیچ؟**

هەندێ لە مامۆستایان کەوتوونەتە داوی خۆشەویستیی "هەموو ئەوانەی سەرەوە" و "هیچ کام لەوانەی سەرەوە". ناتوانیت یەکێك لە تاقیکردنەوەکانیان ئەنجام بدەیت بەبێ دووبارەبوونەوەی ئەو دەستەواژانە لە یەکێك لە پرسیارەکاندا.

"هەموو ئەوانەی سەرەوە" بە زۆری وەڵامی راستە ئەگەر یەکێك بێت لە بژارەکان. ئومێدەوار بە کە وەکو وەڵامێکی بەهێز بۆ هەر پرسیارێك ببینیت لەبەرئەوەی چانسی باشترت دەداتێ بۆ باشتربوون لە تاقیکردنەوەدا نەك ئەمەی لێهاتوویی لە ماددەکەدا (یان نەبوونی) ئەمەت بۆ زامن بکات. بۆچی؟ چونکە پێویست ناکات بە راستی دڵنیا بیت کە "هەموو ئەوانەی سەرەوە" راستە بۆئەوەی هەڵیبژێریت. هەموو ئەوەی کە پێویستە ببیت، "تەواو" دڵنیابوونە لەوەی کە دوو وەڵام راستن (و بەهەمان شێوە دڵنیابیت کە ئەوانەیتر مەرج نییە هەڵە بن). تا ئەو کاتەی کە بڕوات وایە کە لە وەڵامێکی راست زیاتر هەیە، ئەوا پێویستە "هەموو ئەوانەی سەرەوە" بژارەی راست بن.

بەهەمان شێوە، پێویست ناکات قەناعەتت وابێ کە "هیچ لەوانەی سەرەوە" وەڵامی راستە، تەنیا بەشێوەیەکی مەعقول دڵنیابە لەوەی کە هیچ کام لە وەڵامەکانی تر بەشێوەیەکی رەها راست نین.

**پرسیارەکانی ریدینگ**

ئەمە بەشێکی تاقیکردنەوەیە کە تیایدا وتارێکی کورت بەدی دەکەیت کە ژمارەیەك پرسیاری بەدوادا ێن. وادادەنرێ کە تۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە لە وتارەکەدا بدۆزیتەوە. بە پێچەوانەی پرسیارمکانی فرەهەڵبژاردنەوە، کە تیایدا وەڵامەکە بە راستی لەبەردەمتدایە، لەوانەیە وەڵامەکانی وتارەکە لە شێوەیەك لە شێوەکاندا تا رادەیەکی زۆر شاراوە بن.

ئەمەش ئەو شێوازەی کە من بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی لەو بابەتە پێشنیاری دەکەم:

١.پرسیارەکان بخوێنەرەوە پێش ئەوەی پارچەکە بخوێنیتەوە. ئەمانە هۆشیارت دەکەنەوە لەوەی کە بەدوای چیدا دەگەڕێیت و کاردەکەنە سەر شێوازی خوێندنەوەی پارچەکەت. ئەگەر

داوای بەروارەکان کرابێت، هەموو بەروارەکانی ناو پارچەکە بازنە بەدەوردا بێنە کاتێک دەخوێنیتەوە. ئەگەر سۆراخی فاکتەکان دەکەیت نەک ئەنجامگیری، جارێکی تر شێوازی خوێندنەوەت بگۆڕە.

٢.کاتێك یەکەم جار پرسیارەکە دەخوێنیتەوە، پێش ئەوەی بڕوانیتە وەڵامەکان، بڕیار بدە لەوەی کە "پێت وایە" وەڵامەکە چییە. ئەگەر وەڵامەکەت یەکێکە لە بژارەکان، قەپاتی!

٣.ئەگەر وەڵامی دروست بەلاتەوە روون نییە، بە هێواشی وتارەکە بخوێنەرەوە، ئەو پرسیارانەی تازە خوێندووتنەوە لە مێشکتدا بهێڵەرەوە. زۆر هێڵ بە ژێر دێڕەکاندا مەهێنە، بەڵکو هێڵ بە ژێر ئەو ئامرازی بەیەکگەیاندنانەدا بێنە کە ئاراستەی رستەکە دەگۆڕن: "لەگەڵ ئەوەشدا"، "هەرچەندە"، "هەرچۆنێك بێ" و هیتر. بەهۆی ئەم وەرچەرخانەوە، چانسێکی باش هەیە کە ئەم رستەیە لە یەکێك لە پرسیارەکاندا هەبێ.

بۆ نموونە: "جۆن سمیس لەو جۆرە نووسەرانە بوو کە نووسینی لە چاککردنی پێباشتر بوو، (لەکاتێکدا) کە لۆیسی ژنی ئەوەی دووەمیانی لەوەی یەکەم پێ باشتر بوو" دەشێ وەڵام بۆ پرسیارەکە دابین بکات: "ئایا لۆیس سمیس نووسینی پێ باشتر بوو یان چاککردن؟" سەرنجێکی بێباکانە لە تێکستەکە وات لێدەکات "نووسین" وەکو وەڵام هەڵبژێریت.

٤.جارێکی تر پرسیارەکان بخوێنەرەوە. پاشان بچۆرە خوارەوە و سەرەوە، بۆ دۆزینەوەی وەڵامی یەکەم پرسیار، دووەکیان و هیتر. پرسیار مەپەڕێنە مەگەر ئەوەی کە یەکەم پرسیار تەگەرەیەکی گەورە بێت. گەر زۆر باز بدەیت، جارێکی تر سەرت لێدەشێوێت و هیچ کام لە پرسیارەکان بە تەواوی و تەنانەت بە راستی وەڵام نادەیتەوە.

ئەگەرەکانی ٥٠–٥٠ خراپ نین. راستە یان هەڵەیە؟

دەتووانی چی بکەیت بۆ زیادکردنی نمرەکانت لە تاقیکردنەوەکانی راست/هەڵە دا؟ زیاتر ئارەزوومەندی مەزەندەکردن بە ئەگەر پێویست بکات. دواجار، هانمدایت کە لە تاقیکردنەوەی فرەهەڵبژاردندا مەزندە بەکاربێنیت ئەگەر توانیت بایی پێویست وەڵامی هەڵە لاببەیت کە بگەیتە دووان، کە یەکێکیان راستە. باشە، ئێستا تۆ لەوێیت! کەواتە مەگەر ئەوەی لەبەرانبەر مەزەندەکردندا سزا بدرێیت، دەنا مەزندەی خۆت بکە! تەنانەت ئەگەرچی سزاش بدرێیت، دەشێ بتەوێ هەوڵێك بدەیت ئەگەر لاوازترین سەرەداوت لە وەڵامی راست لابێت.

لــه راســتیدا، ئەگــەرەکانی تــۆ زۆرجــار باشــترن لــه ٥٠-٥٠. زۆربــەی ئامادەکــارانی تاقیکردنەوەکان دەستەواژەی "راست"ی زیاتر لە هەڵە دادەنێن. کەواتــه ئەگــەر تــۆ بــه راســتی هــیچ رێگایــەکت نییــه بــۆ دیــاریکردنی رااســتیی دەســتەواژەیەك، وایــدابنێ کــه راســتە. ئەگــەر وردەکارییــەکی دیــاریکراو لــه دەســتەواژەکەدا هــەبێ- "٢٠٦ ئێــسك لــه جەســتەی مرۆڤــی پێگەیشتوودا هەیە"- بەهەمان شێوە دەشێ راست بێت.

بیرت بێ: بۆئەوەی دەستەواژەیەك راست بێت، دەبێ هەر بەشێك لە بەشەکانی راســت بێــت. وریابــه لــەو دەســتەواژانەی کــه چــەند بەشــێکیان راســتن (یــان لانــی کــەم دەشــێ راســت بــن)، بەشێوەیەکی بەیەکەوە گرێدراون کە دەستەواژەکە وەکو گشتێك هەڵە دەردەچێت. بۆ نموونــه: "لەبەرئەوەی زۆرێك لە باڵندەکان دەتووانن بفڕن، بەرد بەکاردێنن بۆ وردکردنی خۆراکەکەیان". زۆرێك لە باڵندەکان دەتووانن بفڕن و باڵندەکان بەرد قــوت دەدەن بــۆ ورکردنــی خۆراکەکــەیان، بــەڵام پەیوەندییــەکی ڕەمــەکی (وشــەی "لەبەرئــەوەی") لــەنێوان ئــەو دوو گرێیــەدا، تــەواوی دەستەواژەکە دەکاتە هەڵە.

لە تاقیکردنەوەیەکی راست/هەڵــەدا چــەندەی دەســتەواژەیەك درێــژتر و/ یــان ئــاڵۆزتر بێــت، ئەوەندە ئەگەری کەمترە کە راست بێت، چونکە پێویستە هــەر گرێیــەکی دەســتەواژەکە راســت بێت (و چانسی یەکجار زۆر هەن بۆئەوەی تاکە بەشێکی، هەڵە بێت).

لــه دەبــڵ نێگەتیڤــەکان وریابــه: ئەگــەر دەســتەواژەیەك بانگەشــەی ئــەوە بکــات کــه شــتێك "نەشیاو نییە" لە راستیدا مەبەستی ئەوەیە کە شیاوە.

ژمارەیەکی کەمی دەستەواژە گشتییەکان بــەبێ جیــاوازی راســتن. بۆیــه هەمیــشه ئاگاداربــه کاتێــك وشــەکانی "هــەموو"، "هەمیــشه"، "هــیچ"، "هــەرگیز"، "هــەمووان"، "باشــترین"، "هیچیان"، "کەس" یان وشەی رەهای تر دەبینیت. ئەگەر بتووانیــت بــیر لــه تاکــه نموونەیــەك بکەیتــەوە کــە بیــسەلمێنێت دەســتەواژەیەکی وەهــا هەڵەیــە، کەواتــه هەڵەیــه. بــەڵام بزانــه: دەستەواژە هەن ئەو وشە رەهایانەیان تێدایە کە راستن، بەڵام دەگمەنن. "هەموو ســەرۆکەکانی ئەمریکا(و/یان جێگر سەرۆکەکان) پیاو بوون" بە داخەوە بە تەواوی راستە.

بەهــەمان شــێوە، وشــەی وەکــو "هەنــدێ جــار"، "زۆرجــار"، "زوو زوو"، "بــه گــشتی"، "زۆرجــار"، "بەشــی زۆری"، "دەشــێ"، "لەوانەیــە" و "بەشــێوەیەکی ئاســایی" بانگەشــەی راشکاوانەتر دەخەنەڕوو و زۆرجار دەستەواژەی "راست" دەردەخەن.

ڕێنمایی ستراتیژی: بۆ مامۆستا ئاسانترە شتێك دابنێ کە دەستەواژەیەك بکاتە هەڵە نەك بە پێچەوانەوە. کەوایە کاتێك دەیخوێنیتەوە، بۆ هەر شتێك بڕوانە کە تەواوی دەستەواژەکە دەکاتە هەڵە. ئەگەر نەتوانیت بیدۆزیتەوە، وایدابنێ ڕاستە.

لێهاتوویی پەیداکردن لە ماتماتیکی فرەهەڵبژاردن

ئەگەر تۆ بتوانیت خۆت بە دوور بگریت لە حسابات، ئەوا کاتت بۆ دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە، وەڵامی ئەو پرسیارەی خوارەوە بزانە بەبێ ئەویە بە ڕاستی حساباتی بۆ بکەیت:

=٢٤٣×٢٨١

٥٣,٧٦٢(A)

١١٣,٤٢٨(B)

٦٧,٢٨٣(C)

٤٨٩,٥٩٣(D)

بە جێبەجێکردنی تاکە کردارێك، دەتوانیت دووان لە وەڵامە ئەگەرییەکان لاببەیت. دوایین ژمارەی هەریەك لە ژمارەکان لێکبدە (١×٣). دەبێ وەڵامەکە بە ٣ کۆتایی بێت. کەواتە (A) و (B) لابران...هەروا خێرا!

. ئێستا لە (C) و (D) چاو بگێڕە. دەتوانیت وەڵامی ڕاست بە خێرایی بدۆزیتەوە؟ لێرەدا تۆ مەزەندەیەکی کارزانانە ئەنجام دەدەیت. سەیرکە: ١٠٠×٢٨١ دەکاتە ٢٨,١٠٠. دەبێ تۆ بتوانیت ئەمە بەبێ هیچ ئامێرێك بکەیت. بۆیە دەبێ (D) هەڵە بێت. ئەوەی کە بۆت دەمێنێتەوە (C)یە.

ئایا دەبێ حساباتێکی ڕاستەقینە ئەنجام بدەیت بۆئەوەی جارێکی تر چێکی وەڵامەکەت بکەیتەوە؟ من بووماپە نەخێر. تۆ دڵنیایت کە (A) و (B) هەڵەن. بێگومان. دەزانیت کە (D) زۆر دوور دەڕوات. (C) وەکو وەڵام دیاری بکە و بەردەوام بە.

ئەمانەی خوارەوەش هەندێ ڕێگان بۆئەوەی نمرەکەت لە تاقیکردنەوەی ماتماتیکدا باشتر بکەیت:

—هەوڵ بدە بزانیت پرسیار لە چی دەکرێت، کام قاعیدانە پەیوەندیدارن، چ زانیارییەك گرنگە و چی گرنگ نییە. مەهێڵە داتای ناپەیوەندیدار سەرت لێ بشێوێنێت. دڵنیا بەرەوە

لەوەی کە دەزانیت بەدوای چ جۆرە وەڵامێکەوەیت: ئایا خێراییە، کێشە، گۆشەیە، ڕەگی دووجایە؟

—هەرکاتێك دەتوانیت، هاوکێشەکان و ژمارەکان "تەرجەمە" بکە بۆ وشە. وەڵامەکە بخەملێنە بەر لەوەی تەنانەت حساباتی ڕاستەقینە دەست پێبکەیت. تۆ لانی کەم قەبارەی ئەو گۆڕەپانە دەزانیت کە یاری تۆپی پێی تیادا دەکەیت!

—ئەگەرچی تۆ بایی پێویست کەسێکی پەیوەست بە بینایی نەبیت، زۆرجار وێنەکان یارمەتیدەرن. هەوڵ بدە پرسیارێکی ماتماتیکی سەرلێشێوێنەر تەرجەمە بکەیت بۆ دایاگرام یان هێڵکارییەك.

—یاریی پێبکە. زۆرجار ڕێگای جیاواز هەن بۆ شیکارێك، یان تەنانەت هەمان حەلی ڕاست.

—کاتێك تۆ چێکی خەملاندنەکانت دەکەیت، هەوڵ بدە بە ئاراستەی بەرەو دواوە ئیش بکەیت. من بەلامەوە ڕێگایەکی ئاسانتر بوو کە خەلەلە حسابییەکان بەدی بکەم.

—هەوڵ بدە هەموو خەملاندنەکانت بنووسیت— بە ڕێك و پێکی. ئەگەری کەمترە کە هەڵە بکەیت ئەگەر کات تەرخان بکەیت و ئەگەر هەڵەیەك بکەیت، بەدیکردنی ئاسانتر دەبێت.

—هەر هەنگاو و هاوکێشەیەك پیشان بدە، تەنانەت ئەگەرچی جار جارە کەمێکیان نانووسیت. ئەگەر تۆ هەموو قاعیدە و هاوکێشەکان بزانیت بەڵام هەر لەسەرەتای شیکردنەوەکەت خراپ حساباتت کرد، بەرەو ئەوە نابیت کە بگەیتە وەڵامی ڕاست. بەڵام زۆرێك لە مامۆستایانی بەئەزموونی ماتماتیك کەم هەڵەت لێدەگرن ئەگەر بتوانن بە ڕوونی ئەوە ببینن کە تۆ شتەکانت زانیووە و هەموو شتێکت بە ڕاستی بەجێگەیاندووە، بەدەر لە پەنجەنان بە دوگمەی دروستی حاسیبەکەت.

—ئەگەر حاسبەش بەکاردێنیت، دەستبەجێ جارێکی تر چێکی وەڵامەکەت بکەرەوە. ئەگەرەکانی پەنجە دانان لەسەر ژمارەیەکی هەڵە زۆرە، ئەگەرەکانی پەنجەنان بە هەمان ژمارەی هەڵە بۆ جاری دووەم، وەها نییە.

### شتێك نییە بە ناوی تاقیکردنەوەی "ئاسان"

هەندێ کەس پێیان وایە کە تاقیکردنەوەکانی "کتێبی کراوە" لە هەموویان ئاسانترە. ئەوان نزای بۆ دەکەن...لانی کەم تا ئەو کاتەی کە یەکەم تاقیکردنەوەی وەها دەبینن.

ئەمانە لە هەموو تاقیکردنەوەکانی تر قورستترن، ئەگەرچی تەنیا لەبەر ئەوەش بێت کە تەنانەت مامۆستا "رۆح سووك"ەکانیش هەست بە گوناه نەکەن لە قورسکردنی ئەو تاقیکردنەوانە تاوەکو ئاستی ئەفسەرێکی وانەبێژی مارینز. قیرۆسیا، دەتووانی کتێبەکەت بەکاربێنی! ئەمە وەکو ئەوەیە قۆپییەکی یاساییت کەوتبێتە بەردەست، وایە؟ خراپتر لەوە، زۆرێك لە تاقیکردنەوەکانی کتێبی کراوە بەهەمان شێوە بردنەوەی تاقیکردنەوەن بۆ ماڵەوە، بەو مانایەی کە تۆ دەتوانیت تێبینییەکانت (و هەر کتێبێك یان ئامرازێکی تر کە بە خەیاڵتدا دێت) بەکار بێنیت.

لەبەرئەوەی دەبێت تۆ پێشبینی ئەوە بکەیت کە پرسیار سووك لەئارادا نییە، گرنگ نییە چەندە باش لە ماددەکە دەزانیت، دەبێت هەندێ ئامادەکاری بکەیت بەر لەوەی کە رووبەرووی جۆرێکی وەها لە تاقیکردنەوە بیتەوە.

–لاپەرە گرنگەکان نیشانە بکە لە رێگەی نوشتاندنەوەی سوچەکانیانەوە، یان هەر شێوازێکی تر بەکاربێنە بۆ ئەوەی بتوانیت دەستبەجێ بچیتەوە سەر خشتە، پوختە یان شەرحە گرنگەکان.

–پاشکۆیەکی ئەو لاپەڕانە ئامادە بکە کە رەفزت کردوون بۆئەوەی بزانیت دەستبەجێ سەیری کوێ بکەیت بۆ خشتە، هێڵکاری یان هەر شتێکی دیاریکراوی تر.

–هەموو فاکت، هاوکێشە و هیتری گرنگ لەسەر لاپەڕەیەکی جیا پوخت بکەرەوە.

–ئەگەر تۆ بەهەمان شێوە رێگەت پێدراوە تێبینییەکانت لەگەڵ خۆتدا بێنیت یان ئەگەر بردنەوەی تاقیکردنەوەیە بۆ ماڵەوە، پاشکۆیەکی پوخت لە تێبینییەکانت ئامادە بکە (تەنیا سەرەبابەتە گشتییەکان) بۆئەوەی بزانیت لەکوێ زانیاریی پەیوەندیدار بدۆزیتەوە.

یەکەم جار وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەرەوە کە تۆ پێویستت بە تێکستەکەت نییە بۆیان. پاشان ئیش لەسەر ئەو پرسیارانە بکە کە دەبێ بە تەواوی پشت بە کتێبەکەت ببەستی بۆیان.

وریابە لە سەربەستانە شت وەرگرتن لە تێکستەکەتەوە. وا باشترە هەمان نموونە دابڕێژیتەوە نەك ئەوەی کە هەمان ئەو دانەیەی ناو کتێبەکەت بەکاربێنیت. باشترە تێکستەکەت دابڕێژیتەوە نەك ئەوەی راستەوخۆ ئیقتیباساتی لێ دەربێنیت، ئەگەرچی نیشانەکانی نقل القول–یش بەکار بێنیت.

لەکاتێکدا کە بە پێناسە، تاقیکردنەوەی لە ماڵەوە تاقیکردنەوەیەکی کتێبی کراوەیە، لە هەر هەموویان قورسترە. تاقیکردنەوەیەکی کتێبی کراوە ناتوانێ لەو کاتە زیاتر بخایەنێ کە بۆ

وانەکە تەرخان کراوە. بەڵام لەوانەیە شەوێك یان دووان یان تەنانەت هەفتەیەك یان زیاترت پێبدرێت بۆ تەواوکردنی تاقیکردنەوەیەکی ماڵەوە.

بۆچی ئەوەندە قورسن؟ تۆ لەبەرئەوە ئەو هەموو کاتەت پێدەدرێت چونکە مامۆستایان پێشبینی ئەوە دەکەن کە کاتێکی زۆرترت بوێ بۆ تەواوکردنی لەوەی کە لە وانەکەدا هەیە. لەوانەیە پێویست بکات بچیتە سەروو تێکست(ەکان) و تێبینییەکانت تەنانەت بۆئەوەی کەمێك دەرەقەتی هەندێ لە پرسیارەکان بێیت و شەوانێکی درێژی پێ بچێت. بەم دواییانە تاقیکردنەوەی هەشت سەعاتیی ئاسانت ئەنجام داون؟ چەندەی زیاتر کاتت بدرێتێ، ئەوەندەش تەمبەڵیکردن ئاسانتر دەبێ ("کوڕە خۆ دوو شەوی تر‌م هەیە!") و ئێمە دەزانین ئەمە بە چ دەگات.

تەنیا دوو لایەنی باش هەن بۆ هاوسەنگکردنەوەی تەرازووەکە. بە دڵنیاییەوە تۆ هەلی ئەوەت پێدراوە "هەموو ئەوە بیت کە دەتوانیت". هیچ پۆزشێك نییە بۆ نەکردنی ئیشێکی باش لە تاقیکردنەوەیەکدا کە تەقریبەن سنوورێکی کاتی نییە. ئەگەر تۆ لە کاتی تاقیکردنەوەیەکی ئاساییدا لە ترسا بلەرزیت، دەبێ لە ماڵەوە، لە ژینگەیەکی ئاسودەبەخشدا شڵەژانێکی کەمترت هەبێ.

نووسینی ئەو وتارانەی کە خەڵاتیان بەدواوەیە

دەبێ وەکو هەر تاقیکردنەوەیەکی تر کات بۆ تاقیکردنەوەی وتار تەرخان بکەیت– خەملاندنە حسابییەکان ئاسانترن. پێنج پرسیار لە ٥٠ خولەکدا؟ پێویستی بە ئەنیشتاینێك نییە کە بۆ هەر وتارێك ١٠ خولەك بیر بکەیتەوە.

یان پێویست دەبێ؟ لەم نموونەیەدا، حەوت یان هەشت خولەك بۆ هەر وتارێك بڕەخسێنە، کە لە هەر شوێنێکدا ١٠ بۆ ١٥ خولەکت دەداتێ پێیدابچیتەوە، خوێندنەوەی راستکردنەوەی بۆ بکەیت و ئیزافات بۆ وەڵامەکانت بکەیت. ئەگەریش هەر کام لە پرسیارەکان "نمرەی زیاتر"یان لەسەر بوو بە بەراورد بەوانەیتر، بەو پێیە ئەو کاتەت هەموار بکە کە پێیانەوە خەریك دەبیت.

کاتێ ئەو کاتەی کە بۆ یەکەم پرسیار تەرخانت کردووە تەواو بوو، دەستبەجێ بچۆرە سەر ئەوەی دواتر، گرنگ نییە لەوەی یەکەمیان تا کوێ رۆیشتوویت. تۆ لە کۆتاییدا کاتت دەبێ– ئەگەر پەیڕەوی لە پێشنیارەکەی من بکەیت– کە بگەڕێیتەوە و زیاتر بنووسیت.

زۆربەی مامۆستاکان تێکڕاییەکی نمرەی باشتر دەدەنێ بۆ پێنج وتاری ناتەواو بەڵام شایستە نەك سێ دانەی نایاب و دووانی جێهێڵراو.

قەت قەت وەڵامی هیچ پرسیاری وتارێك مەدەرەوە بەبێ ئەوەی یەکەم جار کەمێك "واجبی ماڵەوە" ئەنجام بدەیت، تەنانەت ئەگەرچی تۆ رۆژنامەنووسێکی براوەی خەڵات بیت لە قوتابخانەکەتدا.

یەکەم جار، بە راستی سەیری پرسیارەکە بکە. ئایا دڵنیایت پرسیار لە چی دەکات؟ بیخەرە ناو وشەکانی خۆتەوە و بەراوردی بکە بەوەی مامۆستا. ئایا بە روونی هەمان مانا دەگەیەنن؟ ئەگەر نا، ئەوا خراپ خوێندووتەوە.

رێگایەکی خۆلادان لەم گرفتە بریتییە لە دارشتنەوەی پرسیارەکە و کردنی بە یەکەم رستەی وتارەکەت. تەنانەت ئەگەرچی پرسیاری مامۆستاکەت خراپ خوێندبێتەوە، تۆ پیشانت داوە کە چۆن لێکتداوەتەوە. ئەگەر تۆ وەڵامی پرسیارێکی تۆزێك جیاواز لەوەی کە مامۆستا مەبەستیەتی بدەیتەوە، ئەوا هێشتا لەوانەیە نمرەی تەواو وەربگریت لە بەرانبەر وتارێکی جوان نووسراودا.

بەڵام تکایە قەت، بە مەبەست یان بە پێچەوانەوە، پرسیارەکە مەخوێنەرەوە بە جۆرێك کە بەو شێوەیەی کە خۆت حەز دەکەیت وەڵام بدەیتەوە نەك ئەوەی کە بە راستی پێت دراوە.

دڵنیا بەرەوە لەوەی کە لە مانای "فرمانە رێنوێنەکان" تێدەگەیت. "وەسف" مەکە کاتێك پێت وتراوە "بەراورد و جیاوازی بکە". "روون مەکەوە" کاتێك چاوەڕێ دەکرێت "مناقەشە"ی بکەیت. دوایی سەیری لیستێکی ئەو فرمانە زۆر بەکارهێنراوانە بکە و ئەمەی کە پێت دەڵێن چی بکەیت.

پلانێکی کاری مەعقول

ئەمەی خوارەوە رێگایەکی هەنگاو بە هەنگاوە بۆ هەر پرسیارێکی وتار:

هەنگاوی ١: لە لاپەڕەکی کاغەزی بۆشدا، هەموو فاکت، ئایدیا، چەمك و هیتر بنووسە کە پێت وایە دەبێ لە وەڵامەکەتدا هەبن. (ئەگەر کاغەزی زیادت پێ نییە، لەسەر ئەسئیلەکە یان پەڕەی وەڵامدانەوەکەش دەبێت).

هەنگاوی ٢: بەو رێکخستنە رێکیان بخە کە پێویستە. پێویست ناکات تێبینییەکانت بەشێوەیەکی چوارچێوەیەکی چڕوپڕ بنووسیتەوە— تەنیا هەر تێبینییەك بەپێی ئەوەی کە دەتەوێ لە وتارەکەتدا لە کوێ دایبنێیت، ژمارە بکە.

هەنگاوی ٣: یەکەم پەرەگرافت داڕێژە. دەبێ ئەمە، ئەو بیرۆکە سەرەکییانە پوخت بکاتەوە و بناسێنێت کە تۆ لە وتارەکەتدا دەیانخەیتەڕوو. لێرەدایە کە وەڵامە باڵاکانی وتار دروست دەبن یان هەڵدەوەشێن.

هەنگاوی ٤: ئەوەندەی بکرێ بە روونی، وتارەکەت بنووسە. زۆربەی ئەو مامۆستایانەی کە دەیانناسم هەوڵ نادەن مانای ئەو شتە پەرپووتە بدۆزنەوە کە وەکو وتار دەردەکەوێ و نە نمرەی بەرزیشی بۆ دادەنێن.

هەنگاوی ٥: وتارەکەت جارێکی تر بخوێنەرەوە و ئەگەر پێویستە، ئەو بیرۆکانە دابنێ کە ماون، سپێل، ڕێزمان و هیتر ڕاست بکەرەوە. هەروەها ئاگاداری لابردنی نائاگایانە بە کە دەشێ زیانی جددی بگەیەنێ– بۆ نموونە لابردنی "نا"یەك و پێچەوانەکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە مەبەستت بووە بینووسیت.

ئەگەر فاکتێك هەیە پێت وایە گرنگە و دەبێ دابنرێ، بەڵام بیرت نایەتەوە، مەزەندەی بۆ بکە. ئەگینا، تەنیا وازی لێبێنە و ئەوەی کە لەوپەڕی تواناتدایە بینووسە. ئەگەر پاشماوەی وتارەکەت باش بیری لێکراوەتەوە و ڕێکخراوە و بە روونی رایەڵە بە هەموو ئەو بیرۆکانەی تر کە دەبێ دابنرێن، پێم وایە زۆربەی مامۆستاکان لە بەرانبەر لابردنێکی وەهادا نمرەت لێدەشکێنن.

خۆت بۆ نمرەیەکی لاواز ساز مەدە لە ڕێگەی کردنی ئەو مەزەندانەی کە پێویست ناکات بیانکەیت. ئەگەر پێت وایە شتێك لە ١٧٨٤دا روویداوە، بەڵام دەترسی ١٧٩٤ بێت، تەنیا بنووسە "لەدوادواکانی سەدەی ١٨دا". لەوانەیە تۆ بۆئەوەی دواییان نمرەت لێ نەشکێ، بەڵام نمرەیەك یان دووانت لێ بشکێت ئەگەر بەروارێکی هەڵە بنووسیت.

بیرت بێت: مامۆستای کەم هەن کە حەزیان لە درێژی بێت. وەڵامێکی باش ڕێکخراو، باش بونیادنراوی دیاریکراو هەمیشە نمرەیەکی باشترت بۆ مسۆگەر دەکات لە نووسینی هەموو ئەو شتەی کە دەیزانیت بەو ئومێدە ناکامەی کە بە ڕاستی شتێکی پەیوەندیدار دابنێیت. نووسینی وتارێکی نایاب لەسەر شتێك کە کەمی لێ دەزانیت، زۆرجار نمرەیەکی باشترت بۆ زامن دەکات لە زانینی زۆر و خستنەڕووی بە لاوازی.

ڕاستەوخۆ بە یەکەم پەرەگرافی پوختی ئامانج پێك دەست پێبکە کە پێچ و پەنا و فێڵ و فرت ناکات. بە پەرەگرافێکی ڕێکخراو و روون نووسراو کۆتایی بە وتارەکەت بێنە کە زیاتر لە کۆکراوەیەکی ئەوەی کە هەنووکە نووسیوتە دەخاتەڕوو.

فرمانە ڕێنوێنە باوەکان لە تاقیکردنەوەی وتاردا

بەراورد بکە(compare) : پشکنینی دوو شت، ئایدیا، کەس و هیتر بکە و تێبینی هاوشێوەیی و جیاوازییەکانیان بکەن.

جیاوازی بکە(contrast): بەراورد بکە بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر جیاوازییەکان. جیایان بکەرەوە.

ڕەخنە بکە(criticize): حوکم لەسەر باشییەکان و ناتەواوییەکان بدە و قسەیان لەسەر بکە.

پێناسە بکە(define): سروشت یان تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان ڕوون بکەرەوە.

وەسف بکە (describe): ڕواڵەت، سروشت، رایەڵەکان و هیتر بگەیەنە.

قسەی لەسەر بکە(discuss): بە بەڵگاندن، کۆمێنت و هیتر بدوێ یان بپشکنە، مشتومڕی لەسەر بکە، سۆراخی چارەسەرەکان بکە.

بژمێرە(enumerate): ڕووداو، شتە، وەسفە، ئایدیا جیاجیاکان ریز بکە.

هەڵسەنگێنە(evaluate): بەهای بیرۆکەیەك، کۆمێنتێك و هیتر لەبەرچاو بگرە و پاساو بۆ ئەنجامگیرییەکەت بێنەوە.

ڕوون بکەرەوە(explain): مانای شتێك ڕوون و ڕەوان و درك پێکراو بکە و بیکە بە شتێکی شیاوی تێگەیشتن.

شەرح بکە (illustrate): نموونەی دیاریکراو یان هاوشێوەکردن بەکاربێنە بۆ ڕوونکردنەوە.

لێك بدەرەوە(interpret): بە دارشتنەوە، وەرگێڕان یان ڕوونکردنەوە لەسەر بنەمای ڕەئی کەسی.

پاساودان(justify): بەرگری لە دەستەواژەیەك یان ئەنجامگیرییەك بکە. هاوشێوەی پشتگیرییە.

بگێڕەوە (narrate) باسی ڕوودانی شتێك بكە، بە زۆری لە ڕێگەی دانی وردەكاریی ڕووداوەكان بەو ریزبەندییەی کە ڕوویانداوە. هاوشێوەی وەسفکردنە، بەڵام تەنیا بۆ شتێك دەگونجێ کە جارێك لە جاران ڕوویداوە.

خاڵە سەرەکییەکان بنووسە (outline): هێڵکاری، حسابێك یان ڕاپۆرتێکی گشتی بنووسەکە تەنیا لایەنە سەرەکییەکانی کتێبێك، بابەتێك یان پرۆژەیەك پیشان بدات.

بیسەلمێنە (prove): ڕاستی یان ڕاستەقینەیی دیاری بکە لە ڕێگەی بەڵگە یان بەڵگاندنەوە. هاوشێوەی پیشانی بدە، ڕوونی بکەرەوە. (لە ماتماتیکدا، بەشێوەی ماتماتیکی ڕاست و دروستی شتێك پشتڕاست بکەرەوە.

پەیوەندی چییە (relate): باسێکی ڕووداوەکان و/یان بارودۆخەکان پیشان بدەن بەزۆریش بۆ دیاریکردنی رایەڵ و پەیوەندی.

خوێندنەوە بۆکردن یان پێداچوونەوە (review): ڕووپێویی بابەتێك، ڕووداوێك یان بیرۆکەیەك بکە، بەشێوەیەکی گشتی بەڵام ڕەخنەگرانە. هاوشێوەی وەسفکردن، قسەلەسەرکردن، شەرحکردن، نووسینی خاڵە سەرەکییەکان، پوختکردنەوەیە. دەشێ هەندێ لە دانەرانی تاقیکردنەوە ئەم وشانە تەقریبەن بەشێوەیەکی لەبری بەکاربێنن، هەرچەندە دەتوانرێ جیاوازیی تەمومژاویی لە هەریەکەیاندا بەدی بکرێت.

بڵێ (state): بەشێوەیەکی پوخت و ڕوون فاکتەکان بخەرە ڕوو. لەوانەیە لەبری ناوهێنان، ریزبەندی کردن، پیشاندان، ناسینەوە، ژماردن و دەرهێنان بەکاربێت.

پوخت بکەرەوە (summarize): لە شێوەیەکی پوختدا، نموونە و وردەکاری مەنووسە.

کەمتر نیگەرانی وشە دیاریکراوەکان و زیاتر نیگەرانی زانیاری بە. وەڵامەکەت زۆر باش ڕێک بخە و وەها بنووسە کە تێبیگەن نەك ئەوەی سەرنج رابکێشیت. باشترە رستە، پەرەگراف و وشەی کورتتر بەکار بێنیت– و روون و پوخت بیت– نەك ئەوەی کە ڕێگە بدەیت مامۆستا بکەوێتە ناو مۆتەکەی دەستەواژە و گرێوە کە قەت سەری لێدەرنەچێت (نە نمرە باشەکەی تۆش!).

ئەگەر تۆ بچوکترین سەرەداوت نەبێت لەوەی پرسیارێك مەبەستی چییە، پرسیار بکە. ئەگەر هێشتا هیچ بیرۆکەیەکت نەبێ لە وەڵامەکە– مەبەستم هیچ بە مانای وشە– بە بۆشی جێی بێڵە. باشترە کاتی زیاتر بۆ بەشەکانی تری تاقیکردنەوەکە تەرخان بکەیت و لەوانەدا ئیشێکی باشتر بەجێ بگەیەنیت.

لە کۆتایی تاقیکردنەوەکەدا کات تەرخان بکە بۆ پێداچوونەوەی نەك تەنیا وەڵامەکانی وتارەکەت بەڵکو وەڵامەکانی تریشت. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە هەموو وشەکان و ژمارەکان دەخوێنرێنەوە. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە پرسیاری گونجاوت بە وەڵامی گونجاو گەیاندووە. تەنانەت دڵنیا بەرەوە لەوەی کە بەشێکی تەواوت نەپەڕاندووە بە هەڵدانەوەی پەڕەکە بە خێرایی یان تێبینی نەکردنی ئەمەی کە پەڕەیەکی کەمە. دڵنیا بەرەوە لەوەی کە ناتوانیت هیچ شتێکی تر بۆ سەر وەڵامەکانی وتارەکە ئیزافە بکەیت.

ئەی ئەگەر کات تەواو بێ؟

لەکاتێکدا کە دەبێ بە ورییایییەوە کاتی پێویستت بۆ تەواوکردنی هەر وتارێك تەرخان کردبێ، پێش ئەوەی دەست بکەیت بە ئیش لەسەر یەکەمیان، شت ڕوودەدات. دەشێ بۆت دەرکەوێ دوو خولەك و وتارێکی تەواویشت ماوە. چی دەکەی؟ ئەوەندەی بکرێ خێرا هەر بڕە زانیارییەك کە پێت وایە دەبێ دابنرێ بنووسە لە وەڵامەکەتدا و هەر خاڵێك بەو ڕێکخستنەی کە دەبووایە بنووسیت، بنووسە. ئەگەر ئەو کاتە کاتت هەبوو بۆ ڕێکخستنەوەی تێبینییەکانت لە چوارچێوەیەکی ڕوونتردا، ئەمە بکە. زۆرێك لە مامۆستایان نمرەیەکی ڕێژەییت (هەندێکیان نمرەی تەواو) دادەنێن ئەگەر چوارچێوەکەت هەموو ئەو زانیارییەی تێدا بێت کە چاوەڕوان دەکرێ. ئەمە لانی کەم دەریدەخات کە تۆ بڕێکی زۆرت لەبارەی بابەتەکەوە دەزانی و دەتتووانی وەڵامێکی مەعقوڵ گەڵاڵە بکەیت.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە تۆ کاتی ناتەواوت بۆ وەڵامدانەوەی یەك دوو پرسیار بۆ ماوەتەوە ئەوەیە کە تۆ بڕێکی زۆرت لەبارەی پرسیار(ەکان)ی پێشوو زانیووە. تۆ ویستووەتە جەخت بکەیتەوە لەوەی کە مامۆستا دەزانێ کە تۆ دەزانیت، بۆیە هەر نووسیووتە...و نووسیووتە...و نووسیووتە تا ئەوەی کاتت لێبڕاوە.

وریابە- هەندێ لە مامۆستایان پرسیارێکی تا رادەیەك گشتی دادەنێن، ئەگەر ویستت، دەتوانیت تاوەکو پێنجشەممەیەکی تر لەبارەیەوە بنووسیت. لەو بارەدا، ئەوەندەی توانات بۆ چاککردنی لەلایەن خۆتەوە، رێکخستنی و پوختەکردنی خاڵە گرنگەکان تاقی دەکەنەوە ئەوەندە زانینت لەبارەی بابەتەکەوە تاقی ناکەنەوە.

### تێبینییەکی تایبەت بۆ دایکان و باوکان

زۆرێك لە دایکان و باوکان نمرەکانی تاقیکردنەوە یەکجار زۆر بە جددی وەردەگرن. ئەمەی خوارەوە ئامۆژگاریی منە بۆیان:

١.لە رادەبەدەر مەشڵەژێن لەبەرانبەر نمرەکانی تاقیکردنەوەی منداڵەکەت. جەختکردنەوەی زۆر لەسەر نمرەکان دەشێ منداڵ تووڕە بکات، بەتایبەت کە هەنوکە لە ژێر فشاری یەکجار زۆردا نارەحەت بێت.

٢.بە تاکە نمرەیەکی تاقیکردنەوەیەك حوکم لەسەر منداڵەکەت مەدە، جا تاقیکردنەوەکە هەرچەنێك گرنگ بێت. هیچ تاقیکردنەوەیەکی پێوەرێکی کامڵ نییە بۆ ئەوەی منداڵێك دەتوانێ بیکات یان ئەوەی کە بە راستی فێری بووە.

٣.ئەو منداڵانەی کە لە راسب بوون دەترسن ئەگەری زیاترە کە لە تاقیکردنەوەدا هەڵە بکەن. یارمەتییان بدە کە هەست بە دڵنیایی بکەن لەبارەی هەر شتێکەوە کە دەیکەن.

٤.ئەوەندەی دەکرێ زوو زوو قسە لەگەڵ مامۆستای منداڵەکەت بکە. هەڵسەنگاندنەکەی ئەو پێوەرێکی زۆر باشتر دەبێ لەوەی کە منداڵەکەت چۆنە بە بەراورد بە هەر تاقیکردنەوەیەك، یان تەنانەت هەر زنجیرە تاقیکردنەوەیەك.

٥.دڵنیا بەرەوە لەوەی کە منداڵەکەت رۆژانە دەچێت بۆ قوتابخانە. تۆ ناتوانیت لە تاقیکردنەوەکاندا باش بیت ئەگەر بە دەگمەن لە وانەکاندا ئامادە بیت.

٦.دڵنیا بەرەوە لەوەی کە منداڵەکەت بایی پێویست دەخەوێت، بەتایبەت پێش تاقیکردنەوەیەکی گەورە. چاوی خەواڵوو نمرەی خراپی لێدەکەوێتەوە.

٧.لەگەڵ منداڵەکەتدا بە ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەدا بچۆرەوە و پیشانی بدە کە دەتوانێ چی لە تاقیکردنەوەیەکی نمرەبۆدانراو فێر ببێت. ئەمە بەتایبەت لە ماتماتیك و زانستەکاندا گرنگە کە چەمکێکی نوێ لەسەر ئەوانەی پێشوو کەڵەکە دەبێ.

٨.سەیری وەڵامە هەڵەکان بکە. بزانە بۆچی بەو شێوەیە وەڵامی داوەتەوە. ئەمە ئەو کاتانە جیا دەکاتەوە کە منداڵەکەت وەڵامی راستی زانیووە بەڵام بە تەواوی لە پرسیارەکە تێنەگەیشتووە.

٩.هەر کۆمێنتێکی مامۆستا لەسەر تاقیکردنەوەکە بخوێنەرەوە، بەتایبەت ئەگەر منداڵەکەت نمرەیەکی نزمی هێنابێت.

رێکخەری پێش تاقیکردنەوە

وانە:------------- مامۆستا:-------------

بەرواری تاقیکردنەوە:------------- کات: لە---- بۆ: ------

شوێن:-------

رێنماییە تایبەتییەکان بۆ خۆم (بۆ نموونە، حاسبە، قاموس و هیترت پێ بێت):

-------------------------------------

-------------------------------------

ئەو ماددانەی کە پێویستمن بۆ سەعیکردن لەم تاقیکردنەوەیە (لای هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە پێویستن):

----- کتێب ------ دی ڤی دی/ڤیدیۆ

----- کتێبی راهێنان ------ تاقیکردنەوەکانی پێشوو

----- تێبینییەکانی ناو پۆل ------ مەلزەمە

----- هیتر

دیزاینی تاقیکردنەوەکە (ژمارەی راست و هەڵە، وتار و هیتر و کۆی نمرەکان بۆ هەر بەشێك بنووسە):

---------------------------------

---------------------------------

کۆبوونەوەکانی گرووپی سەعیکردن (کاتەکان، شوێنەکان):

١.---------------------------

٢.---------------------------

٣.---------------------------

٤.---------------------------

٥.---------------------------

ئەو ماددانەی کە دەبێ ئیشیان لەسەر بکرێت:

بابەتەکان، سەرچاوەکان و بڕی پێداچوونەوە(بە سوکی یان بە قورسی)ی پێویست پیشان بدە. چێك بکەرەوە کاتێك پێداچوونەوەکە تەواو بوو.

| بابەت | سەرچاوەکان | پێداچوونەوە |
| --- | --- | --- |
| ------- | ------- | --------- |
| ------- | ------- | --------- |

پاش تاقیکردنەوە:

ئەو نمرەیەی چاوەڕێی بووم------ ئەو نمرەیەی کە هێنام-------

چیم کرد کە یارمەتیدەرم بوو؟

--------------------

--------------------

دەبووایە چیتر بکەم؟

--------------------

--------------------

## کۆتایی

مـن شـانازیتان پێـوه دهکـهم. ئێـوه توانیتـان کتێبهکـه تـهواو بکـهن. ئهمـهش دوایـین ئامۆژگاریمه:

—جارێکی تر تهواوی کتێبهکه بخوێنهرهوه. ئهمه وهکو بینینی فیلمێکه بۆ جاری دووهم— تۆ ههمیشه شتێك بهدی دهکهیت که یهکهم جار پهڕاندووته.

—پراوهی ئهوه بکه که وتوومه. پێشتر پاساوت ههبووه بـۆ خـراپ بـوون— نـهتزانیووه چـۆن سهعی بکهیت. ئێستا به هیچ شێوهیهك پاساوت نییه.

—شتی تری یارمهتیدهر بکڕه که پێویستته.

—رۆن فرای

وتاربێژێکی ناسراوه که لهبارهی چاککردنی پهروهردهی گشتی دهدوێت و پـشتیوانێکی ئـهو دایك و باوك و خوێندکارانهیه که رۆڵی چالاك دهبیـنن لـه بـههێزکردنی پرۆگرامـه پهروهردهییـه کهسییهکاندا. ههروهها نووسهرێکی چالاکیشه و زیاتر له ٣٠ کتێبی جیاجیای بـۆ سـهرکهوتنی خوێندکاران نووسیووه.